# مانای هونەر

ئەم نوسراوانەی کە بەرچاوتان دەکەوێت، کۆمەڵە کورتە باسێکن کە هەربرت ڕید Herbert read لە ساڵەکانی 1931 دا بۆ گۆڤاری لیستنر Listener دەینووسین. وە منیش بەوەرگێڕانی هەستاوم لە ساڵی 1987. هەڵبەتە لەبەرهۆکاری ژیانەکی و دوورەوڵاتی بوارم نەبوو بەچاپیان بگەیەنم، ئەم بابەتانە بەشێکن لەجەوهەری هونەرو کۆن بوونیان بۆ نییە، بۆیە بەچاکم زانی لە ڕۆژنامەی پەیامی کوردا بەخوێنەری کوردی بگەیەنم. هیوادارم کارێکی باشم کردبێت... چونکە پەیامی کورد بەڵێنی ئەوەی بە من داوە کە گۆشەیەکی هونەریم بۆ تەرخان بکات، بۆیە بەچاکم زانی تیایدا ئەم کورتە باسانە بڵاوبکەمەوە...بەو هیوایەی کە خوێنەری کورد لە کۆی بابەتەکاندا شارەزایی یەکی کارامە و هونەرمەندانەی بۆهونەری شێوەکاری هەبێت و لە تێڕوانینیدا دەربارەی جیهانی هونەر بێ سەلیقە نەبێت. هەڵبەتە ئەنجامدانی ئەم کارەی وەرگێڕان بۆ من کارێکی زۆر سەخت بوو، چونکە ئەوکاتەی من هەستام بە وەرگێڕانی ئەم کتێبە تەنها شەش مانگ زانستیم هەبوو دەربارەی زمانی فارسی، بۆیە هەمیشە ڕستەو زاراوەم لەم و لەوی فارس دەپرسی... هۆی ئەمەش تەنها مەیلی خۆ دەرخستن و لەقەرەدانی زمان نەبوو، بەڵکو ئەوەی پاڵی پێوە نام هەڕەشەیەك بوو" هەڕەشەی کەم زانی لەبواری هونەردا بەزمانی کوردی... چونکە کاتێك بۆ یەکەم جار ڕووبەڕووی کتێبخانە فارسییەکان بوومەوە، تەنها دوچاری سەرلێشێوان و سەرسوڕمان هاتم دەربارەی زۆری وچڕیی زانست بە زمانی فارسی لە کتێبخانەکاندا، لەوێدا دووچاری بەزەیی هاتنەوە هاتم... هەستم بە هەژاریی کتێبخانەی

کوردی کرد" بۆیە خۆم هاندا بە لای کەمەوە هەوڵ بخەمە گەڕ بۆ زیاد کردنی چەند کتـێبێ لە کتێبخانەی کوردیدا... بێگومان نیم لەوەی کە دووچاری سەختی و سەریەشە هاتووم... ئەم کتێبە و چەندانی ترم وەرگێڕا بە کوردی... ئێستا حەڤدە ساڵ دوای ئەو کارەمـە و تـا ڕادەیـەکی زۆر زمـانی فارسـیم لـە یـاد نـەماوە، بـەڵام هاوڕێیـان هانیـان دام کـۆڵ نـەدەم پاکنوسی وەرگێڕاوەکانم بکەم و بڵاویان بکەمەوە... بۆیە تکام لە ڕەخنەگران ئەمەیـە کـە بێ چەندو چوون بەدڵ ڕەقانە هەڵـەکانم ڕاسـت بکەنـەوە ئەگـەر شـکیان بـرد... هیـوادارم کارێکی باشم کردبێت، بەوەی کە لە توانامدایە هـەرگیز کەمتەرخـەمی ناکـەم لـە خزمـەتی زمانەکەمدا.

# بەشی یەکەم

## 1- پێناسی هونەر

art = هونەر بە واتایەکی سادە پەیوەست بەو هونەرانەیە کە بە هونەری پلاستیکی plastic یا بینراوی Visual دەیناسین" بەڵام ئەگەر ڕاستیمان بوێت ئەوا دەبێ هونەری وێژەوانی و هونەری مۆسیقاش وەربخەین، چونکە کۆمەڵە خاسیەتێك لەنێوان هونەرەکان دا هاوبەشە، هەرچەندە لەم یاداشتانەدا زیاتر سەری پەیوەندیمان بە هونەرە پلاستیکییەکانەوە هەیە، وەڕوخستنی ئەو بابەتانەی کە لە نێوان گشت هونەرەکاندا هاوبەشە، چاکترین سەرەتایە بۆ توێژینەوەکەمان.

شوبنهاوەر یەکەم کەس بووە کە ڕایگەیاند: گشت هونەرەکان دەیانەوێ بە مۆسیقا بگەن.

ئەم وتەیە جارەها دوپات بۆتەوەو شوێنگەی بەهەڵەدا چوونی گەلێ بووە، بەڵام گرنگییەکیش ئاشکرا دەکات، شوبنهاوەر چۆنێتی ئەبستراکتی مۆسیقا لەپێش چاو دەگرێ، لە مۆسیقادا — تەنها لە هونەری مۆسیقادا هونەرمەند دەتوانێ ڕاستەوخۆ لایەنگری لە گوێگران بکات و بێ یاریدە مەبەستەکانی بەوان دەگەیەنێت.

ئەندازیار مەبەستەکانی بەزمانی بینایی بەیان دەکات، شاعیر ووشە بەکاردەبات کە ڕۆژانە خەڵکی بۆ وتووێژ بەکاری دەبەن... وێنەکێش زۆر جار بە زمانی وێنەی ڕوکەش و دیاردەی بینراو دەدوێت. تەنها مۆسیقارەکە دەتوانێ لە سەربەخۆیی خۆیدا، لە ویژدانی ئازادیدا بەرهەمێك داهێنێت کە ئامانجی ڕاستەوخۆی_چێژبەخشین_ ە و هیچی تر.

بەڵام کۆی هونەرمەندان نێت و نیازیان چێژ بەخشینە، بۆیە سادەترین و زۆرترین پێناسەی هونەر ئەمەیە کە بڵێین: هونەر کۆششێکی بۆداهێنانی وێنەی چێژ بەخشین.

ئەو وێنەیەش هەستی جوانیمان ڕازی دەکات، هەستی جوانیش کاتێك ڕازی دەبێت کە جۆرە یەکەیەك یا لەبارییەك بەدیبهێنێت کە ئاتاجی پەیوەندی وێنەیی یە لە درکاندنی هەستی خوددا.

## 2- هەستی جوانی = Aesthetic sence

هەر تیۆرێك دەربارەی هونەر بەم گریمانەیە دەست پێدەکات کە مرۆڤ لە بەرامبەر شکڵ و ڕوو و قەبارەی شتەکاندا کە بەر هەستەکانی دەکەون ڕازەر نیشان بدات.

هەندێ لە ئارایشتەکانArrangeme یان ڕێکخستنی شتەکان، سەر بە هەستی چێژوەرگرتن دەبن.

... لە کاتی نەبوونی ئەم ئارایشتەدا نا ئارامی ڕوودەدات، هەستی دیاری کردنی "تشخیص" پەیوەندیی چێژبەخشی هەمان هەستی جوانییە... لە بەرامبەرەکەیدا هەستی درێوی"القباحە".

دیارە دەشێت گەلێ لە خەڵکی ئاگاداری ئەو گونجاندنەی لە نێوان ئەندام و کەلوپەلەکان دا هەیە نەبن.، هەمان شێوە بەشێك لە خەڵکی کوێر ڕەنگن، دەشێت بەشێکیش لەوان سەبارەت بە شکڵ و شێوەکان کوێر بن...بەڵام هەمان شێوە کە کەسانی ڕەنگ کوێر تا ڕادەیەك هەن یا دەگمەنن، بەهەمان بەڵگە دەتوانین باوەڕ بهێنین کە کەسانێکیش هەن ڕاستەوخۆ لە پێناسەی عەینیی شتەکان بێ ئاگان یان بە هەمان ئەندازە کورت بین و کەم بینن... چونکە هەندێ لەمرۆڤ لە ڕوی هەستیارییەوە ناکامڵن پەروەردەی هەستیان پەروەردە نەکراوە... یان هەستی جوانییان سستە.

## 3- پێناسی جوانی

دەیان و سەدان پێناسی جیاواز سەبارەت بە جوانی بوونیان هەیە، بەلأم پێناسی ئەندامی و پەتی کە من دەرم بڕی ئەمەیە کە ( جوانی برتییە لە یەکەی پەیوەندی وێنەیی لە درکاندنی هەستیماندا) ئەم پێناسەیە بنچینەیی یە و لە سەر ئەم بنەمایە دەتوانین تیۆرێك دەربارەی هونەر دارێژین، بەلأم لەوانەیە گرنگ بێت کە لە سەرەتادا بە توێژینەوەیەك دەرهەق زاراوەی جوانی بکۆڵینەوە... بۆیە دەبێت بڵێین کە هونەر پەیوەندییەکی پێویستی بە جوانییەوە نییە .

ئەمەش شتێکی تەواو لۆژیکییە، بەمەرجێك ئەم زاراوەیە بەو شێوەیە سنوردار دەکەین کە یۆنانییەکان بنەمایان لەسەر دارشتبوو، هەروەها شێوازی کلاسیکی ئەوروپی جێگەی گرتەوە.

مەیلی خودی خۆم ئەمەیە کە هەستی جوانی بە دیاردەیەکی گەلێك گۆڕاوتر لەبەر چاو بگرم، کە دیاریدانی بەدرێژایی مێژوو گەلێ نادیارو کەمێك سەرسوڕهێنەر بووە... هونەر دەبێت گشت ئەو دیاردانە لەخۆ بگرێت، هەروەها لێکۆڵەوەری ڕاستگۆی هونەر کەسێکە کە هەستی جوانیی خودی ئەو هەر چۆنێك بێت با ئامادە بێت بۆ وەڕوخستنی ڕەسەنانەی ئەم هەستە، لەتەك کەسانی ترداو لەسەردەمەکانی تریش دا ڕێگە بە دەستوری هونەر بدات و لە ڕوانگەی ئەودا هونەری سەرەتایی و کلاسیك و گوتیك بە هەمان ئەندازە سەرنج ڕاکێشەرن.

هەروەها هاوبەشە لە دیاری کردنی هونەری ڕەسەن لە ناڕەسەن لە گشت قۆناغێکدا بە ئاگایە لە هەڵسەنگاندنی ڕێژەیی دیاردە جۆراوجۆرەکانی هەستی جوانی لە قۆناغەکانی مێژوودا.

## 4–جیاوازیی هونەر و جوانی

بەهەڵـەدا چـونمان دەربـارەی هونـەر تـا ڕادەیـەك لـە نـەبوونی یەكـەی ڕوانگـەوە سەرهەڵدەدات لەبـەكاربردنی ووشـەی هونـەر و جـوانی دا... دەتـوانین بڵـێین ئێمـە تـەنها لەهەڵە بەكاربردنی ئەم وشانەدا یەك ڕاین.

هەمیشە گریمان دەكەین كە هەرچییەك جوان بوو هونەرە، یا هونـەر بەگـشتی جوانـە، هەر شتێكیش جوان نەبوو هونەرنییە و دزێویش لە هونەر بەدەرە.

ئەم بەیەكزانینەی هونەر و جوانی ڕەگی گشت كۆسپێك لە هەستكردنمان دا دەربـارەی هونەر بەدی دێت، تاوەكو لای كەسانێكیش كە بەڕوویەكی گشتی سەبارەت بە كارتێكـەری جوانناسی Aesthetic هەستیارییەكی بەهێزیان هەیـە ئـەم گریمانەیـە لـەو ڕووەوە پـەیڕەو دەكەن كە هونەر جوانی نییە، لەبەر ئەوەی هونەر بەپێی پێویست جوانی نییە، ئـەم خاڵـە هەرچەندە دوپات بكەمەوە و پێی لەسەر دابگرم زیاڕۆیی ناكەم و نەمكردووە.

گاە مەسەلەكە لە ڕوانگەیەكی مێژوویی یەوە بەسەر دەكەینەوە(واتە چییەتی هونەر لە سەردەمەكانی ڕابردودا) و گاە لە ڕوانگەی كۆمەڵناسییەوە( واتە تێبینی بكـەین كـە هونـەر لە ڕووی دیاردە هەنوكەیی یەكانەوە لە سەراسەری جیهاندا چییە)، دەبیـنین كـە هونـەر چ لە ڕابردودا و چ لەحاڵی حازردا زۆرجار شتێكی نا جوان بووە و دەبێت.

## 5– هونەر بە ناونیشانی بینین – دیدە

جوان وەكو وتمان بەڕوویەكی گشتی لە سادەترین پێناسیدا ئەو شتەیە كە چێژ بەخش بێـت، لـە ئەنجامـدا خـەڵكی ناچـار دەبێـت كـە خـواردن و بـۆن كـردن و كـۆی هەسـتە تەنییەكانیش بە هونەر لە قەڵـەم بـدەن" ئـا بـەم شـێوەیە دەتـوانین پوچـەڵی ئـەم تیـۆرە ڕاستەوخۆ ئاشكرا بكەین.

مەکتەبێکی جوانناسی لەسەر ئەم بنچینەیە هاتۆتە کایەوە کە تا ئەم دوایی یەش ئەم مەکتەبە لە کۆی مەکتەبەکانی تر زیاتر بەردەوامی کردووە، ئێستاکەیش تیۆری دیکە دەربارەی جوانناسی داهێنراوە کە لە بندیتۆ کروتشە= Benedetto Croce وە سەرچاوە وەردەگرێت و تاڕادەیەك جێگری ئەو مەکتەبەیە.

باوەڕی کروتشە بەرەو رووی ڕەخنە زۆر بۆتەوە، بنچینەی باوەڕەکەی ئەمەیە کە دەڵێت: ڕاستترین پێناسی هونەر ئەمەیە کە هونەر بە بینین = شهود intuition ی سادە و ساکار بزانین... ئەم تیۆرە کاریگەریی لە کۆی تیۆرەکانی پێشو دەربارەی هونەر زیاترە، بەلأم تەنها خاڵێك کە دەبێ ئاگاداری بین ئەمەیە کە ئەم تیۆرە ئالۆزو گشتییە لە بواری هونەردا بەبێ سود بینین لە ووشەی " جوانی" کاری خۆی بەڕێوە دەبات، وە تەنها گرنگی لەوەدایە کە بە زاراوەی وەك بینین و غەزەل پشت دەبەستێ.

## 6– ئایدیالی کلاسیك

ڕاستی ئەمەیە کە ماناو گرنگیی مێژوویی ڕەچاوکردنی جوانی سنوردارە، جوانیو ڕەنگدانەوەی ئایدیالی جوانی لە یۆنانی دێرین دا سەریهەڵدا لە ئەنجامی فەلسەفەیەکی تایبەتی ژیانەوە، ئەو فەلسەفەیەش بە ڕادە یەکی زۆر مرۆڤانە بوو، بەو مانایەی کە مرۆڤایەتی و مرۆڤی ستایش و نەمر دەکرد بەجۆرێك کە خواکانیشیان لە مرۆڤ بە مەزنتر دەزانی و هەیئەتی ئەوانیان لە قاڵبی مرۆڤدا داڕشتووە.

هونەریش وەکو باوەڕی ئاینی شێوەی بە ئایدیال کردنی سروشت بوو بەتایبەتی مرۆڤی یا وێناندنی مرۆڤی بە ئایدیال دەکرد بە ناوی پلەی باڵای بەدیهێنانی سروشتی.

ئەپۆلۆی بیلڤیدەر – و–ئەفرۆدیتی میلوسی (Apollo Belveder and Aphrodite of melos) نمونەی هونەری کلاسیکن کە بریتین لە واتای تەواو یان ئایدیالی مرۆڤانە بە شکڵو هاوڕێژەی تەواو. بە واتای ترۆپکی جوانی جوان وەڕویان خستووە.

ئەم بێخەی جوانییان بە شێوەی کەلەپور بە ڕۆمایی یەکان گەیشت و لە قۆناغی ڕێنیسانس دا دووبارە ژێنرایەوە، بەڵام ئێستاکە لەسەر هەمان شێوازی ڕێنیسانس دەژیین و جوانیش بە ناچاری پەیوەندە بە وێناندنی ئایدیای بێخێکی تایبەت بە مرۆڤ کە بە دەستی خێڵی سەرەتایی و سەرزەمینی دوور و دوور لە مەرجایەتی ڕاستی ژیانی ئێمە بەدیهێنراون.

لەوانەیە ئەم ئارەزووە یان ئایدیایە وەك باوەڕێك لە هیچ باوەڕێکی تر نەچێت، بەڵام دەبێت ئاگاداری ئەوەش بین کە تەنها ئایدیای شیاوە.

ئەم ئایدیایە لەگەڵ ئایدیای بێزانتی دا کە نەك مرۆڤانە، بەڵکو خواوەندانە و هزرانەو دژە ژیانی و کۆنتراستی بوو جیاوازییەکی زۆری هەبوو... هەروەها جیاوازیشی لەگەڵ هونەری سەرەتاییدا هەیە کە دەشێت بەهیچ جۆرێك ئایدیالی نەبووبێت، بەڵکو ڕەنگدانەوەی ئەو ترسە بوو کە کەسێکی سەرەتایی لە بەرامبەر جیهانی پڕ نهێنی و بەند و بالۆرەی نابەجێدا درکاندویەتی.

ئایدیای یۆنانییەکان جیاوازە بە ئایدیای ڕۆژهەلاتیش، هەرچەندە ئەمیش ئەبستراکتیو نائەندامی و میتافیزیکییە، لەگەڵ ئەوەشدا زیاتر لایەنی غەریزی دەنوێنێ تاهزری.

بەلام نەریت و باوەڕی ئێمە زیاتر پابەندی دەزگای وشەییمانەو وشەی جوانی هەمیشە لەخزمەتی ئەو ئایدیایانەدایە کە لە هونەردا والا کراون بەکار دەبەین.

ئەگەر بەرامبەر خۆمان ڕاستگۆبین، بێگومان دەبێ درەنگ یا زوو لەو بەهەڵەدا چوونە واتایی یەدا هەست بە گوناهی خۆمان بکەین.

ئەفرۆدیتی یۆنانی مادۆنای بێزەنتی و بتی دڕندەی گینای نوێ یا دەشتی عاج ناتوانن بەگشتی پێکەوە بەهەمان بۆچون و پێناسەی جوانییەوە پەیوەست بن" هەڵبەتە ئەگەر بڕیار بێت وشە بەپێی پێویست مانایەکی ڕاستی هەبێت.

دەبێ ئاگاداری ئەوەش بین کە ئەم ئایدیایەی دوایی ناجوان یان دزێوە.. بەلام بەگشت ئەمانەوە لە ڕاستی دا چ جوان و چ دزێو دەبێت بە بەرهەمی هونەری ناو ببرێن.

## 7- جۆرایەتی هونەر

پێویستە دان بەوەدا بنێین کە هونەر بەیانی ڕەنگدانەوەی ڕوخساری هیچ ئایدیایەکی تایبەت نییە، هونەر بەیانی هەر ئایدیایەکە کە هونەرمەند لە توانایدا بێت بە وێناندنی پلاستیکی بەدیی بهێنێت.

لەو باوەڕەدام کە هەر بەرهەمێکی هونەری لەڕووی وێناندنەوە ڕێبازێك پەیڕەو دەکات، ئەو ڕێبازەش بەهیچ ڕوویەکی والاّ شایەنی ڕونکردنەوە نییە... چونکە هەرچەندە بینای بەرهەمێك کە بە هەولّی ڕاستەوخۆی غەریزە دەژمێردرێت بتۆژینەوە و بە ڕوویەکی دەستووری سادە بیتۆژینەوە" ئەوا ڕونکردنەوەکە دژوار دەبێت.

تەنانەت لای ئوستادانی ئاکارپەرستانی سەردەمی ڕێنیسانس ئاشکرا بوو کە " هیچ جوانییەك خاوەنی شکۆی بالاّیی نییە ئەگەر لە هاوگونجاندن دا بەڕادەیەك سەیرو سەمەرەی تیادا نەبێت. "

## 8- هونەرو جوانناسی

هەستی جوانی بەهەر شێوەیەك پێناس بکەین، دەبێت ڕاستەوخۆ ئەوەیش بخەینە پالّ کە جوانی شتێکە – تیۆری –" هەستی جوانی ئەبستراکتی پایەیەکی سەرەتایی چالاکی هونەرییە، کەسانێکیش کە سەرگەرمی ئەو چالاکییەن، کەسانی سادەن و لەژێر جۆرەها کارتێکەری ژیانەکی دا دەژین، ئێمە سێ قۆناغمان لەپێشدایە :-

یەکەم : پاراوی درکاندنی چۆنێتییە ماددییەکان – ڕەنگ – دەنگەکان – جولّە و بزوتن، وە جۆرەها نواندنی ئەندامیی دی کە باسمان نەکردون.

دووەم : ئارایشت، ڕێکخستن لەڕووی درکاندنەوە بە وێنەی شکلّ و نەخشی چێژبەخش، دەتوانین بلّێین هەستی جوانناسی بەم دووخالّە ئەنجام دێت.

دەشێت قۆناغی سێیەمیش هەبێت، ئەویش کاتێکە کە ئەو درکاندنە ئارایشتییە بە حاڵەتێکی تایبەت بە سۆز یا هەستێك کە پێشتر بوونی هەبووە هاوجۆر بکەین.. بەم شێوەیە دەڵێین ئەو سۆزە یا هەستە بەیان کراوە بەو واتایە دەشێ ڕاست بکەین گەر بڵێین هونەر بریتییە لە : "بەیان = دەربڕین"" بەلاّم دەبێ ئەوەش بڵێین کە ( ئەم ڕایە هەندێك جار لای پەیڕەوانی کروتشە پشت گوێ دەخرێت. ) بەیانیش بەم مانایە ئەنجامی کۆتایی یە، بە یاریدەی ئەنجامی پێشینەی درکاندنی هەستی و ئارایشتی — چێژبەخش — ی وێنەیی بەدی هات.

دەربڕین دەشێت خاڵی بێت لە ئارایشتی وێنەیی، بەلاّم لەو کاتەدا نەبوونی هاوڕێژەیی ڕێگری لەوە دەکات کە ئێمە بە هونەر ناوی دەبەین.

جوانناسی یان زانستی درکاندن بە دوو بەدیهێنانی یەکەمەوە سەروکاری هەیە" هونەر دەتوانێت لەدوای ئەو دوو بەدیهێنانە پەیوەندیی بە مەرجە سۆزییەکانیشەوە هەبێت، دەتوانین بڵێین تا ڕادەیەك گشت کۆسپێك کە دێتە ڕێگەمان لە توێژینەوەی هونەری دا لەوەوە سەرهەڵدەدات کە ئێمە ئەو جیاوازییە ڕوون ناکەینەوە.

بیرێك کە تەنها بە مێژووی هونەرەوە پەیوەستە، توێژینەوەی سەر بەوێناندنی جوانیی لەسەر دەکەین.

مەبەست و نیازی هونەریش لەگەڵ چۆنێتییە جوانییەکاندا تێکەڵ دەکەین — کە هەستێکە لەشێوەیەکی تایبەتدا بە ئێمە دەگات، وە لەو هەڵە تۆژراوەیەش دەرباز بوونمان بۆنییە... چونکە هونەر لە گواستنەوەی هەستەکان زیاتر شتێکی تر نییە.

## 9– شێوەو بەیان " دەربڕین "

ئەو ڕەگەزە گرانبەهایەی لەبوونی مرۆڤ دایەو لەهونەردا بە ڕەگەزی شکڵ دەناسرێت" هەستی جوانناسی مرۆڤە، ئەو هەستیارییەش نەگۆڕو چەسپاوە، ئەوەی کەلە گۆڕاندایە، دەربڕینێکە مرۆڤ بە یاریدەی شکڵەوە بە هونەری دەکات، هەرکاتێك شکڵەکان لەگەڵ

هەستە ئانییەكانی یەكانی مرۆڤ دا لێكچوو هاوشـێوەبن، بەبەیانكـەر ناویـان دەبـات، بـەلاّم دەشێت هەمان شێوە " شكلّ " بەهایەكی بەیانی —ی جیاوازی هەبێت.

نەك تەنها لای كەسانی دی بەڵكو لـە قۆناغـەكانی دیكـەی مێـژووی شارسـتانیەتیش دا ووشەی بەیان = دەربڕین چمكێكی زۆر ئالۆزی هەبووە.

بەلاّم ئێمە ئەم ووشەیە بۆ نیشاندانی ڕازەری سۆزی = " عاتیفی " بەكاردەبەین" بەلاّم هەمان ڕێكخستن كە هونەرمەند بە یاریدەی ئەو شـێوە هونەرییـە بـەدی دەهێنێـت، خـۆی لەخۆیـدا جۆرێكـە لـە " بـەیان "، هەرچـەندە وێنانـدن دەتوانرێـت بەچـمكی هزریـی وەك پێوانەكاری و هاوسەنگی و كێش و تەبایی شی بكەینەوە كە لە ڕاستی دا لە بناغـەوە لـە " دیدەوە = شهود " ەوە سەر هەڵدەدەن.

لـە شـێوازی كـاری ڕیالیزمـدا وێنانـدنی هونەرمەنـدان دەسـتكەوتێكی عـەقلّی نییـە، دەتوانین بلّێین سۆزێكە دابین كراوو بـەدیهێنراوە. هـەر كاتێـك كـە هونـەر بەناونیـشانی — حەزكردن لە داهێنانی شكلّ — پێناس دەكەین" چالاكییەكی عەقلاّنیی پـەتی لـەپێش چـاو ناگرین، بەڵكو مەبەستمان لە چالاكییەكی غەریزی پەتییە.

بەو ڕوانگەیەش من ناتوانم بلّێم هونەری سەرەتایی لەڕووی شكلّەوە لە هونەری یۆنـانی كەمترە، چونكە هونەری سەرەتایی هەرچەندە دەشێت نوێنەری جۆرە ناتوانایی یەك بێـت لە شارستانیەت، بەلاّم دەتوانێت بەیانكـەری غەریزەیـەك بێـت بـۆ وێناندنـەكانی بەهـەمان دەسەلاّتی غەریزی یۆنانی، یان بگرە لەویش باشتر.

دەتوانین هونەری هـەر قۆناغێـك بەناونیـشانی دەسـتكەوت و بـەدیهێنانی ئـەو قۆناغـە لەبەرچاو بگرین... ئەگەر ئێمە بتوانین ڕەگەزی وێناندن كە — گشتین —و ڕەگەزی بەیان = دەربڕین كە " ساتین " جیاوازییـان لـە نێوانـدا بكـەین" نـاتوانین بلّـێین جیوتـۆ **Giotto** لـە ڕوانگەی وێناندنەوە لە مایكلّ ئەنجلۆ. كەمترو كەمدەسـتڕەنگینترە... دەشـێت وەهابێـت، بەلاّم بەهای شێوە " شكلّ " بەپلەی توانـای ئـەوەوە پەیوەسـت نییـە" ڕاسـتتر بلّـێم مـن نازانم چۆن دەربارەی شكلّ داوەری بكەم، جودا لە یاریدەی غەریزە كە داهێنەری شكلّە.

## 10– ناوچەی ئاڵتونی = دابەشکردنی ئاڵتونی
## Golden Section

لە سەرەتای رۆژگاری فەلسەفەی یۆنانەوە" یۆنانییەکان هەوڵیان داوە لە هونەردا یاسایەکی ئەندازەیی بەدی بهێنن، تاوەکو هونەریش " کە لەتەك جوانی دا بەیەکیان لەقەڵەم دەدا " هەمان گونجاندنی هەبێت، هارمۆنیش Harmony بە پەیڕەوکردنی هاوگونجاندن Prototype بەدی دێت" بەمەش دەتوانین گریمانی بکەین کە ئەم هاوگونجاندنانە نەگۆڕن و لۆژیکی وەرودەکەون.

هاوگونجاندنی ئەندازەیی ناسراو بە " دابەشی ئاڵتونی " سەدەها بە ناونیشانی هاوشێوەیەك، کلیلی نهێنییەکانی هونەرەو بەکاربردنی نەك تەنها لە هونەردا بەڵکو لە سروشتیشی دا هەمان سودی هەیە، بەجۆرێکی وەها کە هەندێ جار ڕێزێکی باوەڕیی دەخەنە پاڵ... لە سەدەی شانزەیەمدا گروپێ لە نووسەران سێ بەشی " ناوچەی ئاڵتونی " یان پەیوەست دەکرد بە سێ لای حەزرەتی مەسیحەوە.

دابەشی ئاڵتونی لە دوو بابەتی – ئیقلیدس دا بەیان کراوە : کتێبی دووەم بابەتی ("دابەشکردنی هێڵێکی ڕاست، بە جۆرێ کە لاکێشەی بەدی هاتوو لە درێژبوونەوەی هەمان هێڵ دا یەکێ لەبەشە یەکسانەکانی چوارلایەك بێت کە لەگەڵ بەشێکی تردا دروست دەبێ.")

کتێبی شەشەم، بابەتی 31 ( " دابەشکردنی هێڵ بە ڕێژەی خودی ناوەند و هەردوولا.")

دەستوری کاربردی ئەم باسە ئەمەیە کە هێڵێك " هێڵێکی سنوردار " بەجۆرێ دابەش بکەین کە ڕێژەی پارچەی کورتتری لەگەڵ پارچەی لێکچوی درێژتر لەودا هاوشێوەبن بەهەمان هێڵ، ئەو پارچانەی کە بەدی دێت بە ڕوویەکی هاوشێوە 5 بە 8 دەبێت ( یان 8 بە 13 و 13 بە 21 و بەم جۆرە ) بەلاّم ئەم ڕێژەیە هەرگیز دیاریکراو نییە بەڵکو هەمان

شتە کە لە ماتماتیك دا بە ژمارەی ئالۆز ناسراوە... لەم بارەیەوە باسی زۆرنووسراوە و لـە ناوەنـــدی ســــەدەی رابـــردوودا لێکۆڵــەرەوان بەســـوربوونێکی زۆرەوە لـــەو بارەیـــەوە تۆژیونەتەوە. نووسەرێکی ئەڵمانی بەناوی زایسینگ Zeising هەوڵی دا تا بیسەپێنیّ کـە دا بەشی ئاڵتونی کلیلی نهێنی ئەندام ناسییە Morphology چی لە سروشت و چ لە هونەردا.

هـەروەها گوسـتار تیـۆدۆر فیـشنەر Gustar Theodor Fechner بنیاتنـەری جوانناسـی ئەزموونییە کە بەرهەمەکانی لە ساڵەکانی حەفتاکانی سەدەی رابردوودا بلاّوکراوەیە" هەمان مەسەلەی دابەشکردنی ئاڵتونی لێکۆڵیوەتەوە.

لەو کاتەیش بـەدواوە گشت بەرهـەمێك کـە دەربـارەی جوانناسـی نووسـراوە، هـەمان بابەتیان لە بەرچاو گرتووە.

زایـسینگ لـەرووی زیـادەرۆیی یـەوە وای گریمـان دەکـات کـە لـە بەرهـەمی هونەریـدا دابەشی ئاڵتونی لەگشت لایەکدا داوەرو زاڵە. بەلاّم بـەدیهێنانی تیوریـستانی دوای ئـەم دان بە رایەکانی ئەمدا نانێن.

هـەروەها دەتـوانین گریمـانی بکـەین کـە هونەرمەنـد پێویـستە لەسـەری ئـەو دابەشـە ئاڵتونییە ژیرانـە لـە داڕشـتنەکانی دا ڕێنمـایی بکـات، یـان بـە یاریـدەی هەسـتی وێنانـدنی خۆیەوە، واتە غەریزەیەوە، بە ڕوویەکی نادیارو ناتەواو پێی بگات.

لە پێوانەکردنی درێژی و پانیی پەنجەرەو دەرگاو لاپەڕەو چـێوەی کتێـب و ڕۆژنامـەدا زۆرجار سود لە دابەشی ئاڵتونی دەبینین، گوایە گشت پارچەو گۆنیـاو تـەرازوو یـان شـاولّ سەر بەهەمان بنەمان" هەرەمەکانی میسریش لەسەر هەمان بناغە دارێـژراون... کەنیـسەی سەردەمی گوتیك بەهەمان ڕێژە واتە درێژیی باڵی کەنیسە و تالارو ستون و تـاق و منـارە و بورج... هتد بەهەمان گریمانە داهێنراون.

ئەو هاوگونجاندنە یا ڕێژەگەرییە لە هونەری فۆتۆگرافیش دا بەکاردەبرێت :—

ڕێژەی بۆشایی سەرەوەی هێڵی ئاسۆ لەگەڵ فەزای ژێری هەمان هێڵ دا و بۆشایی پێش لەگەڵ بۆشایی پاشکۆ، هەروەها دابەشکردنی ستوونی تابلۆ سەربەهەمان دابەشکردنی ئاڵتونییە.

وێنەکانی پیرۆدیلا فرانچیسکا Pierodella Francesca نمونەی بەهێزن بۆ نیشان دانی ئەندازە نواندن و دابەشی ئاڵتونی.

## 11– هارمۆنی هونەری

نەك تەنها دابەشی ئاڵتونی، بەڵکو ڕێژە ئەندازەییەکانی دیکەش وەك چوارلا لەناو هەر لاکێشەیەکدا کە لاکانی یەکسان بێت بە درێژایی هەمان لاکێشە بە پێکهاتی تاڕادەیەك ناکۆتایی بەکاردەبرێت بۆ بەدەست هێنانی هارمۆنیی تەواو... هەمان ناکۆتایی ڕێژەیی ئەم پێکهاتانەیە کە میکانیزمی هارمۆنیی تەواوی بەرهەمێکی هونەری ناشیاو دەکات" چونکە خاڵە بڕەڕەکان لەو یارییەدا نەگۆڕو دیارن، بەکاربردنیان بۆ بەدیهێنانی ئەنجامی باش پێویستی بە غەریزەو دیدەی سروشتییە.

حەز دەکەم گریمانەیەك کە پەیوەستی پێوانەی شیعرییە بخەمە ڕوو" دەزانم کە کێش = وەزنRhythm لە شیعردا یەکلایە و ناتوانێت بەرگە بگرێت، بەو ئاراستەیە شیعر بوار بەخۆی دەدات کە بلکێ بە کێشەکانی یەوەو مامەڵەیان پێ بکات، لە ئەنجامدا شیعر گەلێك ڕازاوەتر دەبێت" بەهەمان هاوسەنگی لە هونەری پلاستیکی دا هەندێك هاوڕێژەی ئەندازەیی شاراوە بوونی هەیە لە پێکهاتی جیهان دا و دەشێ پێوانەکاریی بەردەوام بن کە هونەر بە ڕوویەکی تەواو لێیان دوورەپەرێزە — ڕادەو سنوری ئەم دوورەپەرێزییەش وەك لادانی شاعیرە لە کێشی شیعر و خۆی پابەندی بنەما نەکات، بەڵکو پابەندی دەربڕینی غەریزی و هەستیارانەی sensibility هونەرمەندانی خۆی بێت.

هەست دەکەم شیکردنەوەی جای هامبیج = Jay Hambidge دەربارەی گوڵدانی یۆنانی ئەنجامی هێناوە پڕ سەرنج ترین و سەرکەوتوترین شاکاری ئەندازەیی بەرهەمێکی

هونەرییە، وەك بزانم گوڵدانی یۆنانی لەسەر بنەمای دەستووری ئەندازەیی دروست کراوە" بەهەمان بەڵگە کەماڵ و تەواوی ئەو گوڵدانانە ساردو بێ گیانن.

لە گۆزەیەکی دەستکردی بابایەکی لادێیی سادەدا زۆرجار جوانی و شکۆی زیاتر بەرچاو بەدی دەکرێت، لە ڕاستی دا یابانییەکان چەرخی گۆزەکانیان خۆویست خراپ دەکەن، چونکە باوەڕیان وایە کە جوانی ڕاستەقینە تا ئەو ڕادەیە ڕێکوپێك نییە.

## 12– ڕەفتارکردن = وانیشاندان = لادان و شێواندن = distortion

ڕەفتارکردن = distortion یا شێواندن بە مانای دوورکەوتنەوە لە سیستەمی ئەندازەیی، بەواتایەکی دی گوێپێنەدان بەو هاوڕێژانەی کە لەسروشت دا بوونیان هەیە... بۆیە دەشێ بوترێت لەهەر ڕەوتێکی هونەردا جۆرە لادانێك، گۆڕانکارییەك بەڕوویەکی گشتی یا بە دژایەتی بوونی هەیە یا هەبێت... تاوەکو پەیکەرسازانی یۆنانی بۆنزیکبونەوە لە وێنەی ئایدیاڵی ناچار دەبوون لە یاسای سروشتی لابدەن، چونکە هێڵی ڕێك و ڕاست هەرگیز لە واقیع دا لە پێکهاتی شکڵەکانی دا بەو تەواوییە بەدی ناکرێت کە لە پەیکەری ئەفرۆدیت دا بە دی دەکەین.

لە ڕاستی دا بەر لە ڕێنیسانسی ئیتالیا کۆسپە بتوانین بەرهەمێك بەدی بکەین کە بە ڕوویەکی ڕێژەیی لە ڕاستی لاینەدابێت و دەستبۆبردن ڕۆڵی تیا نەدیبێ. لەسەدەی شانزەیەمدا بەهۆی بەهەڵەداچوون لە ناسینی مەبەست و ئامانجی هونەری کلاسیك، پێشبینیی دوپاتکردنەوەی سروشت بە ڕووە ڕاستییەکەی خۆی گرنگیی پەیدا کرد " بەڵام ئەم کارە زۆری نەبرد.

لە سەدەی هەڤدەو هەژدەدا بەبەڵگەی جیاواز وێناندنی ڕێنیسانسی هونەریان سەربەست کرد ، وە تەنها لەسەدەی نۆزدەیەمدا کە سەردەمی ژیاندنەوەی بەدرۆی ڕێبازی مردوو بوو " جارێکی تر دوپاتکردنەوەی ڕاستییان هێنایەوە گۆڕێ. بەڵام شێواندن

له ڕاستی دا پلەی جیاوازی هەیە و دەمەوێ بڵێم هیچ کەسێك لاری لە بە ئایدیالکردنی ڕاستەقینە نەبووە... تەنها کاتێك کە ئابڕوی سروشت برا، بینەر زمانی ڕخنەی خستە گەڕ، هێڵی ناوچەوان و لۆچەکانی لەگەڵ ئەبرۆدا دەشێت ڕێك و ڕاست بێت بەڵام پێیەکان نابێت کەچ و خوار بن لە وێناندن دا... مەسەلەکە لە پلەداری دەدوێت، بەڵام ئاشکرانییە کە جیاوازی بە تەواوی لە پلەکردن دا سەر هەڵدەدات، کەواتە هێڵی نێوان لەکوێوە دەتوانین ڕابکێشین؟ ئەگەر هونەری یۆنانی واز لێبهێنین و ڕوویکەینەوە هونەری سلتی و چینی کۆن، دەبینین لەو هونەرەدا دەستکاری کردنی سروشت بە جێگەیەك گەیشتووە کە بابەتی سەرەکی بەگشتی نادیار کراوە و جگە لە نەخشی ئەندازەیی شوێنەواری تر بە دی ناکرێت.

لە هونەری بێزەنتی دا مەیلی دووبارەکردنەوەی بیر بە ڕوویەکی سیمبوڵیکی دەبینرێو مرۆڤەکان لە وێنەکان دا لە مرۆڤی خۆیان بێ بەش کراون، مەسیح لە دامێنی مریەمی کچ دا بەدی دەکەین لە منداڵ ناچێت، بەڵکو نەخشەکارییەکە، نواندنێکە لە شکۆو باڵایی حەزرەتی مەسیح دەدوێت.

له هونەری گوتیك دا گشت تەقەلایەك لە پێناوی یەکپارچەکردنی کەنیسەدایە، لە پێناوی بەیانکردنی چییەتی زیاتردا = Transcendental هەستی ئایینی بە کار دەبرا.

چۆنێتی ئایدیای هونەری یۆنانی لەگەڵ چۆنێتی سیمبوڵێکیی هونەری بێزەنتی دا ئاوێتە دەبێت، مەبەستمان لە دوپاتکردنەوەی واقیع نییە.

له هونەری چینی دا، لە هونەری ئێرانی دا ، لە هونەری ڕۆژهەڵاتدا بەگشتی بابەت بوونی هەیە و بەدی دەکرێت" بەڵام نەك بە شێوازی ڕاستی یا واقیعی، بەڵکو بە شێوەیەکی هەستی — بەهەمان مانا کە بابەتەکان تەنها بە ڕیتم و ژیان یاریدە دەدرێن کە هونەرمەند دەیانهێنێتە بوونەوە.

ئەم دووره پەرێزییە لە دوپاتکردنەوەی بە سەرنج، لە گشت ڕوویەکەوە مەبەستداری و خۆویستە، یا ویستییە "ارادی" کە هونەرمەند مەیلی وێناندنی دەکات، واتە مەیلدارێتی

هونەرمەند بۆ نواندن یا بەدی هێنانی نەخشێك یا قەبارەیەكی هاوسەنگ یا یەكگرتوو ئەو لادان و شێواندنە لە بەرهەمی هونەرەكاندا گریمان دەكات. یان مەیلی هونەرمەند بۆ ڕەخساندنی سیمبولێكی لە هەستە دەرونییەكانی دا. بە باوەڕی من دەتوانم بڵێم كە ئەم قۆناغەی دووەم" واتە ئارەزوی بە سیمبولیكی كردنی هونەر، مەیلێكی جوانناسی پەتی نییە... كەمتر بەرهەمی هونەریی وەك كەنیسەی بێزەنتی ڕڤینا = rvenna سەرنجی مرۆڤ ڕادەكێشێ.

بەلأم هونەری ئەم جۆرە كەنیسانە زیاتر دەستكردی زەمانی ڕابردووە، واتە كارتێكردنی ئەو كەنیسانە لەسەر ئێمەكارتێكردنێكی تەواو هونەری نییە. بەڵكو بەشێكی كارتێكردنی مێژوویی و بەشێكی ئایینی و بەشێكی تری دەوروبەرییە . تا ئەو ڕادەیەش نابێت توانای هونەرمەند وەلاوە بخرێت و هونەر لەو لەمپەرانە جیابكەینەوە، ئەو كاتە دەبینین كە تەنها ڕەگەزی شكڵ و ڕەنگ لەپێشمان دا بەدی دەكرێت.

## 13 – نەخشاندن = وێناندن

ئەویادەوەریانەی خۆ بەخۆ دەبنە هۆكار و هونەرمەند ( ئەو هونەرمەندەی لەناو هەر یەكێك لە دەرونی ئێمەدا بوونی هەیە) لە ویژدانی خۆیدا بە ناوی وێنە یان نەخش بەیانیان دەكات ڕوویەكی ئاشكراو دیاریان نییە، هەر چەندە لە ڕوانگەی فیزیۆلۆژییەوە شاكارەكان دەشێت شی بكەینەوە، بەلأم غەریزەكان پاڵمان پێوە دەنێت كە دوگمەی نا پێویستی بەرگەكانمان دادورین و ڕەنگی گۆرەوی و كلأو چاكەتمان هەمەڕەنگ بكەین، هەمان غەریزەش هونەرمەند وادار دەكات كە بابەتی كارەكانی بە وێنەی نەخشاندن دارێژێت – بەردتاشێك كە ئەسپی چینیی – وێنە 66 – داتاشیوە توانیوێتی بە بێ ئەركی زۆر ئەسپەكەی خۆی واقیعی تر دروست بكات " بەلأم ئەو هونەرمەندە بە ئاگا نەبووە بە توێكاری ئەندامەكانی ئەسپ یان پشت گوێی خستووە، چونكە ئەسپەكە لە چەمانەوەیدا نەخشێكی تایبەتی لە ڕوانگەی ئەودا والا كردووە و بۆیە لە ئەنجامدا تورەكەی مل و شانی

و کۆپان و پێیەکانی لەپێناوی نەخشی سەر بە دەستکردی هونەرمەند بونەتە قوربانی هەمان نیشاندانی چەمانەوەی ئەسپەکە... ئەنجامی کار ئەوەیە کە لە ئەسپ ناچێت و زیاتر لە شێر دەچێت و هەندێ کەسیش بەو هەڵەیەدا دەچن لە سەیرکردن دا، بە لاّم شاکارەکە شاکارێکی هونەریی بەهێزە.

ئەم ئەسپە چینییە لە داوەری دا بە گەورەترین بەرهەمی قۆناغی چینی پەیوەندە، لە بەرامبەر ئەمەش دا کەسی گومانکەر وای بۆ دەچێت کە خاوەنی هیچ خەوشێك نییە. بەلاّم کاتێك دەگەین بە بەرهەمێکی هونەری نوێ وەك تابلۆی " پشووی مۆدێل" بەرهەمی هنری ماتیس Henri Matisse (وێنەی 58) ئاشکرا نییە بە چی ڕقێك خرۆشان بەرپا دەبێت، ماتیس لە مۆدێلەکەی خۆیدا بەناونیشانی مرۆڤێکی زیندو بە ئاگا نییە، بەڵکو لە چۆنێتی بیناکاریو دارشتنیش ئاگادار نییە، ئەم هۆیانە نەخشێك لە ڕوانگەی هونەرمەنددا والاّ دەکات کە بەو وێناندنە بەدی هاتووە، ئەمەش نەك تەنها بە بەرهەمێکی هونەری ڕەسەن لەقەڵەم دەدرێت" بەڵکو جۆرە درکاندنێکی یا دیدێکی نوێی بەدی هێناوە کە زیندوتر و جوانترە لەو مۆدیلەی کە بە یاریدەی دوپاتکردنەوەی ڕاستی و سروشتی بەدی هێناوە.

بەلاّم تەنها وێناندن یا نەخش بەرهەمی هونەری زادە ناکات، ڕاستەوخۆ دەتوانین بڵێین" هەرچەندە بەرهەمی هونەری هەمیشە لە بۆتەی جۆرە نەخشێکدایە، هەر نەخشێك ڕاستەوخۆ بەرهەمی هونەری نییە.

پێویستە زاراوەکە دەربارەی ئەم وتەیە کەمێك ڕوونبکەمەوە" بەرهەمی هونەری بە گشتی لە پلەیەکی ئاڵۆزی دەدوێت، بە ڕوویەکی سادە لە بازنە و سێ گۆشەی ئەندازەیی تا لە وێنەی شکڵیش، بەلاّم دروست کردنی فەرشێکی ماشێنی ناوی هونەری پێوە نالکێنین، هەرچەندە ئەو جۆرە دروستکردنە یا چنینە دەشێت هاوسەنگ و هاوڕێژەش بێت، واتە لە ڕووی یاسای پەیرەوی هونەرییەوە تەواو بێت و بێ خەوش بێت.

## 14- ڕەگەزی خودی

ئەوەی ڕاستەوخۆ  لە بەرهەمێکی هونەریی ڕەچاو دەکەین، بەجۆرە ڕەگەزێکی خودی ناو دەبەین، چاوەڕوانین ئەگەر هونەرمەند خاوەنی زەینێکی هەڵکەوتوو نەبێت، لەسەرێتی خاوەنی هەستیارییەکی کارامە و هەڵکەوتوو بێت، چاوەڕوانین هونەرمەند شتێکی نویَ و ڕەسەنمان بۆ ئاشکرا بکات، واتە ڕوانگەیەکی سەر بە خود و تایبەتخوازمان نیشان بدات... هەمان چاوەڕوانییە کە چاومان بە گشت تێبینیەکی تر نابینا دەکات و بەهەڵەمان دەبات دەرهەق بە چییەتی هونەر.

تابلۆیەك سەرنجی کەسێکی سادە ڕادەکێشیّ" کەسەکە ئەوە فەرامۆش دەکات کە هەستیاری حاڵەتێکی خرۆشاندنی زەینی مرۆڤە و ئەو شتانەش کە تێکەڵ بە هەستیاری مرۆڤ  دەبن هەر یەکەیان بوویەکی عەینیی خۆیان هەیە. هونەرمەندیش زیاتر کاری بەو بینراوانە هەیە، بە هەر ڕادەیەك هونەرمەند لە هەستیاری لابدات و وانەی ئاکاری دابدات یا ناهەستانە خوو بداتە بابەتی نا هەستی تر" بەهەمان ئەندازە لە پلەو پایەی بەرهەمی هونەری خۆی دوا دەکەویَ و توانای لە دەست دەدات.

واتە پێناسەی  لەباری بەرهەمی هونەری ئەمەیە کە بەرهەمی هونەری دەبیَ بریتی بێت لە نەخشاندنێك کە ئەو نەخشاندن و وێنەیە شوێنەواری هونەری پێوە دیار بێت واتە شوێنەواری هەستی.

## 15 – پێناسی وێناندن = نەخشاندن .

نەخشاندن لە بەکاربردنی سادەی خوددا _ بۆنمونە نەخشی یا وێناندنی پارچە پەڵەیەك، واتە دابەشکردنی هێڵ و ڕەنگ  لە زنجیرەیەکی دوپاتبۆوەی دیاریکراودا، نەخش والآکەری جۆرێکە لە لەباری لە سنورێکی دیاریکراودا، لە تابلۆی هونەریدا ئەو مەیدانە یا

سنوره بە چێوەی تابلۆکە سنوردار دەکرێت، لەم نمونە سادەیەی نەخشاندنەوە گەر زیاتر بەرەو قۆناغی باڵاتر برۆین، رووبەرووی تێکەڵ کردن دەبینەوە، سەرەتای قۆناغی ئەو تێکەڵەش هەڵسەنگاندن و جیاوازیکردنە، لە هەڵسەنگاندندا بە شوێنی دوپاتی وێنەیەك لە زنجیرەیەکی یەکسانی بەرامبەر یەکدا، گەر وێنەکە سەرەو نگون بکەینەوە و بەرامبەری وێنەی پێشوو دایبنێین، ئەو رووە لەوانەیە لە هەندێك لاوە کە لە هونەری جۆلأیی دا بەدیی دەکەین دیاری بدات.

بەو شێوەیە دووپاتبوونەوەی هاوسەنگی تەواو دروست دەبێت " وەك چۆن لە بابەتی بەربلأوی هونەری رۆژهەلأتدا بەدیی دەکەین .

بۆ نموونە دووگیاندار رووبەرووی یەکتری دادەنرێن، تێکەڵی دوایی بریتییە لە ئازادکردنی هاوسەنگیی هەڵسەنگێنراو و بەدیهاتنی هاوسەنگی دابەشکراو، لەو بارەیەوە بەرهەمی هونەری نیشان دەری خاڵی عەتفە (شایەنی پێوانە کردنە بە چەقی قورسایی) واتە "مرکز السقل" کە هێڵەکان و روو و قەبارەکان لە دەوروبەریاندا جۆرێك دابەش دەبن کە هاورێژەی تەواو بەدی دێنێت .

مەبەستی بنیاتی گشت ئەم بەشە جیاوازانە بریتییە لە هارمۆنی یان هاوگونجاندن، هاوگونجاندنیش هەستی جوانیمان رازی دەکات.

## 16 – پێناسی وێنە = شکڵ= FORM

کتێبی زمانەوانی وشەی بەم جۆرە پێناس دەکات : "شکڵ، رێکخستنی بەشەکان لایەنی بینراو =visible ."

شکڵی بەرهەمێکی هونەری جگە لە شێوەو ئارایشتی"رێکخستنی" بەشەکان و لایەنی بینراوی بەرهەمەکە شتێکی دی نییە... لە بەر ئەمە هەر شکڵێك لە بوون دا دەبێ روخسارێکی هەبێت ، ئەگەر دوو شت یان زیاتر پێکەوە کۆببنەوە ئارایشتێکیان لێ ئەنجام دێت ، بەڵام دیارە و دەزانین کە کاتێك لە شێوەی بەرهەمێکی هونەری دەدوێین ،

مەبەستمان لە شێوەی تایبەتی شکڵە" مەبەست لە شکڵێکە یا وێنەیەکە بەجۆرێك لە جۆرەکان کارمان تیَ دەکات.

شکڵ = شێوەپابەندی لەبارییە یا نەزم یا هەڵسەنگاندن یان هیچ جۆرەگونجانێکی دیاری کراوی نابێت، کاتێك لەشکڵی ئەندامی وەرزشکارێك دەدوێین، یا لە شکڵی بەرهەمێکی هونەری دەدوێین, کەم و زۆر مەبەستمان شتێکە، وەرزشکار لە شکڵێکی لە بارو باش دایە و گۆشتی زیادەو چەوری لەشی نەتەنیوە و بڕێو و ساغە... ماسولکەکانی بەهێزن وجوڵەو سەکەناتی بەجێیە ... هەمان خاڵ دەربارەی پەیکەرێك یان بەرهەمێکی هونەری دووپات دەکەینەوە بڕوانە تابلۆیەك کە بە نمونە لەبەر چاوی دەگرین ... دەبینین لە کاتی سەرنج داندا چی ڕوو ئەدات "وای گریمان دەکەین کە تابلۆیەکی باشەو دەمانبزوێنێت.

## 17– سەرنج دان لە تابلۆی هونەری

تابلۆیەك کە بەسەری دەکەینەوە پارچەیەك ڕەنگە " وێنە 10 " بەرهەمی هونەرمەندی مەزنی ژاپۆنی کاتسوشیکا هوکاسییە1849 – 1760 " Katsushika Hokugai "، لەسەر ئەو گریمانەیەی کە تابلۆی ناوبراو تابلۆیەکی نایاب و باشە، ئەمەش بەفەرز دەگرم کە کەسێك " واتە تەماشاکەر " لەبارێکی دەروونیی گونجاودایە" تەنها مەرجی پێویستی باسەکە ئەمەیە کەکەسی تەماشاکەر خاوەنی سەلیقەو زەینێکی تەواو بێدار بێت. واتە با بیَ و جۆرێکی تایبەت لە وێنەکاری ببینێت، یان نابێت چاوەڕوان بێت کارێکی هونەری ببینێت، تەنها لە جێگەیەکەوە ڕادەبریَ و لەحاڵەتێکدایە کە هیچ شتێکی دیاری کراو و تایبەتی لە یاددا نییە و لە بەرامبەر تابلۆی جیَ سەرنج دا ڕادەوەستیَ" ئەوەی کە ڕوو دەدات تاڕادەیەك پەیوەندی بە ئارەزوی کەسی بینەرەوە هەیە، بەڵام ئێمە مەسەلەکە لە ئاڵۆزترین جۆری توانای خۆمانەوە دەخەینەڕوو... واتە گریمان کەسی تەماشاکەر پیاوێکی ئینگلیستانییە و ئاستی ژیانی ناوەندییە، ئەگەر کەسێکی ڕۆشنبیر خۆی لەپشتەوەی

تابلۆکەدا حەشاربدات و جوڵە و سەکەناتی تەماشاکەرەکە ببینێ، دەشێت تێبینی ئەوە بکات کە چاوانی پیاوە ئینگلیزەکە کەمێ دەکرێتەوە" تا هەناسەیەکی قوڵیش هەڵدەکێشێت، لەوانەیە لێوە لەرزەیەکی هێمنیشی تووش ببێت، لەوانەیە ئەو پیاوە ئینگلیزە سێ چرکە بەرامبەری تابلۆکە بووەستێت، لەوانەشە پێنج خولەك ڕابوەستێ و پاشان ڕێگەی خۆی بگرێت، دەشێ نامەیەکیش بنووسێت و لەو چێژەی کە ئارامییەکی هێندەی پێ بەخشیوە بە ڕوویەکی سروش بەخش بۆچونەکانی خۆی تۆمار بکات.

## 18- ئیمپاتی = هاوهەستی بوون

بۆ ڕوونکردنەوەی کاری زەینیی مرۆڤ لە چەندین لاوە چەندین تیۆر بەدیهێنراوە، بەلاّم بە بڕوای من ئەو تیۆرانە زیاتر لایەنی ئانیی مەسەلەکان لە پێش چاوناگرن و لەو ڕووەشەوە هەڵەن.

باوەڕ ناکەم هیچ کەسێك کە خاوەنی هەستیاریی ڕاستی بێت، بێت و بەرامبەری تابلۆیەك ڕاوەستێ و پاشان شاکاری درێژخایەن دەربڕێت کە گوایە ئەو تابلۆیە خۆشی هێنەرە.

لە یەکەم سەرنجەوە تابلۆکەمان بەدڵدا دەچێت یا ناچێت، شتێکیش هەیە کە بەهۆی کارتێکردنی ئانییەوە ناتوانین کۆی بابەتەکە بدرکێنین، بەرهەمی هونەری پێویستە هەمیشە لە لەمپەر ڕووتبکرێتەوە، زۆر لەبەرهەمی هونەری، بۆ نموونە ڕووی دەرەکیی کەنیسەی گوتیك — پێکهاتووی ئالۆزی لە چەندین بەرهەمی هونەریی دی جیاوازە، بەرێکەوت دەردەکەوێت کە وێناندن یەکبوونی " وحدە " تیا بەدی هاتبێت... بەلاّم ئەمە تەنها مەرجێکە کە بوونی پێویستە.

دەڵێین بەرهەمی هونەری " بزوێنەرە "، ئەم وتەیە ڕاستە، بەدیهێنانێك کە لای سەیرکەر بەدی دێت ئاتاجی سۆزەکانێتی :— ئەو بەدیهێنانە هاوتای گشت ئەو ڕەنگدانەوە نەویستەیە کە دەروونناسان بە سۆزی پەیوەندیی ناودەبەن... بەلاّم هەمان شێوە کە —

سپێنوزا — کە دەشێ یەکەم کەس بووبێت ئەم خاڵەی وەرِوخستبێ ( لە بەشی پێنجەمی کتێبی " ئاکار " دا، مەسەلەی سێیەم )

لەنێوان ئەو تیۆرانەدا کە خوردبوونەوەی ئانی پەسەند دەکەن تیۆری " Ein fuhlung " لەگشتیان سەرکەوتوترە... ئەو بەرهەمانەی کە لەم تیۆرەدا نووسراون بەربلاَون، بەلاَم جیاکردنەوەی کلاسیکیان بەیاریدەی تیۆدۆر لیپس = Theodor Lipps ئەنجام هێنراوە کە یەکێکە لە گەورەترین نووسەران، لە دەروازەی جوانناسی دا توێژینەوەی کردووە" وشەی Ein fuhlang ی بە پێوانەی Sympathy = هاودەردی یا هاودڵی بە Empathy دەربرِیوە، وەهەمان شێوە کە سیمپاتی بە مانای هاوهەستی بوون دێ، " لەگەڵ " شتێکدا کە ئیمپاتی بە مانای هاوهەستی بوون " لەنێو " ئەو شتەدا دەگرێتەوە.

کاتێک دەربارەی کەسێکی توشبوو بە دەردێک هەستی هاودەردی یا سیمپاتی دەردەبرِین، هەستی یا هەستیاری ئەو کەسە لەخۆمان دا نوێ دەکەینەوە، هەمان شێوە کاتێ لە بەرهەمێکی هونەری خورد دەبینەوە، خۆمان لە روخساری ئەو بەرهەمەدا پێچەوانە دەکەینەوە و هەستیاریمان بەهۆی ئەوەوەیە کە ئەو وێنەیە دەبینین.

واتە بەهۆی بۆشایی یەوە کە خۆمانی تیادا بەدی دەکەین، بەدی دێت... ئەو ئەزموونە راستەوخۆ پەیوەندیی بە بینینی بەرهەمی هونەرییەوە نییە، بێ گومان هەر شتێك تەماشا بکەین دەتوانین خۆمان " لەناویدا" یان لەوێدا هەست پێبکەین، بەلاَم کاتێک ئەزمون بەو شێوەیە گشتی دەبێتەوە، جیاوازی لە نێوان " سیمپاتی " و " ئیمپاتی " دا نامێنێت.

گەر سەرنج لەو شەپۆلە ژاپۆنییە بدەین، دەشێت سەرنجمان بەرەو کەسانێك کە لەناو بەلەمەکەدان ئاراستە بێت و دەرکیان بکەین، لەو کاتەدا بە یاریدەی مەترسییەکەوە کە هەرِەشە لە ئەندامانی ناو بەلەمەکە دەکات، سەبارەت بەو کەسانە هەستی " سیمپاتی " هاودەردی دەکەین، بەلاَم کاتێك ئەم تابلۆیە وەك بەرهەمێکی هونەری تێبرِوانین" جوڵەی شەپۆلە بەرزەکان بەدی دەکەین و هەستیاریمان کێش دەکات... بۆیە رۆدەچینە ناو جوڵەی بڵندو هەڵچون و داچوونی شەپۆلەکانەوە، تەقەلای شەپۆلەکان و هێزی کێش کردن

هەست پێدەکەین، وە گشت پارچەیەك لە شەپۆلەکان ڤنگەیان دێت و کەف دەکەن، هەست دەکەین خودی خۆمانین کە چنگاڵی جەرگ بڕی خۆمان بەرامبەر بووەکانی دی ئاڕاستە دەکەین کە لەژێرماندان.

## 19- بەهەستی کردن

بەرهەمی هونەری مانای ئازادکردنی کەسێتی مرۆڤە، هەستیاریمان عادەتی لغاوکراوو سەرنگونن، کاتێك بەرهەمێکی هونەری لەپێش چاو دەگرین، ڕاستەوخۆ هەستی ئازادبوون یان ئازادکردن دەکەین، نەك تەنها ئازادکردن بەڵکو هەستی هاودەردی " سیمپاتی " خۆی لەخۆیدا جۆرە ئازادکردنێکی هەستەکانمانە، هەروەها هەستی پتەوی باڵاییش دەکەین، جیاوازی بنچینەیی نێوان هونەرو هەستکردن sentimentacity لە هەمان جێدایە.

هەستیاریش دیسانەوە جۆرە ئازاد کردنێکی هەستییە، بەکورتی ئازادکردنی سەربە لاوازی و کرانەوەی سۆزەکانە... هونەریش سەربەست کردنی هەستەکانە، بەڵام لەهەمان کاتدا تواناو پایەداریی هەیە، هونەر پەیڕەوی ئابورییە لە بەیانکردنی هەستەکان دا، هونەر سۆزێکە کە شێوەی باشی لێوە بەرهەم دێت.

## 20- پێداویستی شکڵ

هەندێ جار نارەزایی دەردەبڕین کە تیۆری " Ein fuhlung " تەنها بەهونەری شکڵییەوە پەیوەستە، بۆ نموونە ڕازەرمان لەبەرامبەر ڕەنگەکان دا لە خۆی ناگرێت... شینی تێری ئاسمانی وڵاتی ئیتالیا یان خۆرئاوابوونی سەرنجمان ڕادەکێشێت، لەو حاڵەتەشدا شتەکان شکڵیان نییە تا وەکو هەستەکانمان بتوانن تێکەڵیان بن... بەڵام ئایا ئەم لایەنەی شتەکان دەتوانین ناوی هونەرییان بەسەردا گریمان بکەین؟ ئایا ئەوانیش دیاردەیەك نین کە هەستیاریمان لە بەرامبەریان دا وەڵامدانەوەی خۆی هەیە؟... بەم پێیە دوو یان چەند ڕەنگێگ لە کەناری یەکتریدا ڕێکبخەین، ئەوا پەیوەندییەکی وێنەیی بەدی

دەهێنێت... هونەر بەگشتی شتێك نییە جگەلە بەدیهێنانی ئەو پەیوەندییە شكڵییە "وێنەییە "... هەر كاتێك شكڵ لە ئارادا بێت " ئیمپاتی "ش بوونی دەبێت... هەركاتێكیش سەرنج لە تابلۆیەك بدەن، هەستی ئیمپاتی دروست دەبێت یان نابێت.

باسێكی دیكەش هەیە كە من توێژینەوەم بەو گریمانەیە دەستپێكرد كە بە زەینی كراوەوە سەرنج لە تابلۆ بدەین، بەلآم ئامادەیی زەینی كراوە شتێكە بەدەگمەن بەدی دێت، وەك چۆن ئامادەیی دەرونی بۆ بینینی زاتی ئالیهی بۆ كەسێكی خاوەن باوەڕ پێویستە بەدی بێت.

## 21– ناوەڕۆك

دەربارەی ڕازەری خودیمان بەرامبەر بە شكڵ تا ئەم ڕادەیە كافییە، بەلآم دیارە گشت ئەو شتانەی لە هونەردا ئاتاج دێن، بەشێوەیەكی پێویست بەشكڵ دابین نابێت و ئەنجام نایەن... هەروەها ئێمەش هەمیشە بەو ئاستە خودییە بەش بەش ڕازەرمان لەبەرامبەری هونەردا نیشان نادەین...

كەنیسەی گوتیك تەنها بۆ ئەوە دروست نەبووە كە هەستیاریمان ڕەزامەند بكات... بەڵكو كەنیسە مەبەستی دیكەشی هەیە، كۆشكێكە بۆ فێركردن و بلآوكردنەوەی باوەڕی ئایینی، شوێنی گێڕانەوەی بەسەرهاتە ئاینییەكانە... تەماشاخانەی وێنەكارییە بۆ كەسانی نەخوێندەوارو كەم بیر، كەنیسە لەهەمان كاتدا گشت ئەو شتانەیە.

تابلۆی هۆكاسای، دەتوانێت دەری ببڕێت، دەتوانێت بلێت ئەو بەرهەمە تابلۆیەكی سادەیە و شەپۆلێكی گەورە نیشان دەدات كە بەسەر دوو بەلەمی پڕ لە خەڵك دا شالآوی بردووە، ئەو لایەنانە هەمان شتن كە "ناوەڕۆك " ی تابلۆیەك پێك دەهێنن، وە چاترین شكڵیان لەڕەوتی ئۆرگانیكی دا دەتوانرێت تێبینی بكرێت ( بڕوانە پاراگرافی 32 ).

مەبەستمان لە " ناوەڕۆك " چاتر لە هەر ڕێگەیەكی دی، لە ڕێگەی بەسەركردنەوەی چەند جۆرێك لە هونەرەوەیە كە بەگشتی بێ ناوەڕۆكن ڕۆشن دەبێتەوە.

## 22- گۆزەگەری = هونەری بێ ناوەڕۆك

هونەری گۆزەگەری ساکارترین و لە هەمان کاتدا ئالۆزترین هونەرە، سادەترین جۆریان سەرەتایی ترین هونەرە، وە ئالۆزترین لەوەش ڕوتکاری ترین هونەرە = ئەبستراکتە.

لە ڕوانگەی مێژوویی یەوە گۆزەگەری لە ڕیزەی کۆنترین هونەر دادەنرێت، یەکەمین شکڵ مرۆڤ لە گڵی خاو دروستی کردووە کە لە زەوی دەریهێناوە و ئامادەی کردووە لەبەرخۆردا وشکی کردۆتەوە، تا لەو کاتەشدا لە پێش ئەوەی کە مرۆڤ خاوەنی نووسین و خوێندن بووبێت، بەرلەوەی وێژە و ئایینی هەبووبێت، خاوەنی ئەم هونەرە بووە.

ئەو پارچانەی کە لەو سەردەمە دێرینانەدا دروست کراون هێشتا پرهێزیی بەیانیان کارمان تێدەکات، کاتێك کە ئاگر دۆزرایەوە مرۆڤ فێربوو کە کەلوپەلە گڵینەکانی خۆی چاترو مەتین تر بکات.

کاتێك کە چەرخی سیرامیك داهێنرا، گۆزەگەر توانی کێش و جوڵەی بەتاوتر بەدی بهێنێت و بە وێناندنێك کە شێوە شکڵ بوو بۆ بەرهەمەکانی زیادبکات، ئەو کاتە گشت پێویستییەکی گۆزەگەری کە ڕوتەکارترین هونەرە بەدی هات.

ئەم هونەرە بە دەستپێکردنی سادەی خۆی گەشەیەکی بەربلاوی کرد تا لە سەدەی پێنجەم پ.م — دا بەشێوەی هونەرێکی نمونەیی بە هەستیارترین و ژیرترین جۆر بەدەستی ئەو خێڵانە بەدی هات کە جیهان بەخۆیەوە بینیوە.

گوڵدانی یۆنانی نمونەی تەواوی هاوگونجاندنی کلاسیکە، پاشان لە وڵاتانی ڕۆژهەڵات شارستانیەتێکی گەورەی گۆزەگەرییان وەك هونەرێکی نمونەیی و بە غەریزە بەدی هێناوە، ئەم هونەرانە تا ئاستێك لە یۆنان لەبارترو ناسکتر بەدی دەهات، گوڵدانی یۆنانی هاوڕێژەی جوانییە = static ، لەهەمان کاتیش دا گوڵدانی چینی هەمان شێوە خۆی لە کۆتی هونەرو زانستەکانی تر ئازاد دەکات و خۆی بە قۆناغی هاوگونجاندنی دینامیکی Dynamic گەیاند...

ئەم جۆرە گوڵدانە چینییە پەیوەندییان لە ئەژماردن نایەت، بەڵکو جوڵەیەکی زیندووە، پارچەیەك بلور نییە، بەڵکو پەڕەی گوڵێکە.

تــەواوترین نمونــەی گۆزەگــەری لــە هونــەری یۆنــان و چــین دا بــەدی دەکرێــت، لــە سەرزەمینی دیکەدا نمونەیان زۆرە، لە پیرۆ و مەکسیك، لە ئینگلتەرەو ئیسپانیای سەدەی ناوەڕاست، لە ئیتالیــای ســەدەی ڕێنیــسانس دا، لــە ئــەڵمانیای ســەدەی هەژدەیــەم — لــە ڕاســتی دا یەکــەم شارســتانیەتی ڕۆڵ دەبینێــت و گیــانی نەتــەوەیی خۆنەویــست تیایــدا ڕەنگدەداتەوە.

هونــەری هــەر وڵاتــە بــەڕادەی هەســتیاریی هــەر میللــەتێك دەتوانرێــت بــە هونــەری گۆزەگەری بپێورێت، ئەم پێوانکارییە، پێوانەکارییەکی تەواو دڵنیاکەرانەیە.

گۆزەگەری هونەرێکی پاراوە، هونەرێکــە کــە لــەکۆتی هــەرجۆرە لاسـایی کردنەوەیــەك ئازادە، پەیکەرسازی کە گۆزەگەری بەر لە گشت شتیٚ بــەوەوە پەیوەســتە، لــە ســەرەتادا مەبەستی لاسایی کردنەوەی هەیە، لەوانەشە بەهەمان ئەندازە کە ئەو جـۆرە مەبەسـتانەی هەیە کەمتر لە گۆزەگەری ویستی ئازادیی بە شکڵکردنی هەبووە، گۆزەگەری ئەبستراکترین جەوهەری هونەرە پلاستیکییەکانە.

## 23– هونەری ئەبستراکت

لەم ڕوانگەیــەوە ئەبــستراکت = ڕووتــەکاری نـابیٚ بــە شــتێکی خــەیاڵیی بـزانین، گـشت هونەرێك سەرەتاو دەسـتپێکردنی بــە ئەبـستراکتە، کەواتــە گــەر ئــەزموونی جوانناســی بــە پێکەوە نان و پێکداهاتن یا هۆنینەوە بەجۆرێك ڕێکبخەین ئایا جگە لــە وەڵامــی لەشــی و " ئەندامی " زەینی مرۆڤ شتێکی دی لەبەرامبەر هاوڕێژەی ئامادەو جیاوازدا هەیە؟

هونــەر بەدیهێنانــە لــە هیــۆلاوە " بــیٚ شــکڵ " هونــەر جوڵەیەکــە بــەهۆی ژمــارەوە ڕێکدەخرێت، قەبارەیەکە لە سنوری ئەندازەکان دا سنوردار دەکرێـت، هونـەر ماددەیــەکی بیٚ سەرئەنجامە کە ڕیتمی ژیان دەپشکنێت " بڕوانە پاراگرافی أ – 82 ".

## 24– هونەری سمرۆڤیزم = Humanism

لە بەرامبەر ئەم جۆرەی هونـەری — ئەبـستراکت دا دەتـوانین نمونەیـەك لـە کارەکـانی مرۆڤانی ترین قۆناغی هونەری ئەوروپا بەسەر بکەینەوە، وەك وێنـەی نیـولا = لەسـەرلا یـا پۆرترێتی کوڕێك کە بەرهەمی پەیکەرتاشی ئیتالی سەرەتای سەدەی شـانزەیەمە " وێنـەی 12 ".

جارێکیان ڕاسکین Raskin ڕوونی کردەوە " کە باشترین بەرهەمی قوتابخانە گەورەکان بەگشتی بریتین لە وێنە یا شکڵی ئادەمی یان کۆمەڵـە شـکڵێکی ئـادەمی" کەسـانی گـەلێك سادە کە هیچ شوێنەوارێکی گەورەیی لەوان دا بەدی ناکرێت... بە نیشان دانی پلەی بـاڵای توانای ڕیالیزمی — بەیان نیشان دراون. "

من وای تێبینی دەکەم کە ئەو بە تواناییە لە گشت جێگەیەکدا وەك وێنەکردنی پیاوێـك یا ئافرەتێك و گیانێك کە لە ناویاندا شـاراوەیە، بـەو وردەکارییـەی بـەدی هـاتووە لـە هـیچ جێگەیەکی تردا بەو جۆرە وردەکاری نەکراوە.

هونەری یۆنانی و هونەری مەسیحی لـە ڕاسـتی دا هـەردوو خـاوەنی شـکۆن، تـەنها وە تەنها لایەنی هیومانیزمیش ئەوەیە.

لە ڕوانگەی مێژووی وێنەکردنی مرۆڤەوە وەك ڕاسکین ئاگادارە تایبەت بە سـەردەمێکە کە بەسەردەمی هیومانیزم ناوی دەبەین... لەو قۆناغـەدا مـرۆڤ پێـودانگی گـشت شـتێکە، وەگـشت شـتێك لـە پێنـاوی یاریـدەدانی هۆشمەنـدی مـرۆڤ دا لـە چـالاکییەکانی ژیـان دا بەکاردەبرێت، هونەر مەدح و سەنای مرۆڤانەی مرۆڤە.

بێ گومان بناغەی پەسەندی گشتی ڕوخساری مرۆڤە و قۆناغە تایبەتییەکانی مێـژووش جگە لەو ڕاستییە چیی تر نییە.

ئەم ڕاستییەیە کە هونەرمەندان زۆرجار دزێوترین شکڵی مرۆڤ بۆ بەرهەمەکانیان بژاردە دەکەن.

تیۆری ئێمە جێگەی باوەڕ نییە، چونکە جیابوونەوەو دابڕانە لە ڕاستەقینە لـە پێنـاوی نیشاندانی وێنەیەکی مەیلدارداو هەوڵێکە بۆشکست هێنـانی خودویـستی =narcissism کـە هەمیـشە هونەرمەنـد وادار دەکـات ڕوخـساری مـرۆڤ بـە ڕوویـەکی واقعیـی = ڕاسـتی وێنـە بکێشیٚ.

بالأیی هونەری پلاسـتیکی = شـێوەکاری، لەگـەلٚ بـالأیی هونـەری چـیرۆك نووسـین دا کـەم و زۆر پێکـەوە هەڵدەسـەنگێنرێت... لـە وێنـە دیوارییـەکانی جیوتـودا لـە کەنیـسەی بارگلو=Bargello لە فلۆڕەنسە، وێنەیەکی دانتـی و زۆربـەی ناسـراوانی ئـەو کاتـە نیـشان دراوە کە پەیوەندە بە ساڵەکانی "1337"ەوە .

بوکاشیو =Boccaccio یەکەم چیرۆکی خۆی لە ساڵی "1339"دا نووسـی، وە کتێبـی —دیکامیرون = Decameron ی لە دوای نۆ ساڵ بە دوای یەکەمدا نووسی، هەمان شێوە کە لە سەرەتادا وێنەی مرۆڤ لـە وێنەکێـشانی پـۆرترێتی ڕوودار زۆر نـەبوو، لـە ڕۆمـای کـۆن و ئیتالیاش دا کەسێتییەکان ئەو شارەزایی یە تەواوەیان نەبوو، دیارە لـەو پێوانەیـەدا نابێـت لە ڕادەبـەدەر لابـدەین، ڕاسـتی ئەمەیـە کـە ئـەو سـەرنج و پاکییـەی دەروونناسـی تـاوەکو کۆتایی سەدەی پانزەهەم لە وێنەکاری شێوەی مرۆڤ دا بەدی هات.

لەجیهانی ڕۆمان نووسین دا تاوەکو ماوەیەکی زۆر، دەشیٚ تاوەکو سـەدەی هەڤدەیـەم بەدی نەهاتبێت.

بەلأم پەیوەندی گشتی بە کەسێتی مرۆڤەوە کە ڕووی هاوبەشی وێنەکێـشان و چـیرۆك نووسییە، گەشەی بەردەوام وخێرای هەبوو کە لـە سـەرەتای ڕێنیـسانس دا دەسـتی پـیٚ کـردوو ئێـستاش هـەر بەردەوامـە، دەتـوانین لـە نێـوان تـابلۆی — دێربیـدای = Derbeday بەرهەمی فرێت Frith و ڕۆمانی کاغەزی پیکویك دا = The Pickwick Papers کە بەرهـەمی دیکنزە ڕووی لێکچوون بەدی بکەین، لە هـەردوو بەرهەمەکـەدا وونبـونی بـەهای وێنـەیی و ڕوکردنـە کەسـێتی مـرۆڤ وجـۆرە هەسـتیارییەك بەرچـاو دەکـەوێت. لـە بەرامبـەر ئـەوەدا وێنەیەکی باش، بەمانا مرۆڤییەکەی — هیومانیزم — دەتوانرێت بـە ناونیـشانی وێنەیـەکی

ڕاستگۆ لە کەسێتی کەسێکی مرۆڤانەدا پێناس بکرێت... بابەتی سەر بە پەیوەندیی هونەرمەند دەرونزانییە " واتە کاتێك دەربارەی کەسێتی کەسێك کە ڕوخساری وێنە دەکێشین هیچ داوەرییەك بە ڕوویەکی ئاکاری دەرنابڕین، ئەگەر هونەرمەند بتوانێت کەسێتی ئەو مرۆڤە لە ڕووی یەکایەتی کەسەکەوە وەرو بخات و تەڕ دەستی و کارامەیی ئەو نیشاندەری زانست و تێگەیشتنی ئەو دەربارەی بەشی پلاستیکی تایبەت بە خودی هونەرمەند دەبێت، ئەمەش بۆ ئێمە بەسە... گومانی تێدا نییە خرۆشانێك کە بەبینینی کارێکی وەهاوە بەدی دێت، بەپێی پێویست لایەنی جوانناسی تێدا نییە، لەوێدا لەگەڵ چۆنێتییەکی جوانیی ئەبستراکتی دا ڕووبەڕوو نابینەوە... کاری ئێمە ناساندنی شتێکە کە دەتوانین ناوی ڕاستەقینەی زانستی لێ بنێین .

لەو بارەیەوە هونەرمەند دەرون ناسێکە کە سود لە ڕەنگ دەبینێ، وە گەلێك لە وێنەکێشانی مەزن لەو گروپەن... بەلأم زۆربەی وێنەکان دیسانەوە ڕاستەوخۆ بەبەرهەمی هونەری مەزن دەژمێردرێن، لەبەر ئەمە ناچارین لە خۆمان بپرسین چی لایەنێکی وێنەیەك ڕوویەکی دەرونزانی هەیە لە تابلۆکەدا کە بە بەرهەمێکی هونەری دەزانرێت!.. یا چی شتێك جیاوازی دەکرێت" لە وەلأمدا دەتوانین بلێین : — نەهێشتنی بەهای جوانناسی " مانای پەیوەندی وێنەیی و قەبارە و ڕەنگ کە بینای گشت بەرهەمێکی هونەری پێکدەهێنن. بەم مانایە وێنەیەك کاتی دەرکەوتنی دەکرێ وەکوتابلۆیەکی سروشتی بێ گیان پە سەند بکرێت" بەهەمان شێوە ئێمە هیچ گریمانەیەکمان نییە لە نێوان تابلۆی سواری خەندان = Laughing caalier بەرهەمی هاڵس Hals جیاوازیی چرچ و لۆچی جوانی بەرگی بەری بکەین، بەلأم ئێمە لە ڕاستی دا بەم جیاوازییە ڕازین، ئەم جیاوازییەش پەیوەندی نییە بەو لایە نە دەرونزانییە وە کە پێشتر ڕونمان کردەوە.

شێوەی ئەو جیاوازییە دەکرێ بە لایەنی فەلسەفی بابەتەکە ناو بەرین، لە چاکترین شێوەدا هونەرمەند یان پەیکەرساز، لە سنوری کەسێتی تاکەکەسیی مۆدێلەکە بالأتر دەچێت و دەگات بە زنجیرەیەك مانای گشتی تر. باشتر وایە مەبەستم لەگەڵ نمونەیەکی

وێژەیی دیکە ڕوون بکەمەوە، ئەنـدامانی شـانۆیی یـەکانی شکسپیر بەگـشت ڕاسـتەقینەی خۆیان بەرامبەر بە ژیان وەفا دار نین، تەنها کەسانێکی تایبەت نین، بەڵکو لەهـەمان کاتـدا نمونەیەکن لە هەوەس و ئـارەزووی مرۆڤانـە بەڕوویـەکی گـشتی... ئێمـە لـە پاڵەوانـەکانی شـانۆگەرییەکانی شکسپیردا تـەنها هەسـتی زینـدوبونیان ڕەچـاو ناکـەین، بـەڵکو جـۆرە هەستێکی باڵایی و بەرزیش ڕەچاو دەکەین کە ڕازەری خەیاڵ ئامێزی ئێمەیـە لـە بەرامبـەر ئەو زیندوو بوونەدا.

## 25– ڕۆڵی دەرونزانی

کەواتە دەتوانین بەو ئەنجامـە بگـەین کـە زیـاتر لـەو بـەها شـکڵییە پەتییـە لـە شـکڵی گۆزەیەکـدا بـەدیی دەکـەین" دەشـێت بەهایـەکی دەرونـزانیش هـەبێت، بەهایـەك کـە لـە هەستی هاودەردی و پەیوەندی هاوبەشی ئێمە بەرامبەر مرۆڤەکانی تـر سـەرهەڵدەدات" یـا بەهایەك کە لە نە ستمانەوە = اللاشعور – سەرچاوە وەردەگرن .

زیاتر لەمانە بـەهای فەلـسەفییە کـە لـەفراوانی و قـوڵی توانـای هونەرمەنـدەوە دیـاری دەدات . بە لاَم ئەم وشانە لەوانەیە تا ڕا دەیەك ئاڵۆزبن، یان بەلای کەمەوە وشەی داهێنەر یا بەهرەدار هێندە ئاشکراو ڕوون نییە، گەر بمانـەوێت ئـەم مانایـە بـەدەربڕینێکی سـادەتر بەیان بکەین، ئەوا دەتوانین بڵێین : ئەگەر کـۆی مەرجـەکان یەکسان بـن – واتـە توانـای هونەری و دارایی و ڕوانگەی دەرونزانی – ئەوا ئەو هونەرمەندە لـە گـشت کەسـێ گـەورەتر دەبوو کە بیر و هۆشی لە گشت بەر بلاَوتربێت– واتە مرۆڤێك بێت کە نەك تـەنها شـتەکانی بەردەمی خۆی ببینێت و هەست پێبکات، بـەڵکو شـتەکان لـە چـییەتی و مانـای گـشتی دا دووبارە بناسێت – بە واتایەکی تر یەکبون لە گشت دا و گشت لە یەکبون دا لە یەکەیەکـدا دیاری بکات و بیناسێت... بەلاَم ئەم خاڵەش دەبێ بەیان بکەین و دانـی پیـادا بنـێین کـە هونەرە بەرجەستەیی یەکان هونەری دیدەیین – هونەرێکن کە بە ڕێگەی چـاوی مـرۆڤ کـار دەکەن جۆرە هەسـتیارییەك بـەیان دەکـەن و ڕایدەگەیـەنن ، ئەگـەر ئایدیایـەك هـەبێت و

بمانەوێت وەروی بخەین باشترین هـۆ بـەیان کردنـی زمانـە... هونەرمەنـدی وێنـەکێش یـا پەیکەرساز بەهۆی زمان بەستراوییەوە سەری پەیوەنـدی لەگـەڵ ئایـدیادا کەمـە ....کـاری هونەرمەند کێشانە و جیاکردنـەوە و پـۆلکردنی ئـەو جـۆرە ئایدیایانـە نییـە، بـەڵکو کـاری گواستنەوە و گەیاندنی ئەوڕازەرە سۆزییە یـە یـا هەسـتییە یـە کـە دەرهـەق بـە بیرەکـان هەیەتی.

## 26– ڕەگەزەکانی بەرهەمی هونەری

ئێستا دەچینە سەر بینای ڕاستی بەرهەمێکی هونەری و وردتر ڕونیان دەکەینـەوە، بـۆ ئەم مەبەستە تابلۆیەکی هونەری هەڵدەبژێرین، ئەگەر شێوەی سادە بخەینـە لاوە خوێنـەر دوچاری کۆسپ و چەڵەمە دێت"بەڵام دەبێت لە یادمان بێت کە وێنەکێشان تـەنها ڕوویەکـە لە هونەرە بینراوەکان ، پایە بەرزیشی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ڕێنیسانس، لەبەر ئـەوە زۆر دێرین نییە نیشانەیەك بوونی هەبێت کە لە ئاینـدەدا هونـەر بـۆ ڕازاندنـەوەی نـاو ژور و تـابلۆ هەڵواسـین بـەدیوار بـێ مەبەسـت دەبێـت، لەبـەر ئـەوەی گرنگـی ڕێـژەیی هونـەری وێنەکێشان لەمڕۆدا دوچاری مەترسی هاتووە.

دەبێت لە تواناماندا بێت کە مەسەلەی شێواز و زانستی کۆمپۆزیـشن = Composition = دارشـتن و پێکهێنـان، وە گـشت بابـەتێکی دی کـە بینـای بەرهـەمی هونـەری وەك ئارکیتێکـچەر = Arcitectur = بیناکـاری — پەیکـەر سـازی و تـاوەکو گۆزەگـەری و ڕەنـگ کاریش" یان گشت تەرزی هونەرەکان کە بە زاراوەی لقییەوە پەیوەستن شی بکەینەوە.

جیـاوازی نێـوان هونـەرە جوانـەکان و هونـەرە بـەکارهێنراوەکان جیاوازییـەکی پـڕ لـە مەترسییە" لە سەرەتاوە تاوەکو ئێستا دەربارەی چییەتی (جوانی) وتومانە ئاشـکرایە کـە لە ڕەچەڵەکدا بەرهەمێکی هونەری بە چاوپۆش کردن لە مەسەلەی غەریزە یا ڕەچـەڵەك یـا ئەندازە یا بەهای ماددی کە بەرهەمی هونەرییان پێ بە دی دێت" ئەو چۆنێتییە سروشتییە بۆ هەستی لەمس کردنی شتەکان وەك عاج جیاکردنەوە لـە ئێـسقان، ئاوریـشم لـە لۆکـە و

بەرد لە گەچ پێویستن، بەڵام بەرهەمی هونەری بەهەمان شێوە و کار سود لە چۆنێتی ماددەیەك دەبینێت کە بەرهەمی ئەوی لێ بەدی دێت و لە سنوری ناتوانایی ئەو ماددەیەش لادەدات.

دابەش کردن و شیکردنەوەی کاری هونەری ڕێگەی هەمەجۆری هەیە " دەتوانین ڕەگەزە ماددیەکانی تابلۆیەك لە پێش چاو بگرین و بەو جیاوازییەی لە پەیوەندی نێوانیاندا بەدی هاتوە بتۆژینەوە... ئەو ڕەگەزانەش لەوانەیە پێنج خاڵ بن := کێش = ڕیتم، هێڵ، تەنینەوەی وێنە لە بۆشاییدا، سێبەر و ڕوناکی ، ڕەنگ... وە ڕێکخستنیان لە زۆربەی دەسکەوتەوە بە هەمان ئەندازەیە — نەك لە ڕوانگەی بەهای موتڵەقی ئەم ڕەگەزانەوە " بەڵکو تەنها لە ڕوانگەی ئەو قۆناغە لەرزۆکانەوەکە لە زەینی هونەرمەندا ڕەنگ دەدەنەوە،هەر شکڵێك یا وێنەیەك بە یاریدەی هێڵەوە سنورداردەکرێت، هێڵ لە پێناوی ئەوەدا کە بێ گیان نەبێت، دەبێت کێشێکی تایبەتی خۆی هەبێت، تەنینەوەی شکڵ و بۆشایی و سێبەر و ڕووناکی دەبێت لە پەیوەندی نزیکیانەوە بۆ یەکدی بخرێنە بەر چاو، گشت ئەمانە لایەنەکانی جیاوازی درکاندنی هونەرمەندە لە بۆشایی دا، قەبارەش هەمان بۆشایی یە کە پڕدەبێتەوە... سێبەر و ڕوناکیش والأکەری قەبارەن و لە پەیوەندیدان لەگەڵ بۆشایی دا، بۆشاییش جگە لە وێنەی قەبارە شتێکی تر نییە... ئەم خاڵە بە تایبەتی لە هونەری بیناکاریدا ئاشکرایە، بۆ نمونە کەنیسەیەك دەبێت بەناوی فلأنە ژمارەی دیوار کە بۆشاییەك دەوری تەنیوە لە پێش چاو بگرین، یاخود ناوی فلأن ژمارەی ڕوو کە قەبارەیەك سنوردار دەکات بەم ناوە دیاری دەدات کە پێویستە لە دەرەوەی شوێنی بینین دا دابنرێت.پەرستگای یۆنانی نمونەیەکی ئاشکرایە لەو جۆرە، بینای یۆنانی هەمیشە هەوڵی داوەکە لانەدات و بینای لە ڕوانگەی مرۆڤدا شتێکی نێوان بۆش و بێ سەرنج نیشان نەدات.

بیناکاری گوتیك هەمیشە هەوڵی داوە کە هەستی بۆشایی و نامادی نیشانی بینەر بدات، هەر دوو هونەری بۆشایی و قەبارە و سێبەر و ڕوناکییان لە پەیوەندییان دا بە

یەکترییەوە تۆژیوەتەوە...دەربارەی هەمەیی پەیکەرەکان یا هەندەکیی دیمەنێکی دوور لەسەر تابلۆیەکی هونەری نمونەی هەمان تێبینی دەردەبڕێت.

## 26 – یەکەم – هێڵ

ئەگەر گشت ڕەنگدانەوەکانی مێژووی پلاستیکی لە پێش چاو بگرین، دەبینین لەنێوانیان دا یەك یان چەند ڕوویەکی هاوبەش بەدی دەکرێت. دیارە ئەگەر هونەری پلاستیکی هەمان چەشن بەناوی هەر شتێکەوە کە تەماشا کردنی چێژ بەخش بێت پێناسە بکەین، ئەوا هەوڵمان کەم دەبێتەوە بۆ هاوبەشی کردنی نێوان ڕەنگی گوڵ و بینای پارتنۆن Parthenon .... کە لە زنجیرەی دەماری فیزیۆلۆژیمان دا هەیە.

بەڵام هونەر بە مانای وشە لە سەرنج دانەوە دەست پێدەکات = واتە بەشوێن گۆڕکێ لە ئاڵۆزییەوە بەرەو هێڵی دیاری کراو .

لە ڕاستیدا دەبینین لە ڕوانگەی مێژوویی یەوە دەستپێکردنی تەرزی هونەری = واتە هونەری مرۆڤی سەرەتایی و ئەشکەوت نشین – بەهێڵ دەستپێدەکات هونەر مەیلی نیشان دانە بە یاریدەی هێڵ و بەو شێوەیە دەستپێکردووە.

هەنوکەش سەبارەت بە منداڵان هەمان مەیلدارێتی یەکێکە لە بنچینەیی ترین ڕەگەزی هونەرە دیدەیی یەکان –تا لە پەیکەر سازیش دا تەنها قەبارە ڕۆڵ نابینێت، چونکە قەبارەش بەیاریدەی هێڵ سنوردار دەکرێت، ئەم چۆنێتییە بەڕادەیەکی بنچینەیی بە ڕەگەزی سەرەکی گشت هونەرەکان دادەنرێت.

ولیام بلیك = William Blake ئەم باوەڕەی بەڕوویەکی بەربلاوترو چڕتر بەیان کردووە... منیش ئەو وتەیەی بەڕوویەکی تەواوتر لە پەراگرافی " 66 " دا دەگوێزمەوە.

بلیك دەڵێت :– ( بنەمای مەزن و زێڕینی هونەرو ژیان ئەوەیە کە هەرچەند هێڵی مەرزی دیاری ترو ڕوناکترو پتەوتر بێت" بەرهەمی هونەریش کامڵ تر دەبێت، وە

هەرچەندە ئەم هێڵە کەمتر ڕوناکترو جیاکراوەتر بێت، نیشانەی خەیاڵی لاوازو ناتوانایی هونەری و ناشێتی زیاتر دەبێت.

هەروەها بلیك دەڵێت :— " کەسێکی وێنەکێش بەشانازییەوە پێی وتم :— کاتێ بە وێنەکێشان گەیشتم، هێڵکاریم بەتەواوی خستە لاوە و فەرامۆشم کرد. "

ئەو جۆرە کەسانە دەبێت بزانن کە من بە ڕوانگەیەکی کینەدارانەو کەم تێیان دەڕوانم. ئەمەش یەکێکە لە سەرەتایەکی داواکراو کە پێویستە دەربارەی " هێڵ " بیزانین — هێڵ لە گۆڕانیدا لە هێڵکارییەوە بۆ وێنەکێشان بوونی خۆی لەدەست نادات. هێڵ ڕوویەکە لە ڕووەکانی وێنەکێشان — ئەگەر لە " بلیك " مان بپرسییایە ئەوا دەیگوت هێڵ بریتییە لە یەکەی ڕوو یان شێوە.

بەلام ئاگاداربە سەرەتا بۆ نیشان دانی شتێك یان شکلێك، هێڵ سەرەتای سنوری دەرەکیی شتەکەیەو دەبێ بزانین، لە دەستی کارامەدا هێڵ دەتوانێ هەم جوڵەو هەم قەبارە نیشان بدات... مەبەست لە نیشاندانی جوڵە تەنها ئەوە نییە کە هێڵ شتێك لەحاڵەتی جوڵەدا نیشان بدات (واتە ڕێبازکردنی هێڵ بە هەڵبژاردەی چاو ) بەڵکو مەبەست لەمەیە کە هێڵ دەتوانێت لە دەستی مامۆستادا جوڵەیەکی جوانناسی تایبەت بەخۆی بەدەست بهێنێت — بەهۆی سەمایەکەوە کە ئازادە لە مەبەستی نیشان دانی شتی دەرەکی، لەسەر ڕووی کاغەز ئەنجامی دەدات... بۆ نیشاندانی نمونەیەك لەو جۆرە جوڵانە کۆمەڵێ لە هونەرمەندانی ڕۆژئاوایی یاددەکەینەوە، لەوانە = بۆتچیللی : Botticelli و بلیك.

بەلام لەبەرهەمی هونەرمەندانی ڕۆژئاوایی دا ئەم چۆنێتی یە باشتر لەهەر جێگەیەکی دی بەدی دەکرێت... لە وێنەکاری و هێڵکاری و هەڵکۆڵین — ی چینی و ژاپۆنی دا ئەو چۆنێتییە بەدی دەکرێت، لە جێگەیەکدا کە پێویست بێت ئەو چۆنێتییە بەکاربرێت ئەوا ڕیتم بەدی بەدی دێت، ئەمەش چۆنێتی ئەم هێڵەیە کە هەستی ڕیتم لە مرۆڤدا بەدی دەهێنێت. شتێکە لەوانەیە درکاندنی لە ڕونکردنەوەی ئاسانتر بێت... ئەو هەست کردن بە ڕیتمە = کێشە بە پێوەندی مۆسیقی و فیزیکی دەتوانرێت بدرکێنرێت، بەلام ئەگەر

بمانەوێت ئەوە روون بکەینەوە، دەبێ بە تیۆرێکی وەك تیـۆری ئیمپـاتی رووبەرووبینـەوە. هەستی ئەندامی پێویستە لەگەڵ هێڵدا پێچەوانە بێـت، چـونکە ئاشـکرایە کـە خـودی هێـڵ لەراستی دا نە سەما دەکات و نە دەبزوێت... بەڵکو ئێمە خۆمـانین کـە خودمـان لـەڕەوتی بابەتەکانی هێڵ دا لە حاڵەتی سەمادا بەدی دەکەین.

دژوارترین چۆنێتی هێڵ و توانای ئەمەیە بۆ نیشاندانی قەبارە یـا شـکڵی بەرجەسـتە — لەو چۆنێتییەدا هێڵ بە تەنها لە دەستی مامۆسـتای کارامـەدا بـەدی دێـت و ڕەنگدانـەوەی بەشێوەی لول پێچ و ناسك و هەمەجۆر لە هێڵـی بـەردەوام و پـچڕاودا دەکەوێتـە ڕوو، بـەو مانایەی کە هێڵ لەجەوهەری شتەکان دا حاڵەتێکی دەماری و هەسـتیار بـەدی دەهێنێـت و چالاكو غەریزی دەبێت.

هەروەها لە خاڵێکدا پێویـستە دەسـت پێبکـاو بـەردەوامی بـەخۆی بـدات و دیـسانەوە تێکەڵی هێڵکارییەکە دەبێتەوەو حاڵەتی لەیەکتر نزیك بەیان دەکات... لـەو حاڵەتـەدا هێـڵ بەتایبەتی هەڵبژاردەیی یە... واتە وێنەی شتێ ناکێشێ بەڵکو زیاتر نیشانی ئێمەی دەدات.

لەراستی دا هێڵ زمانێکی گشتی و ئەبستراکتی یە بۆ نیشان دانـی بابـەت، کورتەیـەکی شکڵییە سەرسوڕێنە، نیـشانی دەدات هێـڵ تـاچ ڕادەیـەك دەتوانێـت ئەبـستراکتی بێـت... بەبێ ئەوەی دابڕن بوون و دوپاتکردنەوەی ژێر پێ بخرێت... بۆ نمونە تێبینی دەکەین کـە لق و چڵی درەختەکان بـەچ شـێوەیەکی هەمـەجۆر وێنـە دەکێـشرێت، ئـەو خاڵـە نیـشانی دەدات کە جێ گرتن لە ئەزموونی جوانناسیمان دا لایەنێکە چەند گرنگی هەیە.

لەوانەیە بلیك حەقی بێت، بەچاوی نەفرەت و کینە سەرنج لە هونەرمەندێ بدات کـە لـە هێڵکاریی پاك بێ ئاگایە.

وێنەکێشان و هیڵکاری پەیوەندییان بە غەریزەیەکی لێکچووەوە هەیـە و هونەرمەنـدانی گـەورەی ڕێنیـسانس لـە مازاتـچیۆوە **Masaccio=** بگـرە تـا تیپولـو **= Tipolo** گـشتیان وێنەکێشی تەڕ دەست و لێهاتوو بوون.

هونەرمەندێکی نوێی وەکو پیکاسۆ کە خێرایی گۆڕان و دژێتی ڕوکەشی شێوازەکانی زۆر سەرسوڕێنن، لەهیچ جێگەیەکدا وێنەکانی مامۆستایەتی نیشان نادات، داڕشتنەکانی پیکاسۆ بەلای کەمەوە هەوڵی نیشان دانی بۆشایی یەکی فراوانی سێ دووری نیشان دەدەن، بەهەر لایەکدا کە سەرنج دەدەین، چ لە ڕۆژئاواو چ لە ڕۆژهەلاتدا، چ لەڕابردووی دێرین و حاڵی حازریش دا هەمان نیشانەی بە توانایی ڕەچاو دەکرێت.

ئەو چۆنێتییەش لە هونەری عەینی دا = دیدەیی دا بەڕادەیەکی گشتییە کە مرۆڤ بە ئاسانی دەشێت بەهەمان ڕێگە بگات کە بلیك پێی گەیشت و توانیی بڵێت ئەو چۆنێتییە یەکانە، چۆنێتی بنچینەیی هونەری وێنەکێشانە.

بەلاّم ئەو چۆنێتییە کە لەوێدا بە — تۆن — دەربڕاوە دیسانەوە هەمان ئەندازەی گشتیی هەیە و لەوانەیە بەناوی ڕوویەکی یا ئاستێکی بەیانکردن لەگەڵ چۆنێتی هێڵ لە یەك کێشانەدا دابنرێت.

## 26– دووەم — تۆن

ڕاسکین لە کتێبی هونەرمەندانی هاوچەرخ دا هەوڵی داوە مەبەستی تۆن لە وێنەکێشاندا پێناس بکات :—

" من بە دوو شێوە لە وشەی تۆن دەڕوانم، یەکەم" بەرجەستەکردن و پەیوەندی بە هێزی شتەکان لە بەرامبەری یەکتردا و سەبارەت بە یەکتری لە ڕووی ئەندامییەوە" واتە توانای تێرییان بە ڕێکخستنی دووری و نزیکی تەنەکان و پەیوەندی تەواویان بە سێبەری هەمان ئەو تەنانەوە لە بناغەی تاریکی و ڕوناکیی تابلۆدا.

دووەم" ڕێژەی ڕەنگ و دەوروبەری سێبەر بە ڕەنگی ڕوناك بە جۆرێك کە بتوانرێت لەهەمان کاتدا بە پلەی جیاوازی ڕوناکی هەستیان پێ بکەین . " ئەم پێناسەی ڕاسکین زۆر ڕۆشن نییە، لەوانەیە مەسەلەی تۆن بە ناونیشانی پێشکەوتنێکی پیشەسازی = Technical چاتر بتوانرێت جێگەی توێژینەوەمان بێت، کەواتە لە مەسەلەی نیشاندانی

قەبارەی سێ دووری بە یاریدەی هێڵەوە مەسەلەی نواندنی قـەبارە، بـە یاریـدەی سـێبەرو ڕوناکییەوە بەدی دێت.

هێڵ شـتێکی ئەبـستراکتییە و بـە دیاریـدانی شـتەکانەوە پەیوەنـد نییـە، بـەڵکو تـەنها سنورو شێوەی دەرەکی شتەکان نیشان دەدات.

هێڵ دەتوانێت سێبەرو ڕوناکیی شتێك نیشان بدات " لە ئاشکراترین شێوەدا لە ڕێگەی گۆڕانی توانای هێڵەوە " بەڵام کاری بنچینەیی هێڵ ئەوەیە کـە دەتوانێـت ڕاسـتی دیـدەیی بێ گیان " جماد " نیشان بدات.

ڕوناکی تیشکێکی پەرش بووە، دیاردەیەکـە لـە گۆڕاندایـەو هەمیـشە پلـەی بـەهێزی و گۆشەی پێکانی لە گۆڕاندایە... لەبەرئەوە شتێکی وەها بەهۆی ئـانی وەك هێـڵ ناتوانرێـت بە تەواوی وەرووبخرێت... لە ئەنجامدا پلەی سێبەرو ڕوناکی بەدی دێـت — مانـای ڕوونـاکی بە پلەی جیاوازی تۆنی نێوان سپی و ڕەش نیشان دەدەین، تا ڕەنگیش بـەکار دەهێـنین، ڕووناکی بە ڕوویەکی ڕاستی تەنها بەم هۆیە دەشـێ وەرووبخرێـت کـە ڕەنگـی ڕۆشـنی پـاك بەڕێژەی ڕەنگی ڕەش دەتوانین تێر یا تۆخی بکەینەوە و بەهـەمان جـۆر سـێبەری هـەمان ڕەنگ چنگ بخەین.

تابلۆکانی ماتیس نیشانی دەدەن کە بە ڕێگەی یارییـەکی هەسـتیار بـۆ دانـانی ڕەنگـە پاراوو ناتێرەکان دەکرێت سێبەری ڕۆشن بە ڕوویەکی وێنەیی = Schematic نیشان بدات.

ئەم پلانەی سێبەرو ڕوناکی دەکرێت بۆ نیشان دانی سێ چۆنێتی بەکاربهێنرێت :

1- لادان لە ڕوناکییەوە بۆ تاریکی = سێبەر لە سنوری ڕەنگێك یا قەبارەیەکدا.

2- لە تابلۆدا یەك ڕەنگ بۆ نیشان دانی هێزی ڕێژەیی ڕەنگە جیاوازەکان لە ڕەنگـی دوانە = واتە نێرەموك...

3- پلەی ڕوناکی یـا تێـری سـەر بـە سەرچـاوەی ڕۆشـنایی تیـشك — ڕێژەیەکـە کـە باڵادەستە بەسەر کۆی تابلۆدا.

بەر لەوەی کە توانـای بـەهای " تـۆن " لـە وێنـەکاری ئـەوروپی دا بەسـەر بکەینـەوە" چـاترە بـزانین کـە مەسـەلەی – تـۆن – یـش هـەروەکو هێـڵ لـەژێر ڕۆشـنایی بـەهای ئەبستراکتی" کێش و وێنەدا بەدی دێ لە هونەری وێنەکێشانی ڕۆژهـەڵاتی دا... پرۆفیـسۆر پۆپ لە کتێبەکەیدا بەناوی " لایەنەکانی بەیان کردنی وێنـەکێش " ئـەم بابەتـەی بەچـاکی ڕوون کردۆتەوە : " ... لە وێنەکێشانی چینی و وێنەکاریی کۆی ئاسیادا، ڕوخسار یا شـکڵ بە یاریدەی هێڵ بەیان دەکرێت... تەنها بە هێڵ کە ڕێژەی زۆر لە وێنـە و تەنانـەت وێنـەی هەڵتۆقیویش نیشان دەدرێ... بەڵام – تۆن – ناوچـەکانی هـەر شـتێك بەیاریـدەی ڕەنـگ نیـشان دەدات کـە لەسـنوری تایبـەتی شـتەکەدا لـە تـابلۆدا وەڕو دەکـەوێت. – تـۆن – ئاسایی لەهەر جێگەیەکدا پەرشە، بەڵام پلەی ڕەنگ دەشێت گۆڕانکاری تیادا هەبێت، وەك چۆن دەربارەی گەڵای گوڵ یا باڵی مریـشك خـودی تـۆن هـەمان پلـەی جیـاوازی هەیـە... لەسەر ئەمە بۆ دیاری سنور و هەروەها بۆ یاریدەدانی وەڕوخـستنی ڕوخـسار بـە یاریـدەی هێـڵ ، هونەرمەنـد دەتوانێـت پلـەی جیـاوازی تـۆنی ڕەنـگ بـە ئـارەزوی خـۆی بـەکار بەرێت."تابلۆی ژاپۆنی ( لەوێنەی 10 ) دا نمونەیەکی سـادەیە لـەجۆری بـەکاربردنی ئـەو ڕووەی – تۆن – ە ناوچەیی یە.

کاتێك هونەرمەندانی سـەرەتای ڕێنیـسانس کـەم کـەم ئـەنجامی توێژینـەوەی سـێبەرو ڕوناکیان دەکۆڵییەوە" لە کاتی نیشاندانی بۆشایی دا ڕووبەڕووی چەند کۆسپێك بوونـەوە و تێگەیشتن کە ڕوناکی تەنها بە ڕێگەی ئەبـستراکتییەوە – بـە شـێوەیەکی جیـاواز بـۆ هـەر یەکە لە شتەکان ناکرێت نیشان بدرێت... ئەنجام ئەمە بوو کە ڕوناکی لـەتابلۆدا بەهایـەکی یەکلای پەیداکرد و تابلۆش بە شێوەی وێنەیەکی نیوە بەرجەستەیی بەدی دێت کە تیایـدا گشت شتەکان بە یەکسانی بەسێبەر و ڕوناکی کێشراون... تـابلۆی مانتینـا = Mantegna یـان ئەنـدری دی کاسـتانۆ Andrea del Castanagno ئـەم چـۆنێتییە بـە جـوانی نیـشان دەدەن.

گومانی تیادا نییە کە مەکتەبی ئیتالی پەی بە ئاتاجی ڕۆشنایی لـە بۆشـاییدا بـردووە و دەزانێ کە ڕۆشنایی چی ئەنجامێك بە ڕوانگە دەگەیەنێ کاتێ کە ڕوناکییەکـەی بـە گـشت لایەکدا پەخشانە... تەنانەت کە لیوناردۆ زانستی ڕۆشنایی دەتۆژییەوە دانی بەوەدا نـا کـە : " هەرچەندە شـتەکان لەبـەر چـاودا والآ دیـارن ، بـەلأم کـاتێ لێیـان دوور دەکەوینـەوە دەبینین لە پەیوەندیەکی بەردەوامدان لەگەڵ یەکتری دا ، بەم پێیە من بنـەمای — نێـوانی = فاصل — خـۆم لەسـەر بنـەمای نێوانـەی ئیـل = Ell دابـین دەکـەم، وەك چـۆن ئاهـەنگ سازان پارچە مۆسیقایەك بە " هەمەیەك = کل واحد " بەدی دەهێنن... هەمان شـێوە لە تابلۆکانمدا ڕێباز دەکەم ."

( " نامەیەك دەربارەی وێنەکێشان " . ) ئەو بیرەی کە بە ناوی " پەنجەرەی کـراوە" وە ناسراوە. واتە بەدی هێنانی خەیاڵیی یەك بۆشایی سێ دووری، سەرئەنجام بە یاریـدەی شێوازێکەوە بـەدی هـات، کـە بـە دەسـتی برایـانی ڤـان ئایـك = Van Eyck لـە فلانـدەر دەستی پێ کرد و لە دەستی وێنەکێشی وەك ڤرمیر Vermeer بە کەماڵ گەیشت... بـەلأم ئەم ئایدیایە خاوەنی سنورداریێتی بوو کاتێ کە بەکاریان برد، چونکە ئەم ئایدیایە ئایـدیای تەڕ دەستیو گەیشتن بوو بە ئامانجی زانستی و سست کردنـی هەسـتەکان و لـە دەسـت دانـی بـەهای جـوان ناسـی... لەکۆتاییـدا لـەم نێوانـەدا قۆنـاغێکی تربـوونی هەیـە کـە هونەرمەنـدانی وەك : تیـسین Titan " تیتـان " ، تینتۆریتـۆ= Tintoreito، کورجـو= Correggio لە ئیتالیا و ڕامبراندت لە باکور نمایندەی ئەو ئایدیایەن" لەم قۆناغەدا وێنـەکێش دەسەلأتی بەسەر تاریکی و ڕوناکی دا هەیە و ڕاستەوخۆ بـەکاریان دەبـات بـۆ کارتێکـەری درامی وجوانناسی... واتە لەم قۆناغەدا نەخشی تابلۆ بریتییە لە نەخشی تاریکی و ڕونـاکی کە هەریەکەیان لە پێناوی بەدی هێنانی کۆنتراست بە پێی ویست و ئاگایی لە تـابلۆدا بـلاّو دەبنەوە... کە دەشێت هـەمان نـەخش لـە پێکهـاتی بینـای دارشـتنی تـابلۆدا بـە زاراوەی مۆسیقارێك وەك نەوایەکی یا ئاوازێکی جیاواز بەدی دێت. تابلۆی — سامەری پیـاو چـاك —

بەرهەمی ڕامبراندت ( وێنەی 15) سەلمێنەری ئەم نمونەیەمانـە کـە داڕشـتنی بینـایی ئـەو تابلۆیە یەکسەرە بە یاریدەی کێش و هاوڕێژەی سێبەر و ڕووناکی بەهێز داڕێژراوە.

## 26– سیٚ یەم = ڕەنگ

ئێستا دێینـە سـەر بەشـی ڕەنـگ کـە لـە تـابلۆدا گرنگییـەکی مـەزنی هەیـە... ڕەنـگ ڕەگەزێکی ترە لە بەرهەم دا کە بە تەواوی تابلۆکە دەگەیەنێت. هێڵ فێری جیاوازی و ڕیتم —ی کردین، لەوانەیە قەبارەش یان وێنەی بەرجەستەبووش — مان نیشان بدات کە تۆن بـە یاریدەی خۆی ئەو بە تەواوی دەگەیەنێت. ئێستاکە ڕەنـگ سـەرباری بابەتەکـە دەبێـت... سادەترین ڕونکردنـەوەی کـاری ڕەنـگ ئەمەیـە کـە بڵـێین لێکـچوونی وێنـەکاری بـە شـتی وێنەکراو ڕوندەکاتەوەو ئەم جۆرە بەکار بردنەی ڕەنگـیش دەتـوانین بـە — سروشـت — ی ناوبەرین ( واتە ڕەنگ ڕەنگدانەوەی دیمەنە سروشتییەکانە لە ڕوانگەی هونەردا بـە ڕەنـگ = ئەمەیـە کـاری ڕەنـگ. ) بـەلاّم چـەندین جـۆری تـر لـە بـەکاربردنی ڕەنـگ بـوونی هەیـە...ڕاسـتی ئەمەیـە کـە جگـە لـە وێنـەکانی کۆنـستابل = Constable و بەرهـەمی هونەرمەندانی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەم، کە بەوێنەی ڕەنگاوڕەنگ کاریان کردووە — شێوەی بە کاربردنی سروشتی ڕەنگ لـە مێـژووی وێنەکێـشان دا گـەلێك بـە دەگمەنـە، هەرچەندە ئەزمونەکانی تێرنەر = Turner ئیمپریسیونیستەکان لە دواییـدا نیـشانیان دا کـە دیاری کردنی بە کاربردنی سروشتی ڕەنگ گەلێك دژوارە ، کاتێك کە ڕەنگێکـی ڕاسـتی لـە سروشتدا بەدی دەکەین، دەشیٚ ناڕەزایی نیشان بدەین دەرهەق ناڕاستی بوونیان.

سەرەڕای بەکاربردنی سروشتی ڕەنگ، سیٚ جۆری تری بەکاربردنی ڕەنگ بوونی هەیـە کە من بەناونیشانی ڕەنگی ئیشارەتی و هاوتا و ڕەنگی تەواو یا پاراو ناویان دەبەم.

بـەکاربردنی ئیـشارەتی لەوانەیـە سـەرەتایی تـرین جـۆری بـەکاربردنی ڕەنـگ بێـت... تەنانەت وێنەکێشان لەسەر بەرد لەسەردەمی بەردین دا ناشێت بـە بـەکاربردنی سروشـتی ڕەنگ ناوببرێت، لەم جۆرە بەکاربردنەدا ڕەنگ لە پێناوی مانای سیمبوڵیکی دا = هێمـایی

دا بەکار دەبرێت... بۆ نمونە ئەگەر منداڵێك ئازاد بێت لە هەڵبژاردنی ڕەنگدا، ئەوا هەمیشە درەخت سەوز ڕەنگ دەکات بۆرکان سور و ئاسمان شین و ئاویش هەمان شێوە شین ڕەنگ دەکات، ئەگەر لە کاتێکدا درەختەکە قاوەیی ڕەنگ بێت و بورکان ڕەش، بێ گومان دەشێ ئاسمان لای منداڵەکە خۆڵەمێشی ڕەنگ بێت.

لە هونەری سەدەی ناوەڕاست دا سەرەڕای توێژینەوەی سروشت کە ڕەنگ کارییەکی منداڵانەیان پەیرەو کرد... ڕەنگەکان سەر بە بنەما و دەستوری سەپێنراو و نەگۆڕ بوون... ئەو دەستورەش نەك تەنها هونەرمەندان بەڵکو نەریتی بلاو و دەسەلاتی کەنیسە دەستنیشانیان دەکرد و بڕیاریان لەسەردەدا. وێنەی مریەمی کچ دەبوو هەمیشە شین بێت، ئەملاو لایشی دەبووهەمیشە سور بێت" بەو شێوەیە، چونکە ئەو ڕەگەزانە نەگۆڕ بوون ڕەنگی گشت بەشەکانی تابلۆ دەبووبەم ڕەگەزانە ڕەنگیان بەدی بهێنرێت ، بەلام ئەم زۆر لێکردنە بە خەوش لە قەڵەم نادرێت ، ئەم خاڵە بەلگەی ڕونکردنەوەی جوانی و هاوگونجاندن و هاوڕێژەی دیاری کردنی ڕەنگی وێنەکێشانی سەدەی ناوەڕاستە. ڕەنگ کاریی ئیشارەتی تاوەکو سەدەی پانزەیەم بەردەوام بوو تا ئەو کاتەی چمکی عەقلانی تر و زانستی تر لە بواری ڕەنگدا کۆتایی بە سەدەی ناوەڕاست هێنا.

بەلام پێش گەیشتن بە بەکاربردنی نوێتری ڕەنگ، مەیلم وایە کە شادی و ئازادی باشترین نمونەی ڕەنگی ئیشارەت باس بکەم " لە وێنەکێشانی سەدەی پانزەیەمی ئیتالیادا بەکاربردنی ڕەنگ بەشێوەیەکی گەلێ ئازاد و بە ویستی دڵ و تایبەت بەدی هاتووە و لە داوەری نەخش و بڕیاری گریمان کراو ئازاد کراوە کە لەڕاستی دا گەیشت بەقۆناغێکی ڕەنگ کاریی پاراوو کامڵ و ئێستاکە ئەو لایەنە پێناس دەکەین " بەلام لەپێشدا بوارم دەوێت بەڕووی بەکاربردن کە لەوێدا بە بە کاربردنی ( هاوسەنگ ) دەرم بڕی نیشانی بکەم. ئەو جۆرە بەکاربردنە زیاتر بەلەپێش چاوگرتنی هەمان نرخی — تۆن — ەوە سەرهەڵدەدات، کەلەبەشەکانی ڕابردودا لەبارەیەوە دواین.

کاتێك هونەرمەند شتەکانی خۆی لە پەیوەندیدا بەسێبەر و ڕوناکییەوە لەپێش چاو دەگرێت، ناچار دەبێت بەهای – تۆن – یان هێزی ڕێژەیی هەر ڕەنگێك سەبارەت بە ڕوناکی گشتیی تابلۆکەی لە پێش چاو بێت... ئەو کارەش مەرجی ڕێکخستنی ڕەنگەکانە بە پێوانەیەکی دیاری کراو.

تۆن زۆر جار لەسەرەتاوە لە تابلۆدا دیاری دەکرێت (لەوانەیە بە ویستی دڵ بێت، بەڵام زۆر جار بە فرمانی شێوازێکی تایبەت یاخود بە فرمانی ڕەوتێکی دیاری کراو) وە گشت ڕەنگەکانی دی بەنێوانی دیاری کراو بەو " تۆن " ە زۆر لاواز یان بەهێزدەکرێن.

لەسەدەی شانزەیەمدا تا سەدەی هەژدەیەم نەریتی گشتی لەسەر ئەوە بڕیاری دابووکە هونەرمەند پێویستە بە ڕەنگە پلەدارکراوەکان کار بکات، بەو مانایەی ڕەنگەکان بە نێوانی ورد لەتەك یەکدا پۆل دەکران، بەجۆرێکی وەها کە هونەرمەند نەیدەتوانی بەبێ لادان لەو کۆمەڵە سنور و نێوانانەی ڕەنگەکان پۆل بکات، تەنها خاڵی مەبەست لەم بەسەرکردنەوەیەدا ئەمەیە کە دەمانەوێت تێبگەین بۆچی هونەرناسانی سەدەی هەژدەیەم هێندەی پەیوەندییان بە تابلۆوە هەیە و ڕەنگە سەرەکییە کانی تابلۆیان بە جۆرێکی ڕەتکراوەو ئاڵۆز لەژێر لیکێکی قاوەیی ڕەنگدا بەرچاو دەکەوت!... بەهەمان شێوە دیارە شتێکی سروشتی بوو کە لە هەنگاوهەڵهێنانی هونەرمەندانی دوایی دا هەرگیز بە ڕەنگی قاوەیی یەوە پەیوەست نەبوون و وێنەیان بەو ڕەنگە نەدەکرد.

ئەو کاتە کاتی ئەوە هاتبوو کە کۆنستابل لەسەر بنامەیەکی تەواو هارمۆنی دەستوری ڕەنگەکانی بەیان کرد، بەڵام کۆنستابل ئەو شۆڕشەی تاکو پلەی ئەنجامێکی لۆژیکی بەرەو پێش نەبرد... وە ئەو خاڵەی لە پێوانەکاریی تێبینییەکانی دا لە هەوای ئازاددا بە دیهێنا کەلە تابلۆکانیدا بە تەواوی دەشێ بەدی بکرێت. ئاشکراشە تابلۆکانی کۆنستابل هەمیشە دەستوری هارمۆنی ڕەنگەکان تیایدا تاڕادەیەك ڕێنومایی کراوە. بەڵام لەو ڕووەوە تێرنەر لە کۆنستابڵ لێهاتوتر بوو، گومانیشی تیادا نییە کە بەرهەمەکانی تێرنەر مەزنترین ڕەنگکاری سروشتین کە تاوەکو ئێستا جیهان بەخۆیەوە بینیوێتی .

شێوەی بەکاربردنی ڕەنگ بەیاریدەی سیزان = Cezanne کە لە پەرەگرافی – 73 – دا زیاتر ڕوون دەبێتەوە زیاتر گەشەی کرد،" نەك هەر وەکو شێوزای تێرنەر تەواو سروشتییە " نـە وەك شـێوازی هونەرمەنـدانی نوکتەچـن = Pointillistes ، بـەڵکو شـێوازێکی زانـستی هەیە ... شێوازی سیزان کەم تا زۆر – سیمبولێکییە – ، سیزان خۆی دەربارەی شێوازی کارەکانی دەڵێت : – "کە ڕەنـگ چـڕوپڕ بێـت ، شـکڵیش تـەواو دەبێـت ." " بـەم مانایـە ڕەنگی شکڵ نیشان دەدات .

بەکورتی نەك لە ڕێگەی گۆڕانکارییـەوە کـە لـە پـاراوی ڕەنـگ خۆیـەوە بـەدی هـاتووە بەڵکو لە ڕێگەی –– ئارایشتەوە – واتە ڕێکخستنی بەهێزی و لاوازی ڕێژەیی ڕەنگەکان لەتەك یەکتری دا کە بە جۆرێك لـە خـەیاڵ بـەدی دێـت، شـێوەی سـێ دووری لـەوان دا بـە دیـاری دەکـات (چـونکە ئەگـەر ڕەنگـە جیاوازەکـان لەسـەر ڕوویـەك دابنـرێن ، ئـەوا لـە ڕوانگـەمان دا پێویـست بـە ماوەیـەکی دووری یـا میانەیـەك ناکـات بـۆ دەرکـەوتنیان ) ، لەشێوازی سیزان دا شکڵ ڕاستەوخۆ بـەهۆی ڕەنـگ و چـاوبڕینە تـاریکی و ڕونـاکی بـەدی دێت... سیزان بەم شـێوازەی لـە قۆنـاغی سـێ یـەمی جـۆری بـەکاربردنی ڕەنگمـان نزیـك دەخاتەوە ، کە مـن بـە ( جـۆرێکی پـاراو = خـالص )نـاوی دەبـەم ، لـەم جـۆرەدا ڕەنـگ لەپێناوی خودی ڕەنگدا بەکار دەبرێت " تەنانـەت بـەدی هێنـانی شـکڵیش لەوێـدا جێگـەی مەبەست نییـە ، ئـەو جـۆرە بەکاربردنـەش دیـارتر و زیـاتر لـە هـەر جێگەیـەکی دی دا لـە مینیـاتۆری ئێرانـی و ئەمڕۆکـەش لەبەرهەمـەکانی – مـاتیس – بـەدی دەکـەین... لەوێـدا ڕەنگـەکان بـە بـەهێزترین و پـاکترین چـۆنێتی بـەهۆی هونەرمەنـدەوە هەڵدەبـژێردرێن و هونەرمەند لەوان وێنەیەك بەدی دەهێنێت کە لـە بەرامبەریـدا نیـشاندانی بـەهێزی و لاوازی ڕەنگ و ناوچەکانی ڕەنگ بەدی دێت.

هەست کردن بـە بۆشـایی هـەمان شـێوە کـە لـە بەرهەمـەکانی – سـیزان– دا بـەدیی دەکەین ، بە پلەکاری بەهای تۆنەکانی ڕەنگ بەدی هاتوون ، بەڵام تەنها تا ئەو ڕادەیە کـە

جۆرە بنامەیەك چاودێری کراوە جۆرە هارمۆنییەك لەسەرتاپای تابلۆکە دا دیـاری دەدات ، وەك بەرهەمێکی جوان کارییە "تزیینی ".

مەسەلەی سەر بەلێکچواندنی شتەکان بە بەڵگەی دەرەکی لایەنی ناوەندییان هەیە یان لە پلەی دووەمدا دادەنرێن. بەهەمان شێوە ئایا ڕەنگ تا پلەی ڕاستەوخۆترین کارتێکـەری ئەندامیی ڕەنگ لە ڕوانگەمانـدا چییە ؟ ... ئەمـە خاڵێکـە کـە — ڕاسـکین— بـە لـەبارترین شێوە پێناسی دەکات :— " گشت کەسێك کە خاوەنی زەینێکی دەوڵەمەند و سروشـتێکی تەواو بێت ئەوا چێژ لە ڕەنگ دەبینێ ، چونکە ڕەنگەکان بۆ چێژ بەخشین و دڵ کردنەوە و خرۆشـاندنی ئـارەزووی دەروونـی مـرۆڤ ئافەریـدە بـووە ، بـالاترین بەرهــەمی سروشـتی بەڕادەیەکی زۆر ئاراستەی ڕەنگ و ڕێنمایی ڕەنگ دەکات ، ڕەنگ نیشانەی بالای کـەماڵ و تەواوییە ... ڕەنگ لەگەڵ ژیان و مرۆڤدا، بە تیشکی لە ئاسمان دا و بـەپاکی و پـیرۆزی لـە سروشتدا پەیوەستە " مەرگ و تاریکی و بێزاری گشتیان بێ ڕەنگن ."

## 26 — چوارەم — شکڵ یا ڕوخسار = Form

لە نێوان ئەو چوار ڕەگەزەدا کە بەرهەمی هونەری وێنەکێشان پێك دەهێـنن، ڕوخـسار لە گشتیان دژوارترە: "شکڵ پەیوەستی بابـەتێك دەبێـت کـە لایـەنی سروشـتی بـالایی یـا میتافیزیکیی — هەبێت... بۆ نمونە ئەفلاتون بە وێنـەی موتڵـەق و وێنـەی ڕێـژەیی یـا بـە زیادەیەکی دەڵێت —منیش باوەڕم وایە ئـەو جیاوازییـە لەشـیکردنەوەی شـکڵی وێنـەیی دا دەشێت بەکار ببرێت. نیاز و مەبەستی ئەفلاتون لە وێنە ڕێژەیی ڕوخسارێکە کە ڕێـژەی یـا جـوانیی ئـەو شـتە لـە چـییەتی بووەکـان دا یـا دروسـتکراو و دوپاتـەکان دا" لـە شـتە زیندووەکان دا نادیار و شاراوە بێت . مەبەستیشی لە وێنەی موتڵەقی شـکڵی ڕووتەکارییـە = ئەبستراکتی — کە بریتین لاشەی زیندویان لێ دروست دەکرێت .

ئەفلاتون ئـەم شـکڵە ئەبـستراکتانە بـە جـوانیی نـەگۆڕ و موتڵـەق دادەنـێ پێوانـەیان دەکات بە دەنگی نەرم و پاك و پاراو " وە دەڵێت ئەو جۆرە دەنگانە جوانن نـەك لەپێوانـە

یان دا بەشتەکانی دی، بەڵکو بەحوکمی چییەتی خۆیان–... لەسەر ئەوە ئیشارەیەك کە ئەفلاتۆن بۆ جیاوازی کردنی نێوانی وێنەی ڕێژەیی و وێنەی موتڵەق دەیدات ( کە لەوانەیە لە ئیشارەت کردن شتێکی زیاتر نەبیت ) بە باوەڕی من شکڵێك کە لە بەرهەمێکی هونەریی سەرکەوتودا بەدی دێت ، دەشێ بە دوو بەش دابەش بکرێت : یەکەم – شکڵێك کە دەتوانین بە بیناکاری = architecturol ناوی بەرین ، دووەمیان بە شکڵی سیمبوڵیکی یا ئەبستراکتی یان موتڵەق . تەنها شکڵەکانی کار لەوەدایە کە کاتێك پێکهاتی بیناکاری جیاواز لە ناوەڕۆکی ئەو باسەی بەسەری دەکەینەوە دیاری بکەین “ لەڕاستی دا ئێمە هەر جۆرە شکڵێك بە ڕوویەکی ئەبستراکتی یا موتڵەق یا سیمبوڵیکی بەدی دەهێنین ... لەهەر پێکهاتێکدا پێویستی ئاشکرا کردن ئەمەیە کە بەشەکانی ئەو پێکهاتە بەهۆی بناغەیەکەوە پێکەوە پەیوەست بکەین، بەمانای کارتێکردنی ئەندامی، ئەو پێکهاتەیش – ترکیب – نابێت بینگەی مرۆڤ دوچاری نا ئارامی و ناجۆری یا نا هاوسەنگی بکات ، لەبەر ئەوە وێنەو پەیکەری گشت شتەکانی تابلۆ پێویستە لەسەر بناغەیەکی دارشتن بەند بن و وەکو هەرەم بینا بکرێت . گشت تابلۆیەك بە زاراوەی کلاسیك مانای بەرهەمی لوتکەی ڕێنیسانس دەگرێتەوە کە ئەنجامی گشتیی بریتییە لە جۆرە پێکهاتێکی پایەدار یا بەند کراو لەبەرامبەر ئەو جۆرە پێکهێنان کارییەدا.

جۆرێکی تری پێکهات – مان هەیە کە زۆر جار لەهەمان کاتدا کە لایەنی بیناکاری خۆی دەپارێزێت و والاو کراوە" یە، لەم جۆرە پێکهاتکارییەدا سنوری تابلۆ نابینراو بەدی دەکرێت : جۆرە هەستێکی بۆشایی لەوێدا بەدی دێ کە بە دەرەوەو ناوەوەی تابلۆدا دێت و دەچێ – یا بەلای کەمەوە پەیوەندە بەلایەکی تابلۆکە.

هێڵ و جوڵەش لە هەمان کاتدا کە واتای تابلۆ لە شوێنگەیەکەوە سەرچاوە وەردەگرن ، لەگەڵ یەکتریدا یەکسان و بەرامبەرن : هێڵی بەهێز لە بنکەیەکەوە سەرهەڵدەدات کە لە نێوانیاندا هاوسەنگی لێپرسراوە... پێکهاتکارییەکانی قۆناغی بارۆك = Baroque لەو جۆرەن .

هونەرمەند لە بیناکردنی ئەو پێکهاتەدا دەشێت بە ڕێگەی عەقلانی کار بکات یا بە ڕێگەی غەریزی" یان لەوانەیە بەشێك لە هەردوو ڕێگەکە ڕێباز بکات ... بەلاّم زیاتر هونەرمەندانی ڕێنیسانس – پیرۆدیلا فرانچیسکا – لیۆناردۆ داڤینشی و ڕافائیل – شێوازی عەقلانییەتیان پەیڕەو دەکرد لە بینای بەرهەمەکانیان دا ، کە زۆر جار وەك پەیکەر تاش و بیناکاری یۆنانی لەسەر بنچینەی ڕێژەیی ماتماتیکی کاریان کردووە...بەلاّم کاتێك ڕووبەڕووی پێکها تکارییەکی شێوازی بارۆك – ی وەك " هاتنی مۆریسی پیرۆز " دەبینەوە کە بەرهەمی – ئالگریکۆ – یە ( وێنە 16 ) دەبینین کێشانی تابلۆکە چەند ئالۆزەو دوپاتکردنەوەی پەیوەندییەکانی چەندە پڕ کۆسپن .

کاتێك شکڵی تابلۆ نێتی ئەوە بێت زۆر مامۆستایانە وەڕو بکەوێت ناچار دەبین بڵێین : شکڵ دەبێت وەکو حەلکردنی بابەتێکی ماتماتیکی دیدەی هونەرمەند ئاشکرا بکات و سەلیقە نیشان بدات ، بەلاّم لەم جۆرە شکڵە دا لە هەمان جۆر چێژ بەهرە وەردەگرین کە لە بیناکاریدا بوونی هەیە ...هەڵبەتە ڕووی لێکچوی نێوان ڕوخسار = شکڵ – لەوێنەکێشانی بارۆك و شکڵ لە بیناکاری بارۆکدا والاّیە.

لەڕاستی دا لەنێوان شکڵی گشت هونەرەکاندا لە قۆناغی تایبەتدا شێوازی لێکچو بوونی هەیە ، وە لەهەمان ڕێچکەوەیەوە کە دەشێت بتوانین پەیوەندی ڕاستەقینەی نێوان هونەرمەندو شارستانیەتی قۆناغەکەی بکەین ، ئەوەش یەکێکە لەو مەسەلانەی ئەمڕۆ وامان لێ دەکات زیاتر سەرقاڵی خۆمان بین – واتە سەرگەرمی خەیاڵەکانمان بین .

هەر قۆناغێك یان هەر شارستانیەتێك ڕوخساری هونەر دیاری دەکات ، تەنانەت ڕابەری ئەوەش دەکات کە ناوەڕۆکی بەرهەمی هونەری پێویستە چی بێت ؟ بەلاّم ئەو دەسەلاّتدارییە کە شکڵ و ناوەڕۆك تێکەڵی یەکدی دەکات ، و تاوەکو پلەی لێهاتوویی سەریان دەخات " هەمان ئەو توانایەیە کە گیانی هونەرمەند دەبزوێنێ و دەیخاتە کار .

ئەو تایبەتێتییەی کە پێکهاتکاری لەودا بە – کێش – دەردەبڕن ، مەیلم وایە لەژێر ئەو لایەنەی شکڵ دا بینایەك دروست بکەم .. ڕیتم = کێش لە وێنەکێشان دا نەك تەنها بە

جوڵەی هێڵ ، بەڵکو بە دوپاتی قەبارەکان – و هەندێ جاریش بە ڕێکخستنی کاڵ کردنەوەش دەشێ بەدی بهێنرێت . ئەم دوپات و ڕێکخستنە عادەتی سێ قۆناغی هەیە ، بەلآم هۆی ئەمە لەمە زیاتر نییە کە ژمارەی سێ هەووەڵین ژمارەیە کە تیایدا دوپات و ڕێکخستن هەست پێدەکرێت ، هەروەهاش دوپاتی قەبارە زیاتر لە سێ جار لە تابلۆدا کاری دوپاتکردنەوە زیاتر لە حەدی خۆی ئاشکرا دەکات .

ڕونکردنەوەی شکڵی سیمبوڵیکی گەلێ دژوارترە ، شکڵی سیمبوڵیکی پشت بە ستووە بە بابەتی دەرونزانی کە کارل جوستاف یۆنگ = Carle Jostaf Jong و کۆی دەروونناسان لە ساڵانی دواییدا بەڵگەی زۆریان بەدەی هێنا . ڕۆجەر فرای = Roger Fry ئەم گریمانەیە لە هاو لێکچواندندا بە هونەر بەم جۆرە بەیان دەکات : " لەو باوەڕەدام کە لە هونەردا چۆنێتییەکی کارتێکەر هەیە کە تەواو ناسینی کێش و پەیوەندیی بەرامبەری نییە ، بەڵکو هەر بەشێك و کۆی ( بەرهەمی هونەری) تێکەڵ بە حاڵەتێکی هەستی دەبێت ... لەسەر ئەم پێناسەی ئێمە دەرهەق بەم جوانییە پاراوە، ئەو حاڵەتە هەستییە بە ئەنجامی هیچ یادێکی ناسراو یان ئەزمونێکی تایبەت بە ژیانی هەستی لە قەڵەم نادەین ، بەلآم هەندێ جار بەخۆم دەڵێم کە دەشێ هێزی هەمان حاڵەتی هەستی توانامەند بێت بۆ خرۆ شاندنی یاد و بیرەوەری گەلێ قوڵ و گرنگ ... بەم هۆیەشەوە کە هونەر پەی بە ژێرخانی کۆی ڕەنگەکانی ژیان دەبات ، واتە پەی بردن بەوەی کە کۆی هەندەکییە سۆزییەکان = هەستییەکان و تایبەتەکانی ژیانی ڕاستی بەدی دەهێنێت ... گوایە هونەر لە ڕێگەی پشکنینی مانا و بەهای سۆزی زەمان و مەکان = کات و شوێن – ەوە لە بوونماندا هێزێکی هەستی چنگ دەخات . یان لەوانەیە هونەر یادکردنەوەی ئەو شتانە بێت کە لەسۆزی هەمەڕەنگی ژیانی گیانیی مرۆڤدا توابێتەوە بەبێ ئەوەی چاو ئەو ئەزمونانە بە یاد بهێنێتەوە .. بەجۆرێك کە ئێمە پێچەوانەی بوونی هەمان سۆزو هەست لە خۆماندا پەی پێ دەبەین بەبێ ئەوەی سنورداریێتی ڕوویەکی تایبەتی ئەو سۆزەهەست پێ بکەین لەکاتی ئەزمون کردنی دا ."

هەروەك لە تۆژینـەوەی ئـەنترۆپۆلۆژی = مرۆڤناسـی و ئـایین دا دەکـریَ وەرو بخرێـت ...ئاشکرایە کـە سـیمبولَ = هێمـا دەشـێت لـە بنـچینەدا روخـسارێك = شـکلێك بێـت بـە روویەکی تەواو بریار دراوی دیاری بکرێت ... واتە سیمبولَ بریتـی بێـت لـە گـۆرانی سـۆزی زەینی و ئالۆز بەشتێك کە شکلَ و مەیلدارێتیی دیار و هەستپێکراو بێت ... ئەمەش راسـت بەرچاو دەکەوێت کە گـەلێ لـە بەرهـەمی هونـەری لـە رووی لایـەنی وێنـەیی خۆیـەوە ، بـە یاریدەی ئافەریـدەی هـەمان شـکلی سـیمبولێکییەوە " کـە دەشـێ نەسـتی بـن — هێـزی کاریگەر بەدی دێنیَ.

## 27 —یەکبوون = وحدت . Unity

لە بەرهەمێکی هونەری تەواودا گشت رەگەزەکان بـە یەکترییـەوە پەیوەنـدن ، بـەهۆی ئەم پەیوەندییەوە یـەکبونێك بـەدی دەهێـنن کـە زیـاتر بـەهایان لـە بـەدیهاتنی کـۆی ئـەو رەگەزە سادانەوەیە .

ڤیسلتەر = Whistter دەلێـت : مـرۆڤ بـە خـوێنی خـۆی وێنـە دەکێـشێ .ئـەم وتەیـەی هونەرمەنـد روونـی دەکاتـەوە کـە رەگـەزی تـابلۆی هونـەری بـە زیـادەکردنی کەسـێتی هونەرمەندەوە بەدی دێت کە بەسەر ئەو رەگەزانەدا زالە وە یەکەیـەکمان پـێ دەبەخـشێت کە هەمان یەکبوونی دەرخستنی سۆزی هونەرمەندە لە بابەتی هونەری دا .

کاتێك کە کۆی رەگەزە مادییـەکانی تابلۆیـەکی هونـەری دابـەش و شـی دەکەینـەوە " دەبێ سەر لەنوێ ئەم رەگـەزە ون و نادیـار لـە قەڵـەم بـدەین کـە رەنگدانـەوەی خـودێتی کەسی هونەرمەندە " ئەگەریش کالای یاریدەدەری وەك بابـەت ، قۆنـاغ نـەژاد — مـاددەی کار ، هاوبەشن بن لەبەرهەمەکەیـدا ئـەوا سـەر لـەنوێ رووبـەرووی ئـەنجامی تـەواو جیـاواز دەبنەوە .

دەشێت لە سەردەمی ڕێنیسانس بـە دواوە نکۆڵیمـان لـە دیـاری کردنـی ئـەو ڕەگـەزە گرنگە کردبێت. هونەرە مەزنە ئایینی یەکان — هونەری بـودی — هونـەری گوتیـك — زۆر تا کەم تەواو ناکەسین = غیر شخص.

لەو بارەیەوە ڕەخنەگرێکی تر بەناوی R.H. Wilenski ویڵنسکی لە کتێبـی The Modern Movement In Art دا دەڵێت : ئێمە بە دووچمکی جیاواز لـە هونـەر سـەروکارمان هەیـە — هونـەرێك کـە لـەپێناوی ئـایین دا خزمـەتگوزارە — هونـەرێکی تـر بـە دوی نـاوی بیرێکـی هۆشیار و بە ئاگا دەکەوێت.

ئەو جیاوازیکردنە بۆ پێناسی هونەرەکان بێ هـودە نییـە ، بـەڵام کۆسـپە بتـوانین بـەو جۆرە کە ویڵنسکی ڕەچاوی دەکات ئەنجام لەم جیاوازییەدا بەدی بهێـنین مانـای جیـاوازی کردنی وەها ئەمەیە کە ئێمە بەرهەمی هونەری بخەینە ژێر ڕۆشـنایی نیـازو مەبەسـتی ئـەو داوەرییەوە ....ئەم ڕێگەیەش بە هاوبەشی کردنی جۆر و بەشـی مەبەسـتی نـا پەیوەسـت بەدی دێت...لەسەر ئەم بنەمایە "ڕاهیبـی بـودایی چـین" لـە مۆزەخانـەی بـەریتانیا " کـە پەیکەرێکە لە دەرگـای ڕۆژئـاوای کەنیـسەی — شـارتەر = Charter — دواهـەمین بەرهـەمی ئیپستاین = Epstein یان هنری مۆر = Henry Moor دەبێ سەر بە یەکجۆر هەستیاری بن .

ئـەوەش دەزانـین کـە ئەگـەر تەماشـاکەر تێگەیـشتنی هـەبێ دەرهـەق نیـاز و نێتـی هونەرمەنـد و هەریەکـە لـە بابەتـەکان ، شـیاوی ئـازادبوونی ئـەم هەسـتیارییە زیـاتر دەبوو...بـەڵام دەبـێ هەمیـشە لـە یادمـان بێـت کـە جـەزبی هونـەر سـەرەتا ئاڕاسـتەی درکاندنی ئاگایانە نییە ، بەڵکو ئاراسـتەی دیـدە و درکانـدنی ڕاستەوخۆیە . شـوێنەواری هونـەری لـەبیردا ئامـادە نییـە ، بـەڵکو لـە هەسـت دا ئامادەیـە " بـەیانی ڕاسـتەوخۆی ڕاستەقینە نییە ، بەڵکو کینایەیە لە ڕاستی ، بەم بەڵگەیەیە کە کەرتکردن و شـیکردنەوەی خۆویستی بەرهـەمی هونـەری بـە ڕوویـەك کـە مـن لـەم تۆژینەوەیـەدا تـەنها لـە دەروازەی ڕوونکردنـەوەدا وەڕووم خـستووە بـەخودی خـۆی ناتوانێـت ئـەو چـێژەمان بـداتێ کەلەبەرهـەمی هونەرییـەوە وەری دەگـرین ، جـۆرە چـێژێك بـە شـێوەیەکی ڕاسـتەوخۆ

لەبەرهەمێکی هونەریدا بەڕوویەکی گشتی بەدەستی دەهێنین . بەرهەمی هونەری هەمیشە سەرمان دەسوڕمێنێ بەر لەوەی ئێمە بەئاگا بین لەوە ، ئەو کاری خۆیمان تێ دەکات .

## 28 – نەخشی بیناکاری

بینای بەرهەمی هونەری هەمیشە ئاشکرا نییە ، دەشێت ئەم بینایە هاوسەنگییەکی هەستیار لە یەکەکانی دا هەبێت و بەبێ تەبایی تایبەت بەدی بێت . بلاّم بەڕویەکی گشتی " بۆ نمونە هونەرمەندێ کە جەسارەتی تەواوی هەبێت وێنەیەك لەپێش چاو دەگرێت کە دەربڕینی ئاسان بێت و قەبارەی تابلۆکەی خۆی بەپێی قەبارەی پێویست دابەش دەکات ، وێنەی هەرەمێك کە پێشتر پەنجەمان بۆ ڕاکێشا گەلێك ڕەوایە ، چونکە کێشی زیادە لەخوارەوەی تابلۆدا بەدی دی دەهێنێت و دیدەی مرۆڤ لەخاڵێکەوە بۆ لوتکەی هەرەم ئاڕاستە دەکات کە مرۆڤ بێ یاریدە ئەوە ڕەچاو دەکات .

وێنەیەکی دی ئاڕایشی یا ڕێکخستنی چەند سێ گۆشەیەکە لە تابلۆیەکدا کە ئالگریکۆ = Algrico بەناونیشانی– نمونە – هێنامەوە ( وێنەی 18) ریتمی یان کێشێکی سورخواردو دەبینین وەکو تیشکێ لەجێ سورگەی دەستی مەسیحەوە بەلایەکدا بلاّودەبێتەوە و جوڵە بە کۆمپۆزیشنی تابلۆکە دەبەخشێت و ژیانی پێ دەدات – لەم کۆمپۆزیشنەدا یەکاو یەك هێڵەکان یاریدەی ئەم کێشە = ڕیتمە دەدەن .

لە هێڵکاری تابلۆدا یان هەر بەرهەمێکی بەرجەستەیی تردا، ئەم نەخشە بینایی یە ڕۆڵێکی بەربلاّوی هەیە، هەرچەندە ئەو نەخشانە بە ئاگایی و بڕیاری هونەرمەند بەدی نایەت، ئەم نەخشانە دیارتر لە هەر شتێکی تر ڕۆڵی سەردەم نیشان دەدەن .بۆ نمونە ئەمە ڕێکەوت نییە کە ڕۆبنس = Robbins زۆر جار نەخشی لول پێچ یا مار پێچی بۆ تابلۆکانی خۆی هەڵدەبژارد . چونکە نەخشی مارپێچ ، نەخشی جوڵەدار و باوی سەردەمی ڕۆبنس بووە .

رۆبــنس هــەولّی داوە كۆمپۆزیــشنی بینــای ســەردەمی پێــشوو یــا رێنیــسانس تێكبشكێنێ... لـە دورنمـایی دا = پێرسـپێكتیڤ — رەچـاو كردنـی بـەهێز تـر ئەمەیـە كـە كۆمپۆزیشنەكانی لەژێر كارتێكەری مەسەلە پراكتیكییەكان دا پەیوەندن بە پێرسپێكتیڤ و بارودۆخەوە.

بـۆ نمونـە لـە پێرسـپێكتیڤی كارەكـانی كلـۆددا = Claude (وێنـە 46)هـیچ هـەولێ بـۆ بەدیهێنانی كێشی سەر بە نەخش بەرچاو ناكەوێت... لەوتابلۆیەدا هێلّـەكان راسـتەوخۆ بـۆ نیشاندانی بەربلاّوی دیمەن بەكاربراون ، بەبێ ئەوەی زیادەیەك لە قەبارەی رێژەی ئاسمان و زەوی یا كەش بە یاری كردنی سێبەر و روناكی بەدی بێت — ژیان وجولّەی بینـای تـابلۆ پێویستە لە خـودی بابـەتی تـابلۆدا بپـشكنرێت " نـەك ئـەو ژیـان و جولّەیـە وەك قـالّبێكی ئاسنین لە تابلۆدا دابنێین و هـەولّ بـدەین بابـەتی تابلۆكـە لەوێدا جێگـە بكەینـەوە. رووی لێكچوو بەم تابلۆیـە ئەمەیـە كـە دیمـەنێكی خـەیالّی بكێـشین دوور بێـت لـە گریمانـەی لـە سروشــت چــوون واتــە فــری بەسروشــتەوە نــەبێت ، ئەمــەش شــێواز و روویەكــە كــە هونەرمەندانی نوێ وەك كاندنیسكی = Kandinsky و ماكس ئەرنـست = Max Ernst "وێنـە 64" رێبازی دەكەن.



1– هەڵسانەوەی مەسیح. کاری پیرۆ دولافرانچیسکا (1416 – 1492)
نیگاری سەردیوار لە بۆرگۆ سان سپۆلکرۆ.



2– شەهوەتپەرستی بە پێخاوسییەوە بەناو دڕکەکاندا دەڕوات. لە چامەیەکی (پرۆدنتیۆس)ی شاعیری لاتینەوە. هونەری ئینگلیزی. سەدەی یانزدەهەمی زایینی. مۆزەخانەی بەریتانیا.



3ـ ئەفرۆدێت بە سواری قازەوە. جامێکی نەخشێنراو لەسەر باگراوەندێکی سپی. هونەری یۆنانی. سەدەی (5ی پ. ز).مۆزەخانەی بەریتانیا.



4ـ ئۆریۆنی ڕاوچی بە دەریادا دەڕوات. هونەری ئەترۆریایی. نزیکەی( 500 ی پ. ن)، مۆزەخانەی بەریتانیا.



5ـ جام، زیوی تێکەڵ بـە زێڕ. هونـەری ئینگلیـزی. نزیکـەی( 1350 ن). کڵێسای هیمستال ڕیدۆر.



**6ـ هونـەری چـینی (زنجـیرەی چـو) سـەدەی (12 تـا 3ی پ. ز). دەزگـای سمیتستۆن و گەلەریی هونەریی فریر. واشنتۆن.**



**7ـ دارێك هەڵكۆڵینی لەسەرکراوە, لـە کەشـتی ئۆسـبوگەوە. هونـەری ڤـایکینگ. نزیکەی( 800 ز). مۆزەخانەی زانکۆی ئۆسلۆ.**



**8ـ ئەژدیها. هەڵکۆڵین. هونەری چینی سەدەی( 12 تا 3 پ. ز).**



**9ــ ڕوویــەکی عــاجی. هــەڵکۆڵین . هونــەری ئیــسپانی کۆتــایی سەدەی( 12). مۆزەخانەی ڤیکتۆریا.**



**10ـ شەپۆلی گەورە. کاتسوچیکا هۆکۆسای (1760 – 1849).**



**11ـ گۆزەی بەردین. هونەری چینی (زنجیرەی سۆنگ)**
**960 – 1279. مۆزەخانەی ڤیکتۆریا و ئەلبێرت.**



12– سەری لاوێك. نیگاری بەرجەستەی سەر مەڕمەڕ. هونەری ئیتالی، سەدەی ( 16 ز). مۆزەخانەی ڤیکتۆریا و ئەلبێرت.



13ـ دەموچاوی لاوێك. ڤان کوغ (1855 – 1890) مۆزەخانەی ڤالراف – ریچارتس – کولن.



**14**ـ دەموچاوێك لەسەر تابووتێكی مۆمیاكراو لە ناوچەی فیوم. هونەری میسری – رۆمی. سەدەی (**1** تا **3**ی ز). ناشناڵ گەلەری. لەندەن.



**15**ـ سامری باش. ڕامبرانت( **1648**). لۆڤەر – پاریس.



**16**ـ ڕێز لێنانی سانت مۆریس. ئال گریکۆ (**1545 – 1614**) کۆشکی ئاسکۆریاڵ – مەدرید.



17ـ لە قامچیدانی عیسا. پیرۆ دولافرانچسکا (1416 – 1492) کۆشـکی دۆک ئۆربینۆ. ئیتاڵیا.



18ـ مەسیح سەوداگەران لە پەرستگاکە دەردەکات. ئاڵ گریکۆ (1545 – 1614). ناشناڵ گەلەری – لەندەن.



**19ـ نیگاری گای دڕندە لەسەر دیواری ئەشکەوت. چاخی بەردین (سەردەمی ئۆرینیاکی) نزیکەی (20 ) هەزار ساڵ پ. ز.**



**20ـ نیگار لەسەر بەرد. براندبێرگ . ئەفریقای باشور.**



21ـ ئاسك. هونەری ئیبریایی. سەدەی( 8 یا 7ی پ. ز). مۆزەخانەی بەریتانیا.



22ـ داگرتنی جەستەی عیسا لە خاچەکە. هەڵکۆڵین لەسەر عاج. هونەری ئیسپانی. سەدەی( 11ی ز). مۆزەخانەی ڤیکتۆریاو ئەلبێرت.



23ـ حـەزرەتی ئـادەم. پەیکـەری بـەردین. کـاری تیلمـان ڕیمنـشنایدەر. کڵێسای مارینکێرشە. هونەری ئەڵمانی ( 149 – 1493).



24ـ دەمامکی دارین. ساحل ئەلعاج. ئەفریقا.



25ـ جامی چینکۆی دێهاتی. دوورگەکانی یۆنـان. سـەدەی( 19). مۆزەخانـەی ڤیکتۆریاو ئەلبێرت.



26ـ سەری ئامنمحتی سێیەم. هونەری میسری کۆن (1995 – 1790 پ.ن).



27ـ پەرجوو لە قانای. هەڵکۆڵین لەسەر عاج. هونەری قیبتی. سەدەی (6 ز). مۆزەخانەی ڤکتۆریاو ئەلبێرت.



28ـ دەسکی داردەستی قەشەیەك. عاج. هونەری, ئینگلیزی سەدەی (12). مۆزەخانەی ئاشمۆل. ئۆکسفۆرد.



29ـ پەیکەرێك. هونەری مەکسیکی (تاراسکان). هنری مۆر.



30ـ هونەری ئاسیای ناوەڕاست. سەدەی( 3 یا 2ی پ. ز). مۆزەخانەی بەریتانیا.



31ـ بەوری زێڕین. هونەری سیبری یا چینی (زنجیرەی هان). نزیکەی سەدەی( 2 پ. ن).



32ـ قوماشی زێڕین. هونەری ئێرانی. سەرەتاکانی سەدەی( 17 ن).
مۆزەخانەی ڤیکتۆریاو ئەلبێرت.



**33ـ مژدەی لە دایکبوونی عیسا بۆ مریەم. مینیاتۆری مۆزاییك. هونەری بێزەنتــی. سەدەکانی( 13 تا 14). مۆزەخانەی ڤیکتۆریاو ئەلبێرت.**



34ـ لاپەڕەیەکی زێڕکفتی (کتێبی گوڵان). سەدەی هەشتەم. کۆلێجی ترنتی. دەبلن.



**35ـ قوربانیکردنی ئیبراهیمی ئیسحاق. لە نوسخەیەکی مەزموری زێڕکفتەوە. هونەری ئینگلیزی. نزیکەی( 1175) مۆزەخانەی هانتەر. گلاسکۆ.**



36ــ پەیکەرێکی بەردین. هونەری ئینگلیزی. کۆتاییەکانی سەدەی(13). کڵێسای ونیچستەر.



37ـ مریەمی پاکیزەو عیسای مناڵ. نیگاری بەرجەستە لەسەر مەرمەڕ. کاری ئۆگستینۆ دی دۆچۆ. هونەری ئیتاڵی. سەدەی( 15). مۆزەخانەی ڤیکتۆریاو ئەلبێرت.



38ـ سكێچی ئەسپێك. كاری پیزانلۆ (1397 – 1455) مۆزەخانەی لۆڤەر – پاریس.



39ـ ماسی شووشەیی. هونەری ڤینیسی. سەدەی حەڤدەهەم. مۆزەخانەی ڤیكتۆریاو ئەلبێرت.




40ـ داخکردنی سانت فرانسیس. کاری یان ڤنایك. دەوروبەری(1238).
پیناکوتکا. تۆرن.



41ـ کارێکی هیرۆنیمۆس بۆش (1460 – 1516) مۆزەخانەی
هونەرەجوانەکان. برۆکسل.



42ــ کــارێکی ڕۆبــنس (1577 – 1640) مۆزەخانــەی پادشــایی هونەرەجوانەکان. ئەنتۆرپ.



43ـ ناشتنی عیسا. مایکل ئەنجیلۆ. دەوروبەری ساڵی( 1495). ناشناڵ گەلەری. لەندەن.



44ـ دەموچاوی مستەر بیکەر. کاری لۆرانزۆ برنینی (1598 – 1680)
مۆزەخانەی ڤیکتۆریاو ئەلبێرت.



45ـ پەیکەرێکی چینی. کاری فرانز ئەنتۆن بوستلی. نزیکەی(1760).
مۆزەخانەی هونەرو پیشەسازی. هامبۆرگ.



**46ـ دیمەنێك لەگەڵ ئادەمدا. کاری کڵۆد (1600 – 1682). ناشناڵ گەلەری. لەندەن.**



**47ــ شەیتان فریشتە یاخیەکان هان دەدات. کاری ویلیەم بلەیك. (1808). مۆزەخانەی ڤیکتۆریاو ئەلبێرت.**



48ـ زریان. کەشتی هەڵمی لەبەردەم لەنگەرگادا.(1842). کاری جی. ئێم. دەبلیو. ترنەر (1775 – 1851) ناشنالّ گەلەری .لەندەن.



49ـ قەراخ دەریا. کاری جۆن کۆنستبل (1776 – 1837). مۆزەخانەی هونەرەجوانەکان. بۆستن. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.



**50**ــ ئەسـپی تۆقیـو لـە زریـان. کـاری یـۆجین دیلاکـروا (**1798 – 1863**). مۆزەخانەی بوداپست.



**51**ـ چەند ژنێك لە کاتی شانەکردنی قژیاندا. کاری ئەدگار دیگا (**1834 – 1917**).






**52ـ ژنێك لە کاتی خۆشتندا. کاری ڕێنوار (1841 – 1919).**



53ـ ئەو ژنەی کتێبی بەدەستەوەیە. کاری پۆڵ سیزان. نزیکەی ( 1900 – 1904).



54ـ دیمەنێك نزیکی پۆنتواز. کاری پۆل سیزان.



55ـ کێڵگـەی گـەنم و دارسـەروو. کـاری ڤنـسنت ڤـان کـوغ (1853 – 1890).



**56ـ دایك. كاری پۆڵ گوگان (1848 – 1903).**



**57ـ مارافسا. هنری ڕۆسۆ (1844 – 1910) مۆزەخانەی لۆڤەر. پاریس.**



**58ـ حەسانەوەی مۆدێلەکە. کاری هنـری مـاتیس (1869 – 1954) گەلـەریی فیلیپس. واشنتۆن.**



59ــ کـچێکی لاو لای ئاوێنەکـەوە. کـاری پـابلۆ پیکاسـۆ. مۆزەخانـەی هونەری نوێ. نیویۆرك.



60ـ باربارا. کاری جاك لیپشیتس. گەلەریی بوکهۆڵتز . نیویۆرك.



**61ـ ئێوارە. کاری مارک شاگال. پاریس.**



**62ـ ژنێك له كاتی شانه‌كردنی قژیدا. كاری مـاكس بكمان (1884 – 1950).**



63ـ ئامێری ئـاوازخوێن. کـاری پـۆڵ کلـی. مۆزەخانـەی هونـەری نـوێ. نیویۆرك.



64ـ خۆرو دارستان. کاری ماکس ئێرنست.



65ــ دیمــەن: بــەردەوامبوونی یــاد. کــاری ســلڤادۆر دالی. مۆزەخانــەی هونەری نوێ. نیویۆرک.



66ـ ئەسپێك لەمەڕمەڕی سەوز. هونەری چینی. مۆزەخانەی ڤیکتۆریـاو ئەلبێرت.



67ـ سێ پەیکەری وەستاو. کاری هنری مۆر.



68ـ ئەو ژنەی شانی داداوە. کاری هنری مۆر. گەلەریی میللی کەنەدا. ئۆتاوا.



69ـ پەیکەری (دار) لەگەڵ ڕەنگدا. کاری باربارا هیپورت.



70ـ نموونەیەکی کاری هونەریی ئاسیای ناوەڕاست. مانچستەر.

# بەشی دووەم

## 29- هونەری سەرەتایی

هەستی جوانناسی لە سروشتی زۆربەی کەسان دا، بە چاوپۆشی لە پلەی گەشەی بیرو باوەڕیان شتێکی سروشتییە ، وە ئەم خاڵەش لە تێبینی کردنی بەرهەمی هونەریی خێڵە سەرەتایی یەکاندا ڕۆشن دەبێتەوە ( کاتێك کە مرۆڤێکی سادە لە بەرامبەر دواهەمین ئۆتۆمبێلی کادیلاکی شەش سلندەر دا یا لەبەرامبەر بینایەکدا یا ماشێنێکی جوان دا خۆی دەبینێ و داوای لێ نەکراوە بەناونیشانی بەرهەمی هونەری ئەو شتانە لەپێش چاو بگرێت ، نائاگایانە هەستی جوانناسی خۆی وەڕودەخات ، دیسانەوە هەمان خاڵ بەدی دێت .) لەو زەمینەیەدا لە ساڵەکانی دوایی دا تۆژینەوە و بەدیهێنانی بەربلاو ئەنجام هێنرا ... ئێمەش ئێستاکە دەربارەی هونەری هەندێك لە سەرەتایی ترین کەسان کە ئەنترۆپۆلۆژی دەیانناسن ( لە 30000 – 10000ساڵ پ ز ) زانستی زۆر لەبارەیانەوە لەژێر دەستماندایە ... نمونەی ئامادەی ئەم هونەرەی پێش مێژوو ، سەردەمی بەردینی کۆن ، دابەش دەبن بۆ سێ گروپی جوگرافی (فەرەنسایی — کۆنتابریان = Franco Contabrian ئیسپانیای ڕۆژهەلات و سەروی ئەفریقا) بەلام وێنە ناسراوەکانی ئەشکەوتی ئەلتامێرا =Altamira لە ئیسپانیا لەو مەیدانەدا لە گشتیان گرنگترن.

هونەری خێڵەکانی بوشمان = Bushman لە کەنارەکانی خوارو و ئەفریقای ڕۆژئاواش ، لەگەڵ ئەوەدا کە لە ڕوانگەی کاتەوە بە قۆناغێکی گەلێك دواترەوە پەیوەستن و لە ڕوانگەی گەشەکردن دا یەکسان بە وێنەکانی ئەشکەوتی ئەلتامێرادا لە قەڵەم دەدرێن ، ئەو سێ گروپە شێوەی لێکچوو هاوبەشیان لە نێواندایە ، ئەو وێنانە ( کە وێنەی رووی دیواری ئەشکەوتن ) هیچ کۆششیك لە پێناوی ڕێباز کردنی بنەما و یاسای پێرسپێکتیڤ

نیشان نادەن ، بەڵکو زیاتر مەبەستیان ئەمەیە کە گونجاوترین لایەنی ڕەگەزەکانی پێکهاتی شتەکان نیشان بدەن ... بۆ نمونە لە وێنەیەکی نیوە لایی دا ، پێ واتە هەردوو پێ بە شێوەیەك کە لەسەر لا ببینرێت نیشان دراوە...لە لایەکی ترەوە هونەری خێڵی سەرەتایی هونەری ڕێباز کردنی سروشت نییە واتە Naturalism = نییە لەم هونەرەدا بەڕوویەکی گشتی تایبەتمەندێتی هەندەکی لابراوە و لە جێگەیدا شتێ هاتۆتە کایەوە کە دەکرێ بە سیمبولێکی ناو ببرێت. هەندەکێتی یا جوزئیاتی شکڵی سروشتی یان لابراون یان شکڵیان گۆڕدراوە تاوەکو گرنگیی بنچینە یی ئەو شتەی کە وەرگیراوە باشتر وەربکەوێت .

بۆ نمونە لەشی گای نێریان درێژ کێشاوە تاوەکو حاڵەتی قەڵەمبازی گا نیشان بدەن ، ڕەنگیش یەکدەستی بووە و سێبەرو ڕوناکی تەنها لە پێناوی ئەوەدا بەکار هێنراوە ، کە هێڵی جوڵەی لەشی ئاژەڵەکە نیشان بدات . لە قۆناغی ئورینیاکی دا = Aurignacian هونەری سەردەمی بەردینی کۆن لە قۆناغی یەك هێڵییەوە بە قۆناغی دوو دووری گەشەی کرد و قۆناغی ماگدالێنی = Magdalenian لە قۆناغی دوو دوورییەوە بە قۆناغی بەرجەستە یی یا سێ دووری دەگات . بەڵام لەسەردەمی بەردینی نوێ دا ئەم هەستیارییە بەرجەستەیی یە نادیار دەبێت ... لە نمونەکانی ئیسپانیای ڕۆژهەڵات و هونەری بوشمانەکان دا گەشەیەکی بە سەرنج تر بەرچاو دەکەوێت ... بەهەمان مانا کاتێك گروپێك لەشتەکان وێنەکێشراون ، دەبینین ئەو گروپە بەناونیشانی گشتێکی گونجاو کێشراوە نەك تەنها بەناونیشانی کۆبوونەوەی چەند کەسێك .

## 30 – وێنە کارییەکانی بوشمان

وێنەکانی بوشمان لەسەر ڕووی بەردەکانی نێو ئەشکەوتەکانداو لە شێوەی هەڵکۆڵین دا کێشراون ، کاربردی وێنە کێشانیان دەشێ خەنجەر یا تیغێکی بەردی یا ئاسنی بوبێت، وە مادەی ڕەنگیش بریتی بووە لە ڕەنگی ڕۆن کە بە وردی لە پیووی ئاژەڵ و خۆڵی

ڕەنگینەوە دەری هێناون ... بەڵگەیەك هەیە كە ڕوونی دەكاتەوە گوایە بوشمانەكان ئەو وێنانە سەر لە نویٚ وێنە دەكێشنەوە و هەڵگرتنی وێنەكان لایان پیرۆز بووە ... تەنانەت جێگەی وێنەكێشانەكەشیان لا پیرۆز بووە .

هەندێك لەو وێنانە سەر بە قۆناغی دوایین ... دكتۆر كۆهن = Herbert Kuhn باوەڕی وایە كە وێنەكێشانە بوشمان لە هەمان چەند سەدەی پێشودا لەوپەڕی تەواویدا بووە و لە یەكیٚ لەم دوو سەدەیەی ڕابردوودا دووچاری داڕمان هاتووە ...چونكە لەو سەدانەدا بوشمانەكان بەهۆی بڵاوبوونەوەی ڕەش پێستەكانەوە ، سەر زەمینی خۆیان هەردەم بە ڕادەیەكی زیاد لە داموو دەستوری خودی لە دەست داوە ... بەڵام پێشینەی وێنەكاری لەڕاستی دا گرنگییەكی زۆری نییە ، ئەوەی شایەنی گرنگییە جێگەیەتی لە مێژووی زانستی نەژادی مرۆڤ دا ... گومانیشمان لەوە نییە كە لە هونەری بوشمانەكان دا بەردەوامی هەمان هونەر بەدی دەكەین كە هەزاران ساڵ لە ناوچەی زۆر فراوان دا چرۆی كردووە ...واتە لە ڕاستی دا هونەری قۆناغی پێش مێژوو لەسەر هەمان باوەڕی دكتۆر كۆهن لێكچونی وێنەكاری بوشمان لەگەڵ وێنەكانی ناو ئەشكەوتیٚ كە لە ڕۆژهەڵاتی ئیسپانیادا دۆزراوەتەوە ، شتێكی ڕاستەوخۆو ڕێكەوت نییە " بەڵكو بەباوەڕی دكتۆر كۆهن بۆشمانەكان نەژادێكن پەیوەستن بە فەرهەنگی كاپسایی = Capsian لە ڕۆژهەڵاتی ئیسپانیا و باكوری ئەفریقا .

بەڵام من پێویستە بابەتی ئەنترۆپۆلۆژی كە زۆر گرنگە و چییەتی و چلۆنایەتی تەشەنەكردنی هونەری بوشمان بەرەو پێش دەبات بخەمە لاوە و تۆژینەوەكەم سەرگەرمی لایەنی جوانناسی بكەم.

یەكەم نابێت وابزانین كە بوشمان توانیویانە بەو شێوەیە وێنە بكێشن ، پێشینەیەك لە زمانی كۆچەرانی كۆنەوە كە لە ناوچەكانی بوشمانەكان دا نیشتەجیٚ و ماوەن" باس لەمە دەكات كە لە خێڵەكانی بوشمان دا جێگەیەكی هاوشێوە بە بارەگا و جێگەی وێنەكێشان بوونی هەیە...تەنانەت ئەگەر ئەو هەواڵەش لەبەر دەستا نەبوایە ، دەمانتوانی دڵنیا بین كە

ئەو هەستیاریی جوانناسییەی لە وێنەکانی بوشمانەکان دا بەدی دەکرێت خاوەنی سیفەتی ئامادەیین. چونکە ئـەم وێنەکارییانـە لـە ڕوانگـەی جوانناسـییەوە شـایەنی گـرنگین ، بـەو واتایەی کە من بەناوی جوان ناویان دەبەم لە ( پەرەگرافی 3 دا).

ئەم وێنانەی بوشمانەکان دەتوانین بە — جـوان — ناویـان بـەرین ، لەبەرامبـەر ئەمـەدا دەبێ ئەم هونەرە لە هونەری ڕەشپێستەکان بە تەواوی جیابکرێتـەوە و ئـەم سـەرەتایەش خاڵێکـە کـە دکتـۆر کـۆهن لەبەشـی سـەر بـە"گیـانی هونـەری بوشمـان دا" بەسـەری کردۆتـەوە... دکتـۆر کـۆهن دەڵێـت :— " دیـارترین خاسـیەتی هونـەری بوشمـان لایـەنی سروشتی و هەستی گیانییە کە ئەوهونەرە دەخولقێنن... ئەگەر هونەری بوشمان لـە تـەك هونەری ڕەش پێستەکانی ئـەفریقادا دابنـێین و لـە هونـەری بـنین Benin و یوروبـا Yoroba چاوپۆشی بکەین دەبینین کە هونەری بوشمان بە بەڵگـەی سروشـتی بـوونی خـۆی گـەلێك نزیك ترە... هونەری بوشمان هونەرێکە ڕاستی بین تر و ڕاستگۆترە دەرهـەق بـە سروشـت ... مرۆڤی بوشمان پەیوەندییەکی بەهێزی هەیە بە سروشتەوە و لایەنی بەرجەستەکردن و ڕەنگ و شکڵ وبزوتنی شتەکان بەتوانایەکی زیاترەوە هەستی پێ دەکەن ....لـە ڕوانگـەی ئەوان دا شتەکان ڕاستین... بەپێچەوانەی ڕەشپێستەکان کە ڕوانگەیان بەرامبـەر بـەجیهان ڕوانگەیەکی گیانیی پتەوە و شتەکان هێمادار بە بابەتی جوهەریو مانای خودی نازانن ."

لەسەر ئەمە لەجێی دروست کردن و ئەبستراکت کردن دا کە ئێمە لە هونەرەکانی دژ بە ژیان دا وەك لە هونەرەکانی ڕەش پێستەکان یا هونەری بێزەنتی کوبیزمدا بەدی دەکـەین " سەبارەت بۆشمانەکان ڕووبەڕووی هونەرێك دەبینەوە کە یەکاویەك هێڵـەکانیان بـاس لـە ژیان و بزوتن دەکات... زۆربەی وێنەکارییەکانی بوشمان گیانداران لە حاڵەتی خێرایی دا یا لەکاتی زاوزێدا دەکێشرێ .

بـەلاَم لـە حاڵەتێکـدا کـە بابـەتی وێنـەکاری مـات و خامۆشـە ، وەك نمونەیـەك کـە هەڵمبژاردن (وێنە 20)هەمیسان وێنەکان گەلێ ژیاو و زیندوو دەردەکەون ، ئایـا شـارەزایی

و کارامەیی هونەرمەندی شارستانی دەتـوانێ وشـیاری گیانـدارێکی بـەدگومان چـاتر لەمـە نیشان بدات "

وێنەکارییەکانی بوشمان زۆر جار یەکڕەنگە ، هەرچەندە زۆر ڕەنگیان ناسیوە و هەندێ جار پێکهاتی دوو رەنگی یا زیاتریان بەکار بردووە، ئەم وێنەکاریانە گشتیان دوو دووریـن و هیچ جۆرە سێبەر و ڕوناکی یا گۆڕانی تـۆنی ڕەنـگ تیایـدا بـەدی ناکرێـت ، کـاتێکیش کـە پلەی جیاواز لە یـەك ڕەنـگ بـەکار دەبـەن ، مەبەسـتیان گۆڕانکـاری لـە سـێبەر و ڕونـاکی نییە... هەروەها بوشمانەکان هەوڵیان نەداوە ڕەنگی سروشتی بابەتەکە نیـشان بـدەن – بەڵکو تەنها بۆ نیشان کردنی کێش و جوڵەی وێنەیە ، لەو کۆمەڵە وێنەکارییەدا کە کـۆهن و ئۆبرمایەر = Obermaier ئەوانەیان لە بۆتەی تۆژینەوەکانیان دا توێ کردۆتەوە مەبەسـت و نیازەکـانی کۆمپۆزیـشنەکانیان تـەواو ئاشـکرایە . دکتـۆر کـوهن دەڵێـت : – " مەبەسـتی بنـچینەیی یـەك بوونـە نـەك زۆر بـوون ، وێنـە بـە ناونیـشانی گـشتێکی گونجـاو " کـل منسجم"نوێنراوە ، نەك بەناونیشانی قاڵبێك لە هەندەکی تاکانـەی خـود " هەنـدەکیی ئـەو ژیانی سەربەخۆ و تایبەت بە خـۆی نییـە ...بـەڵکو گرنگییـان لـە هەمـەیی کۆمپۆزیـشن دا ئاشکرا دەبێت ... بـەم شـێوەیە ئـەوەی لـەو هونـەرەدا والاو بەرجەسـتەیە ، بریتییـە لـە کۆمپۆزیشنەکەیان " بینای ئەوان بەناونیشانی گشتێك لە یەکبوونی ڕوویەکی فراوانی وێنـە دیاری دەدات " .

ئەو پڕوپاگەندەیەش گەورەیە " مرۆڤ دەیەوێت بزانێت کە کامـە هێـزی سـۆزی سـرۆش بەخش ئەو جـۆرە یەکبوونـەی لـە وێنـەکاری دا هـەبووە . نووسـەرانی کتێبێـك دەربـارەی تۆژینەوەکانمان دەڵێن " ئەو توانایەی لـەوێوە سـەر هەڵدەدات کـە بوشمانـەکان ژیـان بـە ناونیـشانی شـتێکی جـادوویی لـە پـێش چـاو دەگـرن ، لـە سـەماو گـۆرانی و ئەفـسانە بۆماوەکانی بوشمان دا گەواهی قوربانی ی جادوگەری بەرچـاو دەکـەوێت . ئاشـکرایە کـە وێنەی بوشمان بێ مانا نییە ، لەبەر ئەمە دکتۆر کۆهن ئەم ئەنجامە پەیجۆر دەکات کە : " ئەم وێنەکارییانە نەك تەنها بەهای جوانناسییان هەیە ، بەڵکو وێنەی وەکو وێنەکارییەکانی

سەدەی ناوەڕاستی ئەوروپان و مانای باوەڕپێشیان هەیە ... گەر نیاز مەند بین جادوگەری بەجۆرێك لە — باوەڕ — پێناسە بکەین ، ئەوا دەربڕینن لە ئەزموونی جادویی ."

## 31– گرنگی هونەری سەرەتایی

مرۆڤی سەرەتایی باوەڕی وایە کە کاتێك ڕووداوێك بە زمانی سمبلیکی نیشان دەدات ، توانای مسۆگەرکردنی ڕووداوەکە دەکات ، ئارەزووی مرۆڤ بۆ مالّی کردنی گیانداران و خستنە ژێر باریان ، مەیلی مرۆڤ بۆ مەرگی دوژمن ، مەیلی مانەوەی پاش مردن، مەیلی دوورخستەوەی گیانە شەڕخوازەکان یا هێور کردنەوەیان " ئەمانە گشتی دەشێت ئەنگیزەی بەدی هێنانی سمبلێکی کامل بێت... کەواتە بەم ئەنجامە دەگەین کە ئێمە لە هونەری سەرەتایی دا کارمان بە هونەرەوە هەیە بە مانای تەواوی ووشە، واتە سەرو کارمان بە ڕوخسار و ئارایشتیا نەوە هەیە کە بەیان کەری حالّەتی سۆزەکانی مرۆڤن .

ڕاستی ئەمەیە کە کونت گوبینو وتویەتی " ڕەشپێستەکان ئەو هەستانەیان لە خۆیان دا بە ترۆپك گەیاندووە کە غەریزەی شارستانی بوون لە ئێمەدا لەناوی بردوون و بەبێ ئەم هەستانەش هونەری شیاوی بوونی لێ ناکرێت .

ئەم بۆچوونە تەواو ڕاستە کە بەسەرداچونەوەی هونەری ڕەشپێستان و هونەری بوشمان ئێمە ڕابەری دەکات بۆ گەیشتن بە سەرەتایی ترین شکلّی هونەر ، سەرەتایی ترین شکلّی هونەر, سەرەتایی ترین شکلّ هەمیشە ژیاندارترین شکلّە لە هونەردا.

## 32 – هونەری ئۆرگانی ئەندازەیی

بۆ مرۆڤی سەرەتایی ئافەریدە کردنی هونەر لەبەر هۆی هەلاّتن بوو لە بێ یاسایی و ناجۆریی ژیان ... لە پێناوی قوتی لا یەمووت دا ڕۆژەکانی بەشەو دەکرد و ژیانیش هیچ بەردەوامی و مانەوەی نەبوو ، تا ئەمرۆکەش لەنێوان ئەو خێلاّنەدا کە پەیوەندن بەشارستانییەتەوە ، بە مانای ووشە ناکرێت بە — بوومییەکان — لێکبچوێنرێن — چونکە

بوومی هزری لە سنوری ئێستا زیاتر تێناپەڕێ و بڕناکات ، لەبەرامبەر بەسەرهاتەکان دا غەریزەی پەرچە کردار دەنوێنێ... بەم مانایە کاتێك نەزرێك یا دابێ بوگیانی دڕندەیەك دائەدات وەك ئەوەیە کە لە چێوەی بێ یاسایی ژیانی خۆی وەدەردەکەوێت و شتێ بەدی دێنێ کە ڕەنگدانەوەی یاسایان موتڵەقە . بەم شێوەیە مرۆڤ ڕەوت و ڕووی ژیانی خۆی ڕاگرێت یا بوەستێنێ و شتێ بەدی بهێنێ بێ گیان بمێنێتەوە ، مرۆڤ لە کات شوێنی دروست کردووە و سنوری ئەو شوێنەشی بە هێڵێ دیاری کردووە و ئەو هێڵەش لە ژێر کارتێکەری سۆزەکانی دا شکڵێکی بە نرخی لە خۆی گرتووە " بە شێوەی بنەما ، یەکەیەك یا هاوڕێژەیەکی وێنەیی بۆ سۆزەکانی بەدی هاتووە . بۆ بەدیهێنانی ئەم ئەنجامە خواستراوەش دوو ڕووی دیاری کراو هەیە " ڕووی ئۆرگانی و ڕووی ئەندازەیی... گوایە دەڵێن لە بنچینەدا ئەم دوو ڕووە بەرامبەرە لە پای دوو دەوروبەری دژ بەیەکدا بەدی هاتوون .

لەو جێگەیەدا کە هێزەکانی سروشت دژوارن " وەك بەستەڵەکی باکور و بیابانی ناوچە گەرمەکان " هونەر نەك تەنها شێوەی فێرار لە بەسەرهاتەکانی ژیان ڕێباز دەکات " بەڵکو دورە پەرێزی لە هەر شتێ دەکات کە کینایە بن لەو بەسەرهاتانەش .

دەوروبەری ئۆرگانێك کاتێ کە ئەو لە سادەترین شێوەی خۆیدا بەدی بهێنین .نا جۆر وەڕو دەکەوێت " لە ئەنجامدا هونەرمەند هەمووشتێك بەشێوەی ئەندازەیی بەدی دەهێنێت . لەگەڵ ئەوەدا پێویستە بەرهەمی هونەری بزێو و دینامی بێت و سەرنجی بینەر ڕاکێشێ و تەکانی پێ بدات یا ببزوێنێ و کاری تێ بکات .

بەم شێوەیە ئەندازەی ئەم هونەرە ئەبستراکتییە گەلێ پڕ جۆش و خرۆشە، ئەم هونەرە هونەرێکە میکانیکی، بەڵام نابزوێت ... لە لایەکی ترەوە هونەری ئۆرگانی ( واتە نا ئەندازەیی و نا ئەبستراکتی ) خێڵە سەرەتایی یەکان سروشت بە سەرنجی ڕازی تێ دەڕوانن. ئەم هونەرە مەیلانی ئەندامدار بەکار دەبات و حاڵەتی زیندوی ئەو پڕ هێز دەکات . ئەم هونەرە هونەری کەناری ئاو و هەواوی خۆش و سەرزەمینی پڕ بەرەکەتە . هونەری

کەسانێکە کە چێژ لە ژیان دەبینن و دڵنیان لە ژیـان " ڕووەك و گیانـداران و لەشـی خـودی مرۆڤ بە سەرنجێکی پڕ لە خۆشەویستییەوە وێنە دەکێشن و لەوێدا کە هونەر لـە لاسـایی کردنەوەی پەتییەوە لادەدات ... ئاڕاستەی ئەو لادانە " انحراف " پتەو کردن و بنیاتنـانی مەیلی ژیانە و خرۆشانە .

هونەری قۆناغی کلاسیکی یۆنان لـەڕووی ڕەگ و ڕیـشە بنـچینەیی یـەکانی یـەوە هـیچ جیاوازییەکی نییە لە گەڵ هونەری سەردەمی بەردینی کۆن یان هونەری بوشمـان ... واتـە ئەم هونەرە هونەرێکی ئۆرگانییە، جیاوازی لە ڕووی خۆشی بەخشینەوە لـە ئاسـتی پلـەی داڕشتن و ئاڵۆزی پەیوەندی و تـەبایی یـەتی کـە هاوشـانی شارسـتانییەتی خۆیـەتی " لـە پێوانەیدا بە هونەری سەرەتایی .

بەڵام ئەم خاڵەش دەبێت زیاد بکەین کە یۆنانییەکان نـەژادێ بـوون خـاوەنی زەینێکـی گەلێ زانستی و بیرەوەر " لەبەر ئەوەی ژیان و چەرخی سروشت و هونەر دڵی ئەوانی قایـل نەدەکرد بۆیە لە بواری تۆژینەوەدا لە خۆیان ڕادەبینی کە ئەو ژیان و بزووتنە بە یاریـدەی ئەندازەگەری ڕوون بکەنەوە ... بـەم شـێوەیە بـاجگری نـەگۆڕیان لـە سروشـت و هونـەردا وەڕوخست " یا وایان دەزانی کە دەستکەوتی مەزنیان لـەو بـارەوە وەڕوخـستووە... ئـەم باجانەش لەپاش ئەوەی کە وەڕوخران لەڕووی ویست وئاگایی یەوە بـەکاربران ... بناغـەی دابەشی ئاڵتونی وەکو پێشتر باسمان کرد بە یاریـدەی یۆنانییـەکان بـەدی هـات هێـشتاکە بەناوی یەکێ لە ڕەگەزە سەپێنراوەکانی شێوازی کلاسیك بەردەوام کاری پێ دەکرێت .

## 33 – پەیوەندی شێوازی ئۆرگانیك و ئەندازی

دوو جۆر لە هونەر بەرامبەر بە یەك – واتە هونەری ئۆرگانیك و هونـەری ئەنـدازەیی – لە سەرانسەری مێژووی هونەردا بوونیان هەیە ... دیارە بە بـەرفراوان بـوونی شارسـتانی و بە یەك بوونی یا تێکەڵ بوونی خێڵەکان ئەم دووهونەرەش تێکەڵ بەیەك بوون لـە ڕاسـتی دا بەسەرهاتی ڕاستیی هونەر نیشان دانی هەمان هاوجۆرییە ... بەڵام بەر لە گەیـشتن بـەو

بەسەرهاتە چاك وایە بزانین کـە هـەم هونـەری ئۆرگانیـك و هـەم هونـەری ئەنـدازەیی چ لـە قۆناغـەکانی پـێش مێـژوو لەسـەردەمی پـێش مێـژووییش دا چـەندەها جـار بـە تـەواوی خاسیەتی بنچینەیی خۆی دیاری دەکات، بـەناوی تاڕادەیـەك نـوێ لـەم بارەیـەوە دەکـرێ هونەری یا دەرکەوتنو سـەرهەڵدانی هونـەری ئەنـدازەیی بەشـێوازی ناسـراو بـە شـێوازی عەرەبی (ساراسن) ناو بەرین –ئەمەش شێوازێکە کە لە ئیسپانیا و میسر بەدەسـتی ئـەو عەرەبانە بەدی هات کـە خـاوەنی زەینـی بیرکـاری بـوون . لەگشتیان بـالآتر ، شـیاوترین بەڵگەی ئەم خاڵە لە هونەری بێزەنتی و ڕۆمی دا دەکرێ ببینرێـت . سـەرەڕای ئەمانـەش ، خاڵی لەم کارتێکەرانە دەرکـەوتنی هونـەری ئەنـدازەیی لـە هونـەری پـیرۆ – و مەکسیك و جاوە و ژاپۆن _ یش دا شایەنی سەرنجە .

لە هونەری کۆبیست –ی نوێ دا هەمیسان هەمان خاڵ بەدی دەکرێت ، بەلآم شـێوازی ئۆرگانیـك کـەمتر کـەرت دەبێـت : لـە هونـەری میـسری دا ئـەم شـێوازە لەتـەك شـێوازی ئەندازەیی دا لـە برەودایـە و گەشـە دەکـات ... لـە میـسری دێـرین دا هونـەری ئەنـدازەیی تایبەت بوو بە چینی ڕۆحانییەکان و هونەری ئۆرگانیك تایبەت بوو بە خەڵکەوە .

لـە وێنەکارییـەکانی گۆڕسـتانەکانی سـەرەتایی مەسـیحییەت دا ڕووبـەڕووی هونـەری گوتیك دەبینـەوە بـەکۆی پایەدارییـەوە ... هـەروەها لـە بوارەکـانی سروشـتی و مرۆڤیـی هونـەری– ڕێنیـسانس– یـش دا هـەمان شـێوە پـەیرەوی ئـەم شـێوازە بـە مـەزنترین سەرکەوتویی بەدی دەکرێت.

بەلآم سەرکەوتنی شێوازی ئورگانیك ( هەڵبەتە تەنها لە هونەری ڕۆژئاوادا) دوای ئامادە بوونێکی یا سازاندنێکی مەزن بەدی هات ، هونەری گوتیك و هونەری ڕۆژهەلآت هـەردوو لـە ڕووی لایەنەکانیانەوە نمایندەی تێکەڵ بوونی دوو سەرچاوەی یا دوو ڕەگەزی ئەندازەیی و ئۆرگـانیکن " سەرچـاوەی یـان بنـچینەی ئەبـستراکتی لـە تایبەتمەنـدێتی هونـەری خێڵـە کۆچەرەکانی باکورە ... هونەری ئەندازەیی لە سەرانسەری قاڕەی ئاسیا و ئەوروپادا ، لە سیبریاوە بگرە تا ئیرلەنـدە بلآوبـووەوە ... یـەکێ لـەو دیاردانـەی لـە مێـژووی ئـابوری دا

دوپـات دەبینـرێ بریتـی یـە لـە هێرشـی خێڵـە ڕاوکـەرەکان بـۆ سـەر خێڵـە کـشتوکاڵ پیشەکان... بەو مانایەی کە خێڵی کۆچەر کە لە زەوی و زاری کەم بەرهەم دا دادەمێنـێ ، بـەرەو زەوی پـڕ پیـت و بەرەکـەت هەڵمـەت دەبـەن و داگـیری دەکـەن ... لەگـەڵ ئـەم هەڵمەتەیان دا جوانکارییـە ئەنـدازەیی یـەکان و چـەك و تفـاقی ڕۆژانـە و عیرفـانی ئـایینی خۆیان سەربار دەکەن و بلاوی دەکەنەوە ... ئەم ڕووداوەش یا بە سەر هاتە شتێکی گەلێ ئالۆزە چونکە لـەو هەڵمەتـەدا سـەرهەڵدان یـا تێکشکانی زنجیرەیـەك لـە دەسـەلاتەکان و قۆناغەکانی گەشە و سستی ئابوری و نوێ کردنەوەی ژیانی بـاوەڕی و یـان مێملـی کردنـی بیرگەندی مورشیدان بەدی دەهات .

بەلام هونەر بەسەر گشت ئەم بابەتانەدا زاڵ دەبێت " وە لە جۆش و کوڵی ئەم ڕەگەزە جیاوازانەی قۆناغە گەورەکانی مێژوودا هونەر سەر هەڵ دەدات ... وەك هونـەری مینوسـی = Minosy وهونەری ساسانی ، هونەری ئیسلامی ، هونەری ڕۆژهەلات، هونەری گوتیكو لق و پۆپە فراوانەکانی.

## 34 –هونەر و ئایین

مێژووی هونەر لە قۆنـاغی سـەرەتایی دا ( مـەرج نییـە ئـەوەی سـەرەتایی بێـت کـەم بایەختر بێت ) تاوەکو شارستانی ترین بەرهەمی هونەری کلاسیك یـان گوتیـك " شـان بـە شانی بەرهەمی سۆزیاری مرۆڤ لە جیهان دا گەشەی کردووە و پابەندی هەستەکانی مرۆڤە، مەبەستم لەو گۆڕانەیە کە لە بواری جادوگەرییەوە بەرەو باوەڕهێنان بە گیان و گەیشتن بە قۆنــاغی ئــایین . مــاوەی دووری نێــوان پەیکــەرێکی ڕەش پێــستەکان و پەیکــەرێکی پراکسیتلس = Praxiteles یونـانی هـەمان نێوانـە دوریيـە کـە ئـایینی تارمـایی و گیانـەکانی ڕەشپێستان لە دیدگای عەقلانیەتی یۆنانییەکان دا لە شارستانیەتی یۆنان جیادەکاتەوە .

یۆنانییەکان هاوڕێژەیەکی ئایینی وەهایـان بـەدی هێنـا کـە نموونـەی مەحاڵـە و ئێمـە تەنها وشەیەك شـك نابـەین بـۆ پیاهەڵـدانی شـکۆی باوەڕیـان ، ئـەوان بەسـەر هـەر جـۆرە

ترسێکی دەرەکی دا زاڵ بوون و ڕوانگەیان بۆ ژیان و جیهان پڕ بوو لە هارمۆنی و تـەبایی ، هونەرەکەشیان هەمان شێوە بەیان کەری ئەو باوەڕانە بوو کە بەو دیدە دەیانبینی .

هـەمان شـێوە لـە هونـەری یۆنـانی دا سروشـتیان بـە وێنـەی بەسـەلیقە و پـڕ زەوق دەتۆژییەوە ، لەو قۆناغەدا مرۆڤ جوانیی لە گشت شتێکی زیندوودا بەدی دەکرد ئایدیالیانە هەڵسەنگاندنیان دەکرد ... کێش و ئۆرگانی ژیان هەمان چۆنێتی بوو کە مرۆڤ هـەوڵی دەدا لە هونەردا بەیانی بکات .پەیوەندیی نێوان هونەر و ئایین یەکێکە لە بەکۆسپ ترین بابـەت کە پێویستە ڕووبەڕووی ببینەوە لە ئاوڕدانـەوەمان بـۆ ڕابـردوو... چـونکە هونـەر و ئـایین دەست لە دەست دەبینین لە تارمایی و گێژاوی پێش مێژوو دێنە دەرو چەندین سەدە ئـەم دوو باوەڕە لە پەیوەندییەکی لێکدانەبڕاودان . پاشان لە سـنوری پێـنج سـەدەی پێـشوودا یەکەمین نیشانەکانی لێکدابڕان سەرهەڵدەدەن و درزی نێوان هونەر و ئـایین قڵێـشی زیـاتر دەبێت و لە ترۆپکی ڕێنیسانس دا دەگەین بە هونەرێك کە ڕاستەوخۆ ئازاد و سەربەخۆیە و نزرگە و جێگەی ئەوەش تاکێتی هونەرمەنـدە ، لەوێـدا مەبەسـتی هونـەر جگـە لـە بـەیانی ویستەکانی خودی هونەرمەند شتێکی تر نییە .

لە دوای ڕێنیسانسەوە مێژووی هونەری ڕۆژئاوا تێکەڵ و پێکەڵـە و لـە لایـەك وا بـاوەڕ دەکەین کە بەو شاکارە بە ترۆپکی هونەر گەیشتوین ، لە لایەکی ترەوە وا هەست دەکـەین کە چاوگەی هونەر وشکی کردووە ، یا دێینە سەر ئەم گریمانەیەی کە دان بەوەدا بنێین کە هیچ هونەرێکی مەزن یا قۆنـاغێکی هونـەریی مـەزن شـایەنی پەسـەندکردن و دان پیادانـان نییە ، مەگەر لەوێدا کە لە نێوان هونەر و ئایین دا پەیوەستییەك دروست بکـەین و بـاوەڕی پیێ بکەین .

تەنانەت لەو بوارانـەش دا کـە هونەرمەنـدانی مـەزن شـاکارەکانی خۆیـان بـە ڕوویـەکی ڕووکەش و جیاواز لە باوەڕی ئایینی ئافەریدە کردووە" ئەگـەر ووردتـر لـە ژیـان و بـاوەڕی ئـەوان ورد بینـەوە، ڕووبـەڕووی ئـەنجامێکی بـەهێزتر دەبینـەوە کـە سـەلمێنەری بـوونی

هەســتی ئاینییــە لای ئــەوان و خۆنەویــست پاکانــەی ئــاینی لەبەرهــەم و بیریــان دا سەرهەڵدەدات... لە ڕاستی دا ژیانی ڤان کوخ ئەم مەسەلەیە بەزیندوویی ڕوون دەکاتەوە .

لەبەر ئەم هۆکارانە بـاوەڕم وایـە بـەم زووانـە نـاتوانین دان بـە نابـەجێ یـی و نـاجۆری پەیوەندی نێـوان هونـەر و ئـاین دا بنـێین ... چـونکە ئەمـە پەیوەنـدە بـەوەوە کـە ئایـا مەبەست لە هونەر یا ئاین چییە ؟

ڕەگەزی سەرەکی لە دەربڕینی هونەرمەندا یان خـودی هونەرمەنـدا هەسـتیارییە کـە ناتوانین نکۆڵی لێ بکەین ، وە ناشبێت بێ باك بین لەوەی کە ئەو هەستیارییە بـە هـەوەس ناوبـەرین ... لـە هونـەری مرۆڤـی خێڵـەکی یـا سـەرەتاییش دا " نمونـەی ئـاینی مرۆڤـی خێڵەکی هەمان ڕەگەزی هەوەسـە = شـهوة — کـە زەمینـەی دەربڕینـی هونـەری خـۆش دەکات ... لەم قۆناغەدا کۆسـپی کـار جیاکردنـەوەی هونـەرە لـە ئـاین ... چـونکە دابـی هەریەکە لەو دووە داهێنانی ئـەوی تریـان بـە گریمـان کـراوی بـەکار دەبـات ، جـادوگران و ڕاهیبە ئـاینی یـەکان هـەمان هونەرمەنـدانی ئافەریـدەکارن و هونـەر تـەنها بـۆ پاڕانـەوە و دوورخستەوەی گیانەکان بە مانای لقی بوونی هەیە ... ئەو جۆرە هونـەرەش لـە ڕوانگـەی شارستانی دوایی دا گەڵێ سنوردارە و تەنها دامێنێکی سنورداری سـۆزەکان بـەیان دەکـات ... ئەو سـۆزانەش زۆر جـار عاتیفـەی تـرس و دژوارییـە، هەسـتی مـەزنی و شـکۆمەندییە، بەدی هێنەری توانا و سەلیقەی گیانییە کە لە هونەری سەرەتایی دا تەواو بێ شـوێنەوارە " مرۆڤ بە پەیڕەوکردن لە هـەمان هەسـتیاری لـە چـەندین ئاڕاسـتەوە " چـی لـە هونـەری کلاسـیکی دا ، وەچـی لـە هونـەری سـەدەی ناوەنـد دا گەیـشتووە بـە بڵنـدترین ترۆپکـی گەشەی هونـەری . لـە هـەمان کاتـدا ڕەوتـی گۆڕانی هونـەر لـە شـێوەی هونـەری مرۆڤـی سەرەتایی یەوە بۆ شێوەی هونەری مرۆڤی شارسـتانی" گۆڕانکارییـەکی قـوڵ لـە گەشـەی زەینی هونەرمەندا ڕەنگی نەداوەتەوەچونکو ئاشکرا دەبینین ، کە نرخی وێنـەی ڤینـاعی ڕەشپێـست ( وێنـە 24) جیاوازییـەکی ئـەوتۆی نییـە لـە گـەڵ وێنـەی ڕوخـساری ئـادەم بەرهــەمی ریمنــشنایدەر = Riemenschneider ( وینــە 23) وە دەتــوانین بڵــێین هــەمان

توانایان پێوە دیارە لە ڕووی دەربڕینەوە . جیاوازی لە نێوانیان دا بریتییـە لـە بـەیانی دوو پێودانگی جیاواز لە بەهای باڵایی واتە = Transcendentat . مانای وایـە کـە جیـاوازی بـەها لە نێوان هونەری مرۆڤی سەرەتایی وهونەری مرۆڤی شارستانی سەدەی ناوڕاست دا بریتـی یە لە جیاوازی بەهای ئایینی ئەوان " نەك بەهای هونەری یا زەینی یا هەستی .

ئەگەر بمانەوێت چۆنێتی هونەری کۆمەڵگەیەکی شارستانی بـە ناونیـشانی قـوتێکی یـا ئەزمونێکی ئایینی لە بەرچاو بگرین ، ئەوا ئەنجامی سەرسوڕێن لەو پێوانەیەدا بەدی دێـت دەرهەق هەمان کۆمەڵگە.

## 35 – هونــەر و ڕەســەنایەتی مــرۆڤ = مــرۆڤ پــەروەری = Humanism

لەوقۆناغە ئاڵۆزەدا کە بە ڕێنیسانس ناوی دەبەین ، بابەتەکـە هێنـدە جیـاوازی نییـە ، چونکە خاسیەتی ئەم قۆناغە لە لایەکەوە بریتییە لە ژیانەوەی زانستی مرۆڤی کلاسیك کـە ڕاستەوخۆ لە ڕووی باوەڕەوە کافری بەر لـە سـەرهەڵدانی ئـایینی مەسـیحی بـوون – لـە لایەکی ترەوە بریتییە لە ڕوودانێك کە دەشێ ئەو بە مرۆڤایەتی کردنـە بـە خـودی ئـایینی مەسیحی ناو بەرین " بۆ نموونە لە غەزەلیات دا (فرانجلیکۆ دا = Frangelico )و فرانسیـسی پیرۆز ڕەنگی دابووەوە ... بـەڵام لایـەنی کفـری ڕێنیـسانس لـە ڕوانگـەی ئێمـەدا بەهـەمان ئەندازە ئایینی لە قەڵەم دەدرا وەکو ئـایینی مەسـیح ، واتـە هونەرمەنـد بـە بـەیان کردنـی ئایدیاڵی زانـستی کلاسـیك هونـەری خـۆی لـە خزمـەتی بیرێکـی تایبەتـدا تـەرخان دەکـرد ڕاستەوخۆ بە هەمان مانا کە جادوگەری سـەرەتایی و هونەرمەنـدی مەسـیحی بـەدییان دە هێنا.

بەدرێـژایی سـەدەی شـانزەیەم و هەڤدەیـەم زانـستی مرۆڤیـزم = هومـانیزم ڕەگـەزی ئایدیاڵیی خـۆی کـەم کـەم لـە دەسـت دەدا ،شارسـتانیەت زیـاتر و زیـاتر لایـەنی مـاددیی پەیداکردو ئەنجامی کار هونەرمەندی لەسەدەی هەژدەدا ناچار کرد ببێتە خزمـەتکاری ئـەو کۆمەڵگـە ماددییــە یــان خزمــەتکاری خــودی خــۆی ، لــە شــێوەی یەکــەمی دا ڕۆژگــاری

هونەرمەند لە هونەرمەندی سەرەتایی چاتر نەبوو تـەنها جـۆرە ترسـێکی لەگـەڵ ترسـێکی تردا ئاڵوگۆر پیێ دەکرد ، بەڵام شێوەی دووەم ڕاستیی مەسەلەکەی بۆ ئێمە دەخستە ڕوو: ئایا هونەرمەند دەتوانێ لەسەر بنچینەی هەستیاریی خـودی خـۆی بـەبێ یاریـدەی سـۆزی کۆمـەڵ و ئایـدیاڵی بـاو بەرهـەمێك زادە بکـات کـە بتـوانێ لەگـەڵ گـەورەترین ئافەریـدەی هونەری ئایینی دا هەڵسەنگێنرێت ؟

من باوەڕ ناکەم ئەم پرسیارە بە هیچ جۆرێ وەڵام بدەمەوە کە بـاس لـە سـەلماندن و تۆمار کردن بکات ، چونکە ناشێ دوو کەس پەیدا بکـەین کـە دەربـارەی خاسـیەتی باشـی هونەر هاوڕا بن و ڕوانگەیان یەك بێت ، چونکە هونەری ئایینی و هونـەری خـودی ناکرێـت وەك گایەك لە یەکیان جیا بکەینەوە ... لەگەڵ ئەوەش دا باوەڕم وایە کـە دەشـێ بتـوانین دەربارەی یەکێ دوو تێبینی دەرهەق بە هونەر هاوڕا بین، یەکەم " کەم و زۆر ئاشکرایە کـە هیچ هونەرمەندێ ناتوانێ بەگیان و بەدڵ کار بکات مەگەر ئەوەی کە هەست بکات کۆمەڵێك داخوازی ئەون ... ئەم تێۆریی یەی کە دەڵێ هونەر — بەیانی ئەوەیە کە لە ویژدان دایـە — ڕێگەی خۆی بەجێگە یەك ناگەیەنێ ... چونکە دەپرسین ئایا ناوەڕۆکی ئەو ویژدانەی کـە دەبێت بەیان بکرێت خودی ئەو چییە ؟ خەیاڵ پلاوی زەینی نائاگـا ؟ ئـەم وەڵامـە بـە دوا هاتوی ئەو پرسیارەیە . بەڵام بەهای ئـەم خـەیاڵ پـلاوە — ( بـە چـاو نوقانـدن لـە بـەهای وێنەی جوانناسی کە لە نێوان کۆمەڵانی تری هونەردا هەمان هاوبەشە) — لە چیدا یە ؟

ئێمە لە بیناو هەیکەلی زەینی نائنگا زانستێکی هێندەمان لەبەر دەستا نییە، بەڵام ئـەم زەینە بە پێی پێناسی خود . ناتوانێ بەدی هێنەری هیچ یەکێ لـەو بەهایانـەی پەیوەسـت بە ئایدیاڵە گشتییە کان بێت کە ڕووی جیاوازیکارییە لە نێوان مرۆڤـی هاوچـەرخ و نـەژادی سەرەتایی خودی ئەو.

هونەر ڕاگەیاندنی یا بە ئاگا کردنی مرۆڤ بە مرۆڤ ، لەگەڵ ئەوەدا کە سەری پەیوەندیی بە هەستیاریی مرۆڤەوە بەندە و بە یاریدەی هەستیارییەوە یە کە مرۆڤ کار دەکات ، هـیچ بەڵگەیەك لەبەر دەستدا نییە کە بڵێین ئەم هۆکارەی هەست بەهاکان لە نێـوان مرۆڤـەکان

دا ڕانەگەیەنێ ... لەسەر ئەمە وەڵامی ئەو پرسیارەی کە ئایا هونەری مەزن دەتوانێ ئـازاد لە ئایینەکان بوونی هەبێت ، پەیوەندە بە پێودانگی بەهاکانمانەوە... دادگـای کۆتـایی زوو یا درەنگ مەیدانی کۆمەڵایـەتی دەبێـت " چـونکە وا دەردەکـەوێت کـە هـەر هونەرمەنـدێك بیەوێ بە پلەی بـاڵا بگـات " دەبـێ بـە هەسـتی کۆمەڵایـەتیی خەڵکییـەوە پابەسـت بێت. تاوەکو ئێستا باڵاترین شێوەی کۆمەڵایەتی یا هەستی کۆمەڵایەتی هەمان ئایین بووە ، ئەو کەسانەی کە پەیوەندی گریمان کراوی نێـوان هونـەر و ئـایین نـەهی و نکـۆڵی لێ دەکـات " لەسەرێتی هەستێکی کۆمەڵایەتیی دیی هاوشێوەی ئـایین پەیـدا بکـات تـا هونەرەکـەی لـە برەودانی مێژوویی دا بێت لە ئاڕاستەیەکی نائایینی دا.

## 36 – هونەری دێهاتی

لـە بەسـەرکردنەوەی ڕەگـەزەکانی هونـەردا ، دەبێـت نـەك تـەنها هونـەری مرۆڤـی سەرەتایی کە لە ڕوانگەی مێژوویی وە بە ئێمە نزیکترە ، بەڵکو هونـەری کەسـانی سـادەو کەم زانستیش کە بە ( هونەری دێنشین) دەناسرێت بەکەم نەگرین . بەڵام ئەم ناوە بابەتی زۆر بەربڵاو لە خۆی دەگرێت ، لە ئەنجامدا مانا وگرنگیی دێنشین ئەو بەرهەمانـە نییـە کـە لادێی ی یەکانی بە لاسایی کردنەوەی هونەری چـینی شـارەزاترە و کارامـەتر بەدەسـتی دەهێـنن...واتـە مەبەسـت پێـچەوانە کردنـی سـادەی هونـەری کەسـانی پـسپۆڕ و کارامـە نییە...هەروەها ئەو بەرهەمانەی کە کەسانی شارەزا بەهۆی عەشقی سـادەکاری لـە ژیانـدا بەدەستی دەهێنن، بەهیچ ڕوویـەك جێـی مەبەسـتمان نییـە . لەبـەر ئـەوەی بەسـەرنجەوە دەدوێـین دەبێـت بڵـێین: مەبەسـت لـە هونـەری دێنـشین هونەرێکـە یـا بەرهەمێکـە کـە بەدەستی خێڵە سەرەتایی یە کـەم شارسـتانییەکان بـەدی هـاتووە و کـە سـەر بـەخودی ئەوانەو بێ لایەنە لە هەر کارتێکەرێکی دەرەکی و زانستی خەڵکانی تر – یا بەلای کەمەوە بێ بەرییە لە کارتێکەری کۆمەڵگەیەکی دی " شوێنەواری بەربڵاوی وڵاتێك بۆ سەر وڵاتێکـی دی شـیاو دەکرێـت " هەرچـەندە کـە زۆر جـار شـیاو نییـە. هونـەری دێهـاتی خـاوەنی

خاسیەتی هەمە جۆرە ... یەکەم هونەری دێهاتی لـە هـیچ ڕوویەکـەوە ئـەو جـۆرە هونـەرە نییە کە بە داخەوە بە" هونەری جوان = Fine art" ناسراوە.

هونـەری دێهـاتی هەمیـشە هونـەری بـەکار بـراوە و لەوێـدا سـەر هەڵـدەدات کـە مـرۆڤ مەیلدارە ڕەنگی گەش و شـادان سـەرباری شـتومەك و ئامرازەکـانی ژیـانی ڕۆژانـەی بکـات "وەك بەرگ و مێز و کورسی و گۆزە و فەرش و هتد...

کەسانێك کە ئەو هونەرە زادە دەکەن لەو باوەڕەدا نین کـە هونەرەکـەیان چـالاکییەکە بەرێوەبەری دەرونی خۆیەتی ... دووەم ئەم هونەرە مەیلدارێتییەکی سەرسوڕێن لە بـواری ئەبـستراکت دا نیـشان دەدات – یـا لـە بـواری ئەبـستراکتی ئەنـدازەیی دا وەك فەرشـی فینلاندی و گوڵکاری یا گوڵدۆزیی ڕۆمانی و گۆزەگەری پیرۆ –یی .

یـاخود لـەڕووی هاوسـەنگ کردنـی شـکڵەکان و زیـاڕۆیی کـردن لەگـەڵیان دا وەك لـە گۆزەگەریی ئەورووپای ناوەند و پەیکەرە دارینەکانی دوورگەکانی هـاییتی و گوڵدۆزییـەکانی چیکوسلۆڤاکی دا بەدی دەکرێت ... لە زۆر بواردا بۆ نمونە لە بواری هونـەری دوورگـەکانی یۆنان و ئیتالیا دا هەر دوو مەیلدارێتی بە هاوسەنگی بوونیان هەیە.

ڕونکردنەوەی ئەم مەیلدارێتییە تا ڕادەیەك دەتوانرێت لە پیشەسازی و مـاددەی کـاری جوانکاری دا یا ڕازاندنەوەدا بەکار دەبرێ " ببینرێت.

بۆ نمونە هەندێ لە شێوەکانی چنین بە سادەیی بە نەخـشی ئەنـدازەیی دەگۆڕێـت ... سوڕانی چەرخی گۆزەگەری و بەکاربردنی ڕەنگ بۆ ڕازاندنەوەی کەل و پـەلی گۆزەگـەری ، هەمان شێوە دەبنە هۆی بەدی هێنانی نەخشی بازنەیی .

شوژن کاری یا ئاوریـشم دووریـن بـە ناسـکی و لەشـێوەی نەخـشی سروشـت شـێوەدا کارتێکەرییان زیاترە ... بەڵام دووبارەکردنەوەی ڕاستەوخۆی سروشت بەو شـێوەیەی کـە هونەرمەندانی خۆێندکار پەسەندی دەکەن ، لە هونەری دێهاتی دا هەرگیز بەرچاو ناکـەوێت ... ئەمەش وەك ئەمەیە کە لاسایی کردنەوەی سروشت لـە ڕوانگـەی دێهاتییـەکان هـەرگیز بۆ خۆش کردنی ژینگە سودێکی ئەوتۆی نەبێت ، دێهاتی وای بە چـاك دەزانێـت کـە شـتێ

سەرباری ژیانی خۆی بکات نەك ئاوێنەیەك بەرامبەر ڕاستەقینەی درێو دابنێت و لێ یەوە شتەکان وەربگرێت .

خاسیەتی سێ یەمی هونەری دێهاتی خۆپاراستنێتی ... لە نێوان گشت هونەرەکان دا دیاری کردنی مێژووی ڕاستی بەرهەمێکی دێهاتی لەگشت شتێ دژوارترە ، لەم هونەرەدا نەخشی سادە بەدی دێن و سەدەها برەویان پێ دەدەن ( واتە چەند سەدەیەك) زەینی دێهاتی بە پەرۆشی نوێ کردنەوە وە نییە وتەنها دەیەوێت ئەو شتەی کە دروستی دەکات مایەی شادی بێت ، وەك ئەوەی بە ڕوویەکی غەریزی دەرکی بەوە کردبێت کە پێکهێنانی چەند نەخشو ڕەنگێ دەتوانێ هەمەڕەنگیی بێ پایان بەدی بهێنێت .

بەڵام لەوانەیە سەرسوڕێن ترین خاسیەتی هونەری دێهاتی گشتێتی ئەم هونەرە بێت ، وا دەردەکەوێت کە لە چوارچێوەی جیهان دا شێواز و ڕەوتێکی ئەبستراکت و پیشەسازییەك سەرهەڵبدات.

من جۆرە گۆزەیەکم بینیوە کە دەستکردی سامە — ڕەکانە و ئینگلتەرەی سەر بە سەدەی هەژدەیەم — ە کە زۆر بەسەختی دەکرێت لە گۆزەگەری دەستکردی چین و سەر بە سەدەی دەیەم جیابکرێتەوە.

پەیکەرە دارینەکانی نەرویجی لەگەڵ پەیکەرە دارینەکانی بومییەکانی زیلاندی نوێ زۆرلە یەکتری دەچن ... لە نێوان گوڵچنینی ئینگلیزی و گوڵچنینی بولغاریدا و پاشان یونانی دا هیچ جیاوازییەکی بنچینەیی بەدی ناکرێت ... لە قەبرسانەکانی میسردا جل و بەرگی لەلۆکە چنراو کە دروست کراوە دەکرێ وای بۆ بچین کە لە سەردەمی دەسەڵاتی ڤیکتۆریادا لە دێهاتەکانی ئینگلتەرەدا دروست کراوە... ئەوانە نمونەی ڕێکەوتن و دەربارەی ئەم لێکچونە بنچینەی یە جیاوازی کەم و زۆر لە هەندەکیاتیدا " جزئیات "بەدی دەکرێت ... ڕەگەزە گشتییەکانی هونەری دێهاتی ئەم چۆنێتییە یان هەیە کە لە ژێر کارتێکەری مەرجایەتی ناوچەیی و نەریت و ئابوری دا شێوازی هەمە جۆر و جیاواز بەدی دێنن .

هەڵبەتــە پێویــستە لــە چــۆنێتی ئــەو ماددانــەی کــە بــەدی هێنــراون لــە ڕووی باشــەو خراپەیانەوە بەئاگا بین ... فلأنە دێهاتی کە بەچەند جۆری لۆکـەی ڕەنگـین کاردەکـەن لـە ناکاو شکڵی ئەندازەیی تایبەت بەدی دەهێنن ، دەشێ هەمان ئەو شـکڵ و نەخـشانەش لـە چەندین جێگە و خاڵی جیهان دا دووپات بکرێنەوە و بەکار ببرێت بەبێ ئەوەی لە نێوانیاندا کاریگەرێکی ڕاستەوخۆ بەدی بێت ...لێرەدا هونەرمەندی ڕەسەن هـەمان دەزگـای کـارە و ئەم دەزگایەش نەخشەکانی خۆی یا شکڵەکانی خۆی دووپات دەکاتەوە .

کۆمەڵگەناسی ئەڵمانی گوتفرید زیمپر = Gottfried Semper ئەم باوەڕەی بـە ڕادەیـەك لا پەسەند بوو کە بەهۆیەوە بینای تیۆرێکی تەواوی مـادیی دەربـارەی شـوێنگەی شـێوازو جوانکاری دارشت .

خاسیەتەکانی هونەری دێهاتی بەهەر لێدوانێك دەربارەی چی یەتی هونـەر پەیوەنـدیی ڕاستەوخۆ پەیدا دەکەن ... ئەم خاسیەتانە ڕوونی دەکەنەوە کە مەیلی داهێنـانی هونـەری مەیلێکی سروشتییە و لە بوونی کـەم زانـست تـرین کۆمەڵگـەدا سروشـتییە " ئێمـەش ئـەم ئەنجامکارییەمان لە هونـەری بوشمانەکانـەوە بـەدی هێنـا بـوو ، بـەڵام هونـەری بوشمـان بەباشی نیشانی نادات کە هونەر پەروەردە نەبووی دووپات کردنەوەی سروشت نییە ( لـە کاتێکدا کە هونـەری ڕەشپێستان بـە پێـچەوانەوە ئـەوە دەسـەلمێنن) ... ئـەوەی کـە نـا سروشــتییە ئەبــستراکت نییــە یــە ، بــەڵکو ئــەم مەیلدارێتییــەی کــە هونــەری مەکتــەبی (ئەکادیمی) بە وێنەگرتن لەسەر سروشت (واتە کۆپی کردنی سروشت) هەیەتی شـتێکی نـا سروشتییە.

پێویستەئەم خاڵەش سەربار بکەین کە هونەری دێهاتی بەدەگمـەن بـەیان کـەری بـار و دۆخی ئایینی یە، هەڵبەتە لە هونەری دێهاتی دا شتی زۆر هەن وەك قـاپی ئـاوی پـیرۆز یـا شەمایل کـە بـە سـیمبولی ئـایینی جـوان کـراو ... بـەڵام مەبەسـتی بـەدی هێنـانی خـودی بەرهەمەکە هەرگیز زیان لێدان و قوربانی کردن و یا دادانی کەش و موناجات نی یە، بـەڵکو مەبەستێکی سادە و مرۆڤانەیە کە ڕەنگ و بۆیان داوە بە شتی جێ باسیان.

## 37 – هونەری میللی = میسر

ئەو چەند کورتە باسانەی کە لە پەرەگرافەکانی ڕابردودا دەربارەیان دووایـن ، گـشتیان جۆری گشتیی هونەر بوون – هونەری سـەرەتایی ، هونـەری خێڵـە درەنـدەکان، هونـەری دێهاتی ... خاسیەتەکانی ئەم هونەرە تایبەت بە ولأتێکی دیاری کراو یا میللەتێکی ناسراو نییـە ...لەسـەرەتادا لـە ئاسـیا و کریـت و میـسر بـە سـەرهەڵدانی شارسـتانییەتی ئـەمڕۆ ڕووبەڕوو بووینەوە، لەبەر ئەمە سەرەتایی ترین شێوەکانی هونەری میللـی بـە هـەمان ئـەو خاڵانەوە پەیوەندن " بە تایبەتی هونـەری میـسر لـە بـەر بـەردەوامی و بـەهای دەسـەڵاتی دەکرێت بە ناونیشانی نمونەیەك لە هونەری میللی لە پێش چاو بگیرێت .

سەرزەمینی میسر بۆ ماوەی حەفتا سەدە مەرجایەتی ئابوری تایبەتی بەدی هێنا بوو کە شارستانیەتێکی بەردەوام و درێـژ خایـەنی بـە دی هێنـا " هەرچـەندە نـەژادی میـسری دەشێ دووچاری " گۆڕانکاری دەریایی " بووبێت ئەو ڕەگەزە لەم بارەیەوە لەگـەڵ کـۆی ڕەگـەزەکانی تـری مرۆڤایـەتی دا جیـاوازی نییـە و کۆسـپە بڵـێین بـە ئەنـدازەی گـەلێ لـە نـەژادەکانی تـر تێکـەڵ بـە ڕەگـەزی دەرەکـی بووبێـت ... لەبـەر ئەمـە لـە نێـوان کـۆی گۆڕانکارییـەکان دا کـە بەسـەر ڕەگـەزی میـسری دا هـاتووە ، پێویـستە بتـوانین ڕیـشەی چەسپاو ئاشکرا بکەین کە لە کاریگەری چەسپاوی خوێن و خاکـەوە سـەریهەڵداوە. یـاخود ئەگەر ئەم هۆکارە چەسپاوانە دەست نەکەون ، پێویستە گریمانەیەك بەدی بێنین کـە ئـەم چەشنە شوێنەوار و کارتێکەرییە لە مێژووی هونەر دا لابیات یا نەیهێڵێت.

بـەردەوامیی شارسـتانییەتی میـسر بـێ گومـان زادەی هۆکـاری ئابورییـە، بەتایبـەتی ژیاندنەوەی بەروبوومی زەمین لە پـای دەسـەڵاتی نیـل دا... سـنوردار بـوونی ئـەم پیـت و فەڕە و لە هەمان کاتدا بەردەوام بوونی لە تەك ئەو سـێلاّوو جۆگانـەدا کـە لـە وەوە بـەدی دەهـاتن، پایـەداریو بـەردەوامیی لـە ڕادەبـەدەری بـەدی دەهێنـا ... ئـەم پایـەداری و

بەردەوامییە هەم ماددیو هـەم ئـابووری بـوو... بـەڵام لـە ئـایین و هونـەریش دا پێـچەوانە دەبووەوە.

لە هونەری ئەوروپای ڕۆژئاوادا دەشێ کە تایبەتمەندێتی تایبەتی یەك دەیەم لە مێژووی هونەر جیا بکەینەوە، زۆرجار لـە تـەی یـەك سـەدەدا هەڵگەڕانەوەیـەکی تـەواو لـە زەوق و سەلیقەدا ڕوودەدا یا ڕووی دەدا... لە میسردا دەشێ 2000 هەزارسـاڵ تێپـەڕێت و هـیچ گۆڕانکارییەکی بینراو لە شێوازدا نەیەتە کایەوە.

بەڵام لێرەدا بوونیان هەبوو جیابکەینەوە لە یەکتری : یەکەمیان هونەری کاهینەکان یـا ڕابەرە ئایینی یەکان کە بەدەستی توێژێکی تەواو داخراو لەو ڕابەرانە بەدی دەهێنرا.

دووەمیان هونەری خەڵکی کە لە کەناری هونەری کاهینەکان دا بوو، بـەڵام تـەواو ئـازاد لەوان بە دەستی خەڵکی بـەدی دەهـات... جێگـەی داخـە ئـەو بەرهەمـە هونەرییانـەی لـە دەستی زوربەی خەڵکی میسردا ماونەتەوە گەڵ کـرچ و کـاڵن" چـونکە ئـەم بەرهەمانـە بـە پێـچەوانەی بەرهــەمی کاهینــەکان لــە گۆڕســتان و پەرسـتگاکان دا نــەدەپارێزران، بـەڵام دەزانین کە ئەم هونەرە بوونی هەبووە و لەڕووی هۆنینەوە و پاکییەوە لە هونەری کـاهینی چاتربووە... لەسەردەمی توت ئان خـامن دا کـە لـە مێـژووی هونـەری میـسردا قۆنـاغێکی کـورتی ڕۆمانتیـك پێکـدەهێنێ، وا دەردەکـەوێت کـە هەسـتی هۆنینـەوەی غـەزەلیات لـە هونەری عامـەی خـەڵکی دا هەڵمـەتی بردۆتـە سـەر دابـی ئـایینی و لـە ئەنجامـدا هونـەری کاهینی دووچاری دارمان هاتووە.

## 38- هونەری قیبتی

ســەرئەنجام لــە قۆنــاغی قیبتــی دا کــە لــە کۆتــایی ســەدەی چــوارەمی مــیلادی دا دەسـتپێدەکات، هونـەری میـسری لـە دەسـتورو دەسـەڵات و شـێوازی هونـەری کـاهینی ڕزگاری دەبێت، لەو قۆناغەدا ئایینی کۆمەڵێك " واتـە ئـایینی مەسـیحیەت " هێـدی هێـدی بووە سرۆشبەخشی هونەر و خەڵکی و ئەوانی بە قۆناغێك گەیاند کە بەرلەوە هـەرگیز پێـی

نەگەیشتبوون. بەڵام ئەم هونەرە بەوەی کە هونەری مەسیحییە مانای تاکە دەستکەوتێکە لە ژیان کە لە رۆژهەڵات و رۆژئاوادا و بەهەرلایەکی دی دا بڵاوبۆتەوە. دەبینین کە هونەری مەسیحیەتی میسر هێشتاکە میسرییە...

ستیڤان گازلی = Stephan Gaselee لە دوا کتێبدا کە دەربارەی هونەری میسر بڵاوی کردەوە باسێکی بە پیتی دەربارەی قۆناغی قیبتی تێدایە = The art of Egypt through the ages (London, the studio –1931)

لەو شێوە تایبەتەدا کە مەسیحییەت بەخۆیەوە بینی لە میسر وای نیشان دەدات کە ئەو ئایینە راهیبە... راهیبییەتیش هێندە سوورنییە بۆ بەدی هێنانی بەرهەمی هونەری... بەبێ پێوەنان و زیادە رۆیی – گازلی – ئەم قۆناغە بە رووپەکی گشتی بە قۆناغی دارمانی هونەری پێناس دەکات بەم شێوەیە لە دوای پەنجا سەدە وشکی و بێ فەری نامرۆڤانە یەکەمین نیشانەکانی ئازادی لە جوانکاری و خەیاڵ دا" لە پەیکەرە عاجی و قوماشی و کتێبە باوەڕییەکانی قۆناغی قیبتی دا بەدی دەکرێت، مرۆڤ هەناسەیەکی دڵنیا هەڵدەکێشێ.

پەروەردەی تەواوی ئەم مەیلدارێتی یە لە سەردەمی ئیسلامی دا شێوەی وەرگرت کە لە سەدەی نۆیەمدا دەستی پێ کرد... شاری قاهیرە لە ساڵی 969 دا دامەزرا، لەو سەردەمەدا تاوەکو دەستپێکردنی " دەسەڵاتی زەبرو زەنگ " ی هونەری ئەوروپی لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا، هونەری میسری جارێکی تر لە گەشەیەکی بەردەوام و تەواودا خۆی بینییەوە، ئەگەر بڵێین ئەم گەشەو تەواوییە، گەشەیەکی تەواو مەزن بوو دەشێ باوەڕی خودی بکەم، بەڵام هەر لێکۆڵەرێکی خاوەن ویژدان لەسەرێتی یا روانگەی کاپیتان کرسول پەسەند بکات = Captain Creesswell کە لە کتێبی " هونەری میسری بە درێژایی چاخەکان " دەری دەبڕێت.

کرسول دەڵێت " گرنگی نەدان لەبەسەر کردنەوەی بیناکاریی ئیسلامیی میسردا زیاتر لەبەر هۆکاری شکۆمەندی و شوێنەواری دێرینەی میسر بووە، بەڵام کەم بینەر دەتوانێ نەکەوێتە ژێر کارتێکەری جوانیی هونەری ئیسلامییەوە و لە روکەوتی مەزنی بیناکانی

سەدەی چواردەو پانزە، هەروەها شکڵی قەشەنگ و گوڵچنراوی گومەزەکان و ناسکی و سەرسوڕماندنی جوانکارییەکانی سەری نەسوڕمێ. "

لە تەماشای یەکەمەوە وا دەردەکەوێت کە هونەری قۆناغی ئیسلامی هونەری جیهانێکی نوێیەو ناکرێ پەیوەندی بە هونەری میسری کۆنەوە هەبێت. لە پشتەوەی ئەو هونەرە دێرینەدا ئایدیالێکی پڕ هێزو شکۆمەند بوونی هەیە کە هەرگیز لەگەڵ ژیانی خەڵکی سادەدا پەیوەندی بەدی ناهێنێت" هونەری خەڵکیش چونکە لەو ڕووەوە بێ بەهرە بوو هەرگیز لە ئەندازەی جوانی و ڕازاندنەوەزیاتر نابێت، بەڵام ئەو هێزە لە ئەنجامدا کاتێ کە ئازاد بوو پەیوەندی لەگەڵ خەڵکی عەوامدا بەدی هێناو تێکەڵ بە هەستیاریی ڕەچەڵەکیی خەڵکەکە بوو، هونەرێکی بەدی هێنا کە یەکێکە لە بالاترین بەدی هێنانی جوانناسیی مرۆڤایەتی.

## 39- هەڕەمەکان -

هەڕەمەکان ڕووکەشی هەمیشەیی هونەری میسرن" بەڵام ناشێ گومان لە بەهای جوانناسیان بکەین و دوو دڵ بین لێی.

هەرەم شکڵێکی ئەندازەیی سادەیە... دەڵێن هەرەمەکانی میسر بەهۆی شکۆمەندییانەوە، بەهۆی ئەو کۆنتراستەوە کەلەگەڵ دەشتە ڕەنگینەکانی دەوریدا هەیەتی و بە یاریدەی سێبەرو ڕوناکی بەهێزییەوە لەکاتی خۆرەتاودا کە دیاری دەدا نرخێکی یەکجار گەورە بەدی دێنی...

بەڵام گشت ئەمانە هۆکاری پێشنیارین و لە بنچینەدا هونەری نین... واتە پیاهەڵدانی هونەری نین... خودی هەرەمەکان تەواو شتێکی عەقلانین...

هەر شتێکیش کە تەواو عەقلانی بوو ( ئەم ڕەخنەیە ئاراستەی هەندێ جۆری هونەری نوێش دەکرێت ) ناتوانی هەستیاریی جوانناسی بە ڕوویەکی تەواو ڕەزامەند بکات...

چونکە ئەرکی هونەر هەمیشە ئەمە بووە کە زەینی مرۆڤ کەمێ بەرەو لایەکی تری سنوری تێگەیشتن بەرێت...

ئەم — لایەش — دەشێت رۆحانی یا زیاتری یا دەشێ تەنها خەیالی بێت... لە هەر بارێکدا لە خالێکدا زیاتر لە سنوری بابەتی عەقلانی تێ دەپەڕێت. هەڵبەتە مانای ئەم وتانە ئەوە نییە کە هونەر لە سنوری هاوگونجاندن لابدات یان وەك — بیکن — دەڵێت هونەر هەمیشە دەبێت شتێکی نامۆی لە هاوڕێژەی خۆیدا حەشار دابێ...

هونەری بینای گوتیك هونەرێکە کە بالاترین شێوەی خۆی بە یاریدەی یاسای ئەندازەیی بە هەمان وشکیی یاسای زاڵی ئەندازەیی هەرەمەکان بەدی دێنێ " بەلام لە هونەری گوتیك دا ئەندازە گیری خزمەتکەری هونەرە نەك کارەکەر .

## 40 — پەیکەری میسری

پەیکەر تاشی میسری (وێنە 26) بالاترین هونەری میسری دێرینە ، بە تایبەتی لە قۆناغی دەسەلاتداریێتی کۆن دا دەبینین کە هەستی سروشتی و قەریحەی جوانناسی پەیکەرتاش سەبارەت بە بیناکاری ئەو قۆناغە و قۆناغەکانی دوایش ڕۆڵێکی گەلێك بالاتری هەیە .

بەلام لەم هونەرەش دا جارێکی تر چیەتییەکی بێ گیان یا ڕاوەستاوە = جمود — لەو هونەرەی میسردا ئاشکرا دەبینرێ . ئەو بێ گیانییەش لە پەیوەندیدا بە چییەتی گیانیی هونەرەوە شایەنی تۆژینەوە نییە ... بەڵکو زیاتر پەیوەندە بەو مەرجایەتییەوە یا بەو داواکارییە هونەرییەوە کە لە ولاتانی تردا بە ئەندازەی فەرمان و دابی کۆمەلایەتی گۆڕان و ئالوگۆڕ لە خۆ دەگرن .

ئەم مەرجایەتییە یا بڕیارە هونەریانەی کە خۆی بە سەر هونەری میسری دا سەپاندووە یاخود لە ئاتاجی پیشەسازییەوە سەر هەڵدەدەن — یان لە ناتوانایی هونەرییەوە یە " واتە نەتوانینی ڕەنگدانەوەی بابەتی عەینی بەو شێوەیەی کە والایە .

نمونـه لـەم مەرجایـەتی و برپـارە هونـەری یانـەی جـۆری یەکـەم ، هۆکارێکـە کـە لـە پەیکەرسازی دا بەکار دەبراو دەبوایە بەو گڵەی پەیکەر ساز بەکاری دەبرد کێشی بەشی سـەرەوەی لـەش لەسـەر شـتێك دابنـێن وەکـو پاڵپـشت . ئـەم پاڵپـشتە لەسـەرەتادا دەستەیەك قەدی یـا لقـی پـاپیرۆس بـوو (کـە پـێ دەچـێ مەبەسـت لـە بـەکاربردنی لقـی حەیزەران بێـت ) کـە پێکـەوەیان دەبەسـت و ڕوویـان بـە گـڵ دادەپۆشـی ، چـونکە ئـەم قەدانەی پاپیرۆس گەلێ مەتین و بەهێزن .

لە پاشان دا کاتێك پەیکەرەکانیان لـە بـەردیش دەتاشـی ، دیسانەوە بـردەی هـەمان تەرزی بەکاربردن بوون کە پێویست نەبوو پەیکەر لەبەرد بتاشن .

بوونی دیاردەی لەو جۆرەش دەشێ بـۆ دە تـا وەکـو بیـست سـاڵ یـا یـەك دوو پـشت شایەنی تێگەیشتن بێت ، ئێمە لـە شارسـتانیەتی خۆمـان دا لـەم جـۆرە کـورت و درێـژەی قۆناغی بەکاربردن شـکڵ و دوپاتبونـەوەی خـاوەن نمونـەین ... لـە بنـی پایپـە تەختـەیی یەکان دا ( واتە پایپی جگەرە کێشان) کە زۆر دێرینن قـولاّ یـی یـەکی یـان بـەرزایی یـەکی قۆقزی ناپێویست بوونی هەیە و یادگاری سەردەمێکە کە پایپیان لە گڵ دروسـت دەکـرد ، وە لە پایپە گڵ — ییەکان دا ئەو جۆرە قۆقزی و بەرزییە بۆ پایپ پێویست بوو.

بەڵام لە هونەری میسری دا ئەوە زیادانە هەزاران ساڵ بەردەوام بوون . نمونەی جۆری دووەم لە داواکاری و مەرجایەتی دانانی چاوی تەواوە لەو وێنانەدا کە نیولا کێشراون ( واتە لە بری ئەوەی چاو لەو دۆخە دا نیشان بدەن کە لەسەر لا دەردەکەوێت ، وانیـشان دەدرێ کە لە پێشەوە دەبینرێ ) ، ئەم مەرجایەتی داواکارییە لە وێنەکێشانی مرۆڤی سەرەتایی دا دەبینین " بەڵکو دەشێت مرۆڤی سەرەتایی بە ڕوویەکی غەریزی مەیلدار بووبێـت شـێوەی مرۆڤ بەو چۆنێتییە نیشان بدات " چونکە وێنەکە بەو شێوەیە حاڵەتێکی زیندووی تایبـەت نیشان دەدات .

بەڵام لای یۆنانییـەکان ئـەم مەرجایەتییانـە نیـازە گیانییـەکانی قۆنـاغێکی شارسـتانی لەوانەدا بەدی دێنێ و لەهەمان کاتدا ئەو نیازە لای میسرییەکان هەمیشەیی = ابدی— بوو.

## 40 – یەکەم : هونەر بەر لە کریستۆف کۆلۆمب –

لە پێش گشت قۆناغە مێژوویی یەکانی هونەردا ، هونەری ئـەمریکی ، دێـرین تـرین لـە گشتیان پر نهێنی تر و دەگمەن ترە ... دەتوانین بڵـێین کـەمتر لـە کـۆی هونـەرەکانی دی ناسراوە و کەمتر تێی گەیشتوین .

لە وڵاتی ئێمە نمونەیەکی دەگمەنمان بە دەست گەیشتوە ، هیچ یەکێ لەو نمونانەش بەرهەمی بەشکۆ نین و گەلێ لایەنی ئـەو هونـەرەش نەناسـراو ماوەتـەوە ، چـونکە کـەل و پەلە هونەرییەکان لە ناو چوون ( بۆ نمونە پەڕی ڕەنگین لـە زەمینـە ڕەسـەنەکانی بـەیانی هونەری بـوو و پـەڕی باڵنـدە شـتێکە ئاسـان و زوو لـە نـاو دەچـێ و وون دەبێـت ) یـان داگیرکـەرە ئیـسپانییەکان کـە درنـدەترین وێرانکـەری مێـژوو بـوون گـەلێ لـەو شـتە هونەرییانەیان لە ناو برد .

ڕەوتی گەشەی مێژوو یی فەرهەنگی ئەمریکا بەر لە دۆزینەوەی ئەو کیشوەرە هێـشتا ئـاڵۆز و نادیـارە – ئیروین بـولاك = Irwin Bullock – پێمـان دەڵێـت کـە ئـەم سـەرنجە شایەنی بیستنە ، چونکە مرۆڤ یەکەم جار لە ڕێگەی دەرگای – برینگ – ەوە لـە بـاکوری ڕۆژهەلاتی ئاسیاوە پێی نایە کیشوەری ئەمەریکا – وەو لەوێوە کەم کـەم بـەرەو خۆرئـاوا کۆچی کردووە ... ئەو شارستانیەتانەی جـێ باسـی ئێمـەن لـە دوو ناوچـەدا بـەدی دێـن – مەکـسیك – و سـەر زەمینـە دراوسـێ کـانی ، واتـە ( نیکـاراگوا ، کوسـتاریکا ، پانامـا ) و تەنگەبەری کەنارەکانی باشوری ئەمریکای خوارو ( کۆلۆمبیا و پیرۆ ) .

ڕێکخـستنی ڕووداوەکـان ڕاسـت مـەعلوم نـین ، بـەڵام لـە قۆناغـەکانی مەکـسیك دا " سەردەمی دێرین " سەر بە ( 500 ) ساڵ پ. ز – دیاری دەکرێت ... لەم ناوچەیەدا خێڵ و زنجیرەی دەسەڵات بە خێراییـەکی سەرسـوڕێن و یـەك لـە دوای یـەك سـەریان هەڵـداوەو ڕوخاون " بەڵام کەمێك بەر لە زایین خێڵی مایا سەری هەڵدا کـە بـە ڕای بـولاك خێڵێکـی " زۆر بیرەوەر( بوون )، خاوەن ئایین و خاوەن ڕۆژژمێـر و ئەسـتێرە نـاس بـوون – زانـستی

فراوانیان لە بواری ژمارەو بیرکاری دا هەبووە. " بەڵام ئەم خێڵە"بیرەوەرە " هەرگیز لە ئەلف و بێی فۆنەتێك — یان واتە زمانەوانی— یان بۆ خۆیان دانەڕشتووە ...نە خاوەنی تاقن نە خاوەنی سادەترین ئامراز.

لە باکوردا چەند سەدەیەك دوای ئەوە شارستانیەتێکی تری بە دەسەڵات بەناوی — ئینکاها —بەدی هات و هێشتا لەو پەڕی کەماڵی دا بوو کە ئیسپانییەکان لەناویان برد .

ئەوەی لە ڕەوتی مێژوویی دا شایەنی سەرنجە بریتییە لەو پرشنگەی کە مێژووی بنیاتی هونەر ڕۆشنی دەکاتەوە ، وەك ڕای خودی باوەڕ ناکەم کە کارتێکەری دەرەکی بە هیچ ڕوویەك وەڕو نەخرێت — ئەو دەفرانەی لەبەرد تاشراون لە مەکسیك بەدی هێنراون کە زۆر لە کاسەی چینیی ( قۆناغی چو) = Chou دەچێت ... بەڵام ئەم کارتێکەرانە گەلێ دەگمەن و بە ڕێکەوت ڕوویان داوە .

ئەوەی لە هونەردا والآیە لە پێش دۆزینەوەی ئەمەریکا وە ، بریتییە لە مەیلێکی تەریب— ی کە مرۆڤ هەیبووە بۆ داهێنانی هونەری کە دەشێ بۆ پێوانەکردن لەگەڵ گەشە کردنی هەمان مەیلدارێتی لە شارستانیەتەکانی دا لەپێش چاو بگیرێت ، بەتایبەتی دژێتی ئەم هونەرە بە شێوازی هیومانیزم — ی خودی خۆمان گەلێ فێرکەرانەیە .

هۆنەری دواییینی — پیرۆ — تایبەتمەندێتی هەیە ، بەڵام بەڕوویەکی گشتی دەتوانین بڵێین کە لە تەواوی هونەری ئەمریکای دێرین دا هیچ ناوەڕۆکێکی بیری پەروەردە نەکراوە، ئەم خاڵە دەشێت هۆکاری ئەم هۆیە بێت کە شارستانیەتی ئەمریکا نەیتوانیوە ئەلفوبێی فۆنەتیك یا لە ڕاستی دا هیچ جۆرە نووسینێ بەدی بهێنێت ... تا ئەو ئاستەی بزانین ڕوونی بکەینەوە خەڵکی ئەمریکا هیچ دەزگایەکی بیری بنیاتنراوی نییە لەسەر بۆچوونی گشتی یا نەیبووە .

ئەستێرە پێوانەکاری ئەوان ڕوونی دەکاتەوە کە توانیویانە بە ژمارە کار بکەن . زانستیان هەبووە بەڵام فەلسەفەیان نەبووە ... شتەکانیش بە شێوەی بیرکردنەوە و سیمبول دەرنەبڕدراون ، بە ڕوکەشیش ئایینەکەیان بنیاتێکی ئاڵۆزی لە دەستورو قوربانی

دان هەبووە و بەهیچ شێوەیەك سەرو سروشتی  و خواوەندانە نەبووە ... تەنانـەت خـودی خۆیان بە شێوەی ئایدیا و هێمای تایبەت وەڕو نەخستوە ، لـە گـشت جێگەیەکیـشدا نـەك سەبارەت بە ژیانی مرۆڤ ، بەڵکو بەرامبەر بە هەرجۆرە سۆزێکی یـا هـە ستیارییەکی مـرۆڤ تەواو بیٚ گرنگی بوون و دەربەستی نەهاتوون .

لە هونەری — بومییە— کانی ئەمریکادا بابەتی شەهوانی یا هـەر شـتیٚ کـە هاوشـێوەی ژن و شوکردن بێت بوونی نەبووە یا بەدی نەکراوە، لە کاتێکدا کە ئـەم جـۆرە بابەتانـە لـە هونـەری ئـەوروپادا ڕۆڵێکـی تـەواو گـەورەیان لـە ئەسـتۆگرتووە. لـە هونـەری بومیـان—ی ئەمەریکادا بابەتی تایبەت بە عەشق بوونی نییە ، بەڵکو زۆربەی بابەت لە ترس دەدوێـت " و هونەریش لە گشت جێگەیەك سەودای شنەی مەرگ دەکات  نەك ژیان.

ئەم هۆکارانـە دەبنـە ئـەو هۆیـەی کـە هونـەری کـۆنی ئـەمریکا چـیەتییەکی زینـدووی هەبووبێت بەڵام ئەم خاڵە پەیوەندی نییە بە چۆنێتییە جوانناسییەکانییەوە.

ئەگەر مەیدانی کار بەهێزی هەستەکانمان بدەین پێویـستە گـویٚ ڕادێـرین کـە هونـەری شارستانیەتە بومییەکانی ئەمریکا لە ئەژماردەی جوانترین ئەو هونەرانەن کـە تـاکو ئێـستا بەدەستی مرۆڤ بەدی هاتووە .

ڕۆجەر فرای جارێکیان دەربارەی پەیکەرێکی کۆنی — مایا — Maya — ی کە لە کۆپـان = هینـدۆراس — دۆزراوەتـەوە و ئێـستاکە لـە مۆزەخانـەی بەریتانیایـە  ووتـی : ( مـن بـیٚ گومانم ) کە لە نێوان گەورەترین  بەرهەمی پەیکەر سازانی ئـەوروپادا بتوانرێـت بەرهـەمێك بەدی بهێنرێت کە لە ڕووی هاوڕێژەی نێوان هەسـتیاری و ئەنـدازەگیری و لـە ڕووی توانـا و دابەشی پێوانەی سروشتی و لە هەمان کاتدا بـە ئاگـابوون لـە یەکـەی وێنـەیی و بـەکورتی لەگـشت ڕوویەکـەوە تـەواو بـیٚ خەوشـە و بـیٚ نمونەیـەجا ئەمـەش مانـای وایـە هـیچ پێوەدانگێکی هونەری هاوتای ئەو پەیکەرە نابێت  . "

پەیکەری سیرامیکی سەر بە تاراسکان = Tarascan ( مەکسیکی ڕۆژئاوا) کە لە (وێنـەی 29 ) دا دەبینریٚ، بەرهەمێکە لە شێوازێکی تر، بەڵام لەم بەرهەمەدا هەمیسان ڕووبـەڕووی

بەیانی قەریحەی سروشتی زۆر بالآ دەبینەوە، جوانی و سەلیقەی کار لە تەواوی ئەو بەرهەمەدا دیارە و حاڵەتێکی زیندووی سەیری پێ بەخشراوە.

ڕووپۆشە بەردینەکانی ئازتك Aztc ( کە دەڵێن گوایە پێستی قوربانییەکان کە مرۆڤ بوون بەسەریان دا دراوە ) تا ڕادەیەك جێگەی باوەڕ نین، چونکە ترسێ کە ئەو ڕووپۆشانە بە مرۆڤی دەبەخشن سەرسوڕێنە... بەڵام دیسانەوە دەبینین کە هەستیاریی بەرجەستەییان لە دەگمەن ترین و جوانترین جۆرە کە تاوەکو ئێستا بەدی دەکرێت.

بەرلەوەی ئەو جۆرە هونەرە بە ناوی هونەری سادیزمی = ئازاردەر — پاپەند بکەین" چاترە لەخۆمان بپرسین ئایا ئەگەر بومییەکی مەکسیکی یا ئینکایی لە سەدەی شانزەیەمدا تابلۆکانی لە خاچدانی مەسیح یا ئازاردانی شەهیدەکانی ڕێگەی مەسیحییەت لە سەرانسەری هونەری ئەو سەردەمەی ئەوروپادا ببینێ، دەبێ لەبەر خۆیەوە بیر لە چی بکاتەوە؟

ڕاستی ئەمەیە کە هونەرمەندی مەسیحی هۆکارێکی سەرباری هونەری ئەوروپی کردووە کە لەهونەری ئەمەریکای کۆن دا بوونی نییە ئەویش ڕاستی نواندن و ترسێنەرە (روخسارە گرژبووەکانی وێنەکان " تاجی دڕکینی لەسەر سەری مەسیح Ecce Homo "، برینی خوێناوی وێنەکان " تەعزێباری مریەمی پیرۆز بە دیار لەشی عیساوە = Pieta "، سکی دڕاوو مەمکی بڕاوی قەدیسەکان ).

سادیزمی مەکسیکی بەهێزە، بەڵام لەهەمان کاتدا ڕاست و کۆتدارە یا پاپەندە... مەیلدارێتی جوانناسی زاڵە بەسەریدا، دەشێ لەبەر هەمان هۆش زیانەکانی پاداشت دراوەتەوە... بەرلەوەی سادیزم لە هونەردا دادگایی بکەین، پێویستە دەربارەی سادیزمییەتی مرۆڤ کەمێ زیاتر زانستی چنگ بخەین" ئێمە دەزانین کە لە کۆی ئەفسانەو فۆلکلۆردا ( بۆ نمونە لە ئەفسانەی پەرییەکان دا ).

سادیزم یەکێکە لە ڕەگەزە سەرەکییەکان، هەرچەندە دەشێ ڕەنگدانەوەی لە هونەردا دوچاری هەراسمان بکات، پێویستە بە ئاگابین لەمەی کە ئەگەر ئەم مەیلدارێتییە لە

هونەردا رەنگ نەداتەوە — واتە نەگۆڕێت بۆ پارچە بەرد و مادەی جیاواز بەچی شێوەیەك ئەم سادیزمە وەڕودەکەوێ؟ هونەر دەشێ سادیزم بێت... قوربانییە ئاینییەکان دەشێ سادیزمی بن، بەلأم کەسانێك کە ئەم مەیلدارێتییە سادیسستییەی خۆیان بەو شێوەیە دەردەبڕن، دەشێ کەسانی پڕسۆز و میهرەبان بن !

ئێمە دەربارەی ژیانی رۆژانەی شارستانییەتەکانی دێرین کەمتر لەو بارەیەوە بە ئاگاین و بە پێچەوانەوە دەربارەی ژیان و تەرزی نەرێتی شارستانیی خۆمان بە ئاگاین و زۆرزانین، بۆ دەتوانین دەرهەق بە مەسەلەی سادیزم لە هونەرەکەمان دا بگەینە بڕیارێکی دیاری کراو.

لەبەر ئەمە گەیشتن بە بەیان و وەڕوخستنی بێ مەبەستانەی هونەر ( یان بەڕای ڕۆجەر فرای " پەسەند کردنی حاڵەتی خرۆشێنەر " ) لای گشت کەس شایەنی پەسەند کردن نابێت.

بەدترین یا ناجۆرترین دوژمنی هونەر هێزی تەداعی کردنە لە مرۆڤ دا بەلأم ئەگەر لە هونەردا سەرگەرمی دوپاتکردنەوەی تێرو تەسەلی غەریزە سەرکوتکراوەکان بین... پاشان ئەگەر ئەم غەریزەو وەڕوخستنانەمان سۆز و هەستەکانی هونەرمەند لە وێنەو ماددەی کاردا وەڕوبخەن" — ئەوا لەم شێوەیەدا چێژێکی بێ پایان لە هونەری ئەمریکای دێرین دەبەین.

## 41– شوێنگەی باسە مێژوویی یەکان

سەرچاوەکانی هونەری مەسیحی ئاسان دەست ناکەون... دەسەلأتی یۆنانییەکان لە ڕۆژهەلأتەوە بەسەر ئێران و هیندستان و چین دا دەست پێدەکاو لە ڕۆژئاوادا بەرەو ئیتالیا و ئیسپانیا و ئەڵمانیا و ئینگلتەرە دەگات... هەروەها دەزانین کە ناوچەکانی باکور هونەرێکی تایبەت بە خۆیان هەیە کە سکوتلەندە و سکەندیناڤیا تا سیبریا دەگرێتەوە.

ناوچەکانی باکوور دەشێ بە ڕوسیای باشوور ئێران و ئاسیای بچوك دیاری بکەین. ئاسیای ناوەڕاست شوێنگەی بنەڕەتە کە هونەری مەزنی ڕۆژئاوای لێوە دەست پێدەکات... ئەم هونەرە لە بێزەنتییەکان–ەوە سەر هەڵدەداو بە ڕێنیسانس کۆتایی دێت و لە دەوروبەری سەدەی دوانزەیەمدا بەپەڕی توانای خۆی گەیشت.

هونەری مەزنی ڕۆژهەڵاتیش لە هەمان ڕووەوە سەری هەڵداو لە ئاڕاستەی بنچینەیی دا جیاوازە بە هونەری ڕۆژئاوا.

لە ڕاستی دا جیاوازیی هونەری رۆژئاوا و ڕۆژهەلآت بەهەمان ئەندازەی جیاوازی نێوان ئایینی مەسیحییە لەگەڵ ئایینەکانی دیی ڕۆژهەڵاتدا.

دەتوانین بڵێین کە رەوتی دەسەلآتی هونەری بەهەر جێگەیە گەیشت" ئایینەکانی ئەو ناوچانە ئەو دەسەلآتە هونەرییانەیان وەرگرت و لەگەڵ نیازو مەبەستەکانی خۆیان دا هاوتایان کرد.

لە هونەری چینی و هونەری ئەوروپی دا ڕووبەڕووی زنجیرەیەك بابەتی لێکچو دەبینەوە، ئەم لێکچونەش یا مەرجایەتییە هاوبڕیارانە گشتیان لە یەك چاوگەوە سەرچاوەیان وەرگرتووە، بەلأم بۆ نیازو مەبەستی جیاواز بەکار هاتوون و بە یاریدەیانەوە هەستی جوانیی ئێمەش لە گشت بوارەکان دا هەمان شێوە لێکچووە.

## 42– هونەری چینی

مێژووی هونەری چین یەکلاترو بگرە بەردەوام تریشە لە هونەری میسری، لەو ڕووەوە کە هونەری چینی زیاتر هونەرێکی میللییە و مێژووی دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری سەدەی سیانزەیەمی ب. ز، لەگەڵ ئەوەش دا کە بە قۆناغی گەلێ تاریك و نادڵنیا دا تێپەڕیوە، بەلأم ئەو هونەرە تاوەکو ئەمڕۆکە بەردەوامە و هیچ سەرزەمینێك لەم جیهانەدا لە روانگەی چالاکیی هونەرییەوە هێندەی چین دەوڵەمەندو چڕ نییە... بە ڕەچاوکردنی گشت لایەنێکی هونەری هیچ ولأتێك بەرهەمی بالأی وەك بەدەستهێنراوی هونەری چینی نییە.

دیارە هونەری چینی خاسیەتی خۆی هەیە، بەو بەڵگەیەی کە تاوەکو ئێستاش لـە ژێـر لێکۆڵینەوەدایە... هونەری چینی هەرگیز لە بـواری بـەدیهێنانی بەرهـەمی مەزنـەوە بـەدی نەهاتووە... چونکە بیناکاریی چینی هـەرگیز پێوانـە ناکرێـت بـە بیناکـاری گوتیـك یـاخود یۆنانی... لە گشت هونەرەکانی دی دا بە تایبەتی لە وێنەکاری و پەیکەرتاشی دا" هونـەری چینی نەك جارێك بەڵکو چـەندین جـار لـە ڕووی جـوانیی وێنـەیی یـەوە تـاوەکو دوا پلـەی بۆچون لە کەماڵ نزیك بۆتەوە.

لای کەسانی سادەی ڕۆژئاوایی، هەمیشە ڕۆژهەلأت سەرزەمینی پڕ نهێنی بووە، لەگەڵ ئەوەدا کە ئەمڕۆکە هۆکاری ڕاگەیاندن و پەیوەنـدی نـوێ و ئـامرازی وێنـەگرتن و پـەردەی سینەما دیاردەکانی شارستانییەتی ڕۆژهەلأت بە ڕۆژئاوایی یـەکان ئاشـناتر دەکـات، بـەلأم گیانی ئەم شارسـتانییەتە هێنـدە نامۆیـە لامـان کـاتێ کـە دەربـارەی شـتێك بـە تایبـەتی دەربـارەی لایـەنی گیـانیی "ڕۆحییـان " دەتۆژینـەوە" وەك دەربـارەی ئـایینی بـوزایی یـا فەلـسەفەی تـاو، بەگـشتی دێینـە سـەر ئـەم ڕایـەی کـە لـە دەرەوەی ڕووداوەکـان دا بمێنینـەوە... دەشـێت بابەتەکـە هاوتـای بـیرو ڕوانگـەمان بکـەین، بـەلأم لـە بنـچینەدا تەماشاکەری بە خرۆشی تـەرزێ لـە ژیـان و بیرکردنـەوەین کـە لـە توانـاو درکانـدنی ئێمـە بەدەرە...

بەلأم کاتێك ئاشنایەتی لەگەڵ بابەتە عەینییە ماددییەکان دا وەك بەرهـەمی هونـەرییان پەیدادەکـەین" لــە جـوانی و ســەلیقەی پەیکەرتاشــی و گۆزەگــەری و وێنــەکارییان ورد دەبینەوە" ئیتر ئەو کەم و کوڕی و خـۆ بەکـەم زانینـە واز لێـدێنین و هەسـت دەکـەین کـە هونەر زمانێکی جیهانییە و ڕاستەوخۆ گوزارەی هەستەکانمانە... پێویـستە لەسـەرمان کـە هونــەری ڕۆژهــەلأت بەهــەمان ســادەیی هونــەری شارســتانییەتی خۆمــان بــدرکێنین... دەربارەی هەمەیی هونەر کەسانێکی زۆر هەن فەلسەفە لێدەدەن تاوەکو ئـەو هەسـتیارییە دڵنیاو سادەیە ڕەوان و پڕ هێـز بکـەن... بـەلأم زیـاتر لـە سـەدەی هەڤدەیەمـەوە تـاوەکو

ئەمرۆش جوانیی هونەری ڕۆژهەلأت بەگشتی لە نێوان خەڵکی دا ناسراوو بلأوە و بێ بـەری نییە لە سرۆش و بەهرە بەخشین بە هونەرمەندان و پیشە گرانیش...

بەلأم گومانی تیادا نییە کە ئەو نەریتە باوەی ڕۆژهـەلأتیان بـە هەڵەداچـونێکی موتڵـەق درکاندووە دەربارەی هونەرەکەیان... ئەو دەستورە ڕەوانە نەك تەنها دیاردەیەکی تەواوی هونەری ڕۆژهەلأتیان دووبارە کردۆتـەوە" بـەڵکو بـەدترین قۆنـاغ و بـەدترین شـێوازی ئـەو هونەرەیان بۆ ڕاهێنان و ستایشی خۆیان هەڵبژاردە کردووە.

ئێستاکە کەم کەم دەتوانین ڕوونی بکەینەوە کە بنچینەی باشترین تـەبایی ئەمەیـە کـە لە چەشەو سەلیقەی هونەری ڕۆژهەلأتدا خراپ لە باش جیا بکەینەوە... واتـە بـە یاریـدەی زەوق و سەلیقەی خودی خۆیان...

لەبەر ئەم هۆیانە لە مۆزەخانەکانمان دا بابەتی پۆل کراوو جوان کراوو ڕازێنراوە" کە لە باوانمانـەوە ماونەتـەوەو جـێ پەسـەندی ئـەوان، دەیانخەینـە لاوە یـا لەژێرزەمینـەکان دا حەشاریان دەدەین و لە جێگەیان دا نمونەی ڕاسـتەقینەی هونـەری ڕۆژهـەلأتی دەکـڕین و دەیخەینە بەر چاوان.

بەلأم هونەری ڕۆژهەلأت ڕازەکانی خۆی هێـواش بـلأو دەکاتـەوە و دەتـوانین بڵـێین لـە پێناوی ئەوەدا کە مرۆڤ ئـەم بەرهەمـە هونەرییانـە بـە ڕوویـەکی تـەواو بـدرکێنێت، دەبێـت چاوێکی بخاتە گەڕ و بە تەماشایەکی نوێ بڕوانێتە جیهان... لەبەرئەوە دەتوانین بێ زیادە ڕۆیی هیچ هونەرمەندێکی ڕۆژهەلأت لە ڕوانگەی ئێمەوە ناڕوانێتە جیهان... بۆ گەیشتن بـەم جێ سەرنجە دەتوانین لە دوو ئاست و لاوە لە هونەری ڕۆژهەلأت نزیك ببینەوە" یەکـەمیان و لەوانەیـە دژوارتـرین ئاسـت یـا ئاڕاسـتە ئەمـەبێت کـە هونـەری ڕۆژهـەلأتی هونـەرێکی پیشەسازییە.

هەڵبەتە وێنەکێشی ئەوروپاییش پیشەی تایبەتی خۆیان هەیە، هەرچەندە لە ڕوانگـەی یەکدەستی و مێژوویی یەوە بە پـای پیـشەسازیی هونـەری چـینی ناگـات، فێربـوونی ئـەم پیشەیەی هونەرە کارێکی دژوارە... چونکە ئەم فێربوونە پێویـستی بـە بەدەسـت هێنـانی

زانستە دەربارەی تیۆری ڕەنگەکان و تێکەڵ کردنیان و زەمینەسازیی تابلۆکاری و بەکاربردنی فڵچە — و بەکورتی پێویستی بە فێربوونی زۆر شتی دژوارە لە بواری زانست دا.

کەچی بە پێچەوانەوە پیشەی هونەرمەندی چینی بە ڕوویەکی سەرسوڕێن سادەیە...

تەنها مەرجی کارکردن و فێربوون بە یەك ڕەنگ و یەك فڵچەیە... بەڵام ئەو فڵچەیە بە لەبارییەکی ئەوتۆو ئەم ڕەنگە بە سەرنجێکی هێندە ورد بەکاردەبەن کە لە وێنەکاریی چینی دا لە پاش چەندین ساڵانی دورودرێژ بوونە شاگردی و مەشق کردن دەتوانرێت بە پایەی مامۆستایی بگات.

وەك گشتمان دەزانین چینییەکان بە فڵچە دەنووسن، فڵچەش بە ئەندازەی قەڵەم لە دەستی ئێمەدا ئاسان بەکاردەبرێت لایان...

یەکەمین خاڵ کە پێویست دەکات دەربارەی وێنەکێشان فێری بن ئەمەیە کە ئەم وێنەکێشانە برەوە بە نووسینی ڕێنووسی چینی... لە ڕوانگەی کەسێکی چینی دا دەشێت تەواوی چییەتی جوانی لە وشەیەکی خۆش یا جوان نووسراودا بەدی بکرێت، وەئەگەر کەسێ بتوانێ خۆش نووس بێت، ئەنجام دەتوانێ ببێتە وێنەکێشێکی باشیش.

گشت هونەرمەندانی قۆناغی کلاسیك هونەرمەندی وێنەکاری هێڵی بوون، چونکە هێڵەکە شێوەی بنچینەیی وێنەکان و جوانیی لای خۆش نووس وەڕودەکەوێت کە شایەنی چێژ بەخشین و داوەری کردنە و ئەوان زادەی دەکەن.

هەمان شێوە کە ئێمە وای ڕەچاو دەکەین کە دەتوانرێت کەسێتی خەڵکی بەهۆی دەستوخەتیانەوە بناسرێت، چینییەکان بە زانست و کاری زۆر توانای هونەرمەند و کارامەیی ئەو بەهۆی پاکیی هێڵەوە یان لەڕووی توانای بێ پایانی هێڵەوە دەستنیشان دەکەن کە ئەو دەینوێنێ.

تا ئەم ئاستە درکاندنی ئەم خواستە دەربارەی وێنەکێشان نابەجێ نییە — بەڵام پێویستە لە هونەری وێنەکێشانەوە بچینە سەر هونەرەکانی تری وەك پەیکەرتاشی و

گۆزەکـاری‌و قاڵبکـاری و ڕەنـگ کـاری — و چـەندان پیـشەی دی کـە لـە هەریەکـەیان دا ڕووبەڕووی چۆنیەتییەکی پیشەیی دەبینەوە لـە ڕووی چـۆنێتی هێڵـەوە کـە بـە سـەرنجی وردەوە کەسێتی هونەرمەند پێچەوانە دەکاتەوە...

بۆ نمونە لە گۆزەکاریدا واتە هونەری سیرامیك —دا ئەو چۆنێتی یە لـە هێڵـی دەرەکیـی پارچـەیەکدا بـەدی دێـت و لـە هاوگونجانـدنی دا بـەو هێڵـە قـەبارەو گـەورەیی پارچـەکە پێچەوانە دەبێتەوە... کاتێك کە قوڕ لەسەر چەرخی ژێر دەستی گۆزەگەر خول دەخـوات، هەستیاریی ئەو بە هەمان تواناو جوانییەوە بەیان دەکات کە فڵچە لە دەستی وێنـەکێش دا بەیانی دەکات... نەك هێڵێکی خام و بێ گیان بەڵکو هێڵی پاك کە ئاتاجی بەرهەم و هەوڵی چەندین سەدەی پێشینە.

ئەمە لە بارەی بابەتی نزیك بوونەوە بە هونەری پیشەیی چینییەکان...

ڕێگەیەکی دی کە دەتوانین بە لایەنی — سەرو سروشتی = میتافیزیکی ناوی بـەرین لـە هونەری چینی دا والآو زاڵە... ئەوەی لەو ڕێگەیەدا درکاندنی ئاڵۆزە ئەمەیە کـە پیـشە لـەو جـۆرە تاکـە کەسـییەیدا کـە پێناسمـان کـرد دەبێتـە نـاوەڕۆکێکی گـەلێك ناکەسـی و ئەبستراکت" گوایە دەڵێن هونەرمەنـدی چـینی دەیـەوێت هاوگونجـانی بـووە ژیاوەکـان لـە بەرهەمەکانی دا نیشان بدات... لە ڕاستی دا لەو جۆرە دەربڕینەمان پێویستە بۆ پێناسـەی مەبەستی هونەرمەندی چینی، لە کاتێك دا ئەو مەبەستە لەگەڵ مەبەستی هونـەری ڕۆژئـاوا دا کە بریتییـە یـە لـە دوپاتکردنـەوەی خاسـییەتی دیـاردە سروشـتییەکان هـیچ ڕوویـەکی لێکچوو و هاوبەشیان لە نێوان دا بەدی ناکرێت کاتێ کە بە یەکتریان هەڵدەسەنگێنین.

دیارە هونەرمەندی چین —یش وێنـەکانی لـە دیـاردە سروشـتییەکانەوە وەردەگرێـت : دیمەنی چینی بەناوبانگە، هونەرمەندی چینی دیمەنەکانی دوای سەرنجدانێکی بەسەرنجی لـە سروشت دا دەکێشێت" بەڵام دەبێت لە یادمان نەچێت کـە دیمەنـەکان هـەرگیز ڕاسـتەوخۆ دیمەن نین" هەمیشە لە پشتی هەندەکییەکان دا، گشتەکان " کلیات " پـەنهانن.

دیارە گیانی هونەری ڕۆژهەڵاتی بە درێژایی مێژووی هونەری چین گۆڕانکارییەك بەدی دەهێنێت، لای هونەرمەندانی سەرەتایی زنجیرەی تانگ = tang ئەو گیانەی لە گشت شتێکدا زیاتر خۆی گریمان دەکرد" گیانی ترس بوو کە دەبوو لە ڕوخساری بەهێزو زبردا دیل بکرێت...

لە کاتێکدا لای هونەرمەندانی شارەزاتری قۆناغی سونگ = Sung دا هەمان گیانی هەمەیی یان گشتی = الروح الكلي — حاڵەتێکی ناسك و غەزەل لە شێوەی پەیدا کرد.

بە کورتی هونەری چینی لە سەرانسەری مێژووی خۆیدا سروشتی بە سرۆشی هێزێکی شاراوە ڕەچاو کردووە و ئامانجی هونەرمەندانیش ئەوە بووە کە پەیوەندی بەو هێزە شاراوەیەوە بکەن تا چۆنێتیی ئەو گیانە سروشبەخشە بە بینەران ڕابگەیەنن.

لە هونەری ڕۆژئاوادا ئەو ئامانجە بە جۆرەها شێوەو بەشی ڕۆمانتیکی و عیرفانییەتی گومانکاری دابەش دەبێت، بەڵام هونەری چینی هەمیشە بەشێوەیەکی سەرسوڕێن لەو جۆرە چاڵەی بە هەستیاریکردن بێ لایەن دەمێنێتەوە ... واتە دەربڕینی هەستی پیشەی هونەرەکەیان نییە لەم بوارەدا .

لەبەر ئەم هۆیەش هەندێ وای ڕەچاو دەکەن کە ئایینە چینییەکان چییەتی یەکی گەلێ فەلسەفیان هەبێت .

هەر چەندە هونەرمەندانی چینی بە پێی پێویست ئاشنا نین بەو زانستییە بیرییانەی کە فەیلەسوفان لە هەستچێتی ڕزگار دەکەن " بەڵام هونەرمەندی چینی ئاشنایە بەو زانستە پیشەیی یەی کە باسمان کرد... لەم زانستە پیشەیی یە شدایە کە دەتوانین تەواوی و باڵایی هونەری چینی ، تا لە گشتی ترین شێوەیدا ڕوون بکەینەوە و بیپشکنین...

ئەگەر هونەرمەندێکی چینی لە کەرامەتی بیری شێوازی خۆی لا بدات ، ئەوا دەستو نوسینی ئەو ڕازی ئەو لادانە دەخاتە ڕوو ... واتە لە هێڵەکانی دا ئەو ڕازە وەڕوو دەخات.

هونەری چینی بە درێژایی مێژوو ی خۆی گۆڕانگاری زۆری بەسەردا هاتووە ... خێڵە دڕندەکان لە باکورو ڕۆژئاواوە هێرشیان بردۆتە سەر چین و چەند ڕەگەزێکی شێواز ئەندازەیی هونەری خۆیان تێکەڵی هونەری چینی کردووە ... بەڵام زەقترین گۆڕانکاری لە پای ئایینی بوزایی دا کۆنفۆ شیوسە — وە ڕوویدات ... هەڵبەتە ئەم ئایینانەش خرۆش و بزوتنی گەورەیان لە گشت چالاکییە هونەرییەکان بەدی هێنا" بەڵام لە هەمان کاتیش دا زیانێکی گەورەشیان لێدا .

ئایینی بوزایی جۆرە سیمبولێکی سەپێنراو بە پێ داگری بڵاو دەکاتەوە — ئەم جۆرە سمبولیزمەش هەمیشە لە هونەردا لە ڕەگەزی ناپەسەندن ...

ئایینی کۆنفۆشیوس پەرستنی باپیرانی ڕاگەیاند ... ئەم پەرستنی باپیرانەش لە زەمینەی هونەردا بەڕوویەك گۆڕا کە هونەرمەندان وەرگەڕانە سەر لاسایی کردنەوە ی تەواوی بەرهەمی دێرین و بە ڕابردودا چەسپان .

بەڵام لەگەڵ گشت ئەم کۆسپانەدا لەوانەیە هونەری چینی بە یاریدەی ئەم باوەڕە ئایینییانەوە بوو توانی ژیانی خۆی بپارێزێت و لە قۆناغی سۆنگ دا بەو پەڕی توانای بگەیەنێت.

قۆناغی سۆنگ لە ڕوانگەی کاتەوە — و لە ڕوانگەی شێواز وسەلیقەی هونەرییەوە بەڕوویەکی والآتر— کەم تا زۆر لێکچووی سەرەتای قۆناغی گوتیك —ە لە هونەری ئەورووپیدا.

## 43 – هونەری ئێرانی

لەوانەیە وڵاتی ئێران چاکتر لەهەر وڵاتێکی دی نەشیاویی دابەشکردنی جوگرافیای لە مێژووی هونەردا نیشان بدات، مەرزەکانی ئێران لە سەرەتای مێژووییەوە ، هەر لە سەرەتای سەدەی حەوتەمی پێش زایینەوە تاوەکو ئێستا گۆڕانی بەربڵاویان بەسەردا هاتووە .

ولاّتـی ئێـران گـەلێ جـار هێرشـی براوەتـە سـەر و جۆرەهـا میللـەتی جیـاواز ڕوویـان تێکردووە یا کۆچیان لێوە کردووە .

ئەم ولاّتە نزیکەی پانزە سەدە ، واتە دوو لەسەر سێی مێژووی ژێردەستەی دەسەلاّتی بێگانە بووە .

زیـاتر لـەم تێبینیانـە دەبـێ ئـەمامان لـە یـاد بێـت کـە هونەرمەنـدانی ئێـران زیـاتر لـە هونەرمەندانی دی هـەر جێگەیـەك لـەم جیهانـەدا ، ئامـادەیی خزمـەتکردنی بێگانـەیان لـە ئەستۆ گرتووە ، عەودالّیان بەدوای بابەت و بەسەرهات دا " یان شیاوی عەودالّیان بـەدوای بابەتدا بە پلەی کەمالّ دەگات .

هەڵبەتە مەبەستمان ئەمە نی یە کە بڵێین کاتێك کـە دەڕوانینـە بەرهـەمێکی هونـەری ئێرانی مانای ڕۆشن لەو بەرهەمەدا بەدی نایەت " بەلاّم تا سەدەی پانزەیەم و بەتایبەتی تا زنجیرەی سەفەوییەکانی ئێران نـاوێکی تـەواوی پەیـدا نـەکرد و بـەر لـەو کاتـەش قۆنـاغی هونەریی مەزن هاتۆتە کایەوە کە ئێـران پەیوەنـدی پێوەیـان تونـدە ، بەتایبـەتی قۆنـاغی ساسانی، چونکە پاشماوەی هونەرییان ماوەتەوە و لە ڕوانگەی جوانناسییەوە گـەورەترین قۆناغی هونەری ئێرانییە .

بـەلاّم هەرچـەندە زیـاتر ئـەو قۆناغـە بەسـەر بکەینـەوە ، زیـاتر پـەی دەبـەین کـە هونەرمەندانیان لە گەنجینەو بەرهەمی چڕ و دەوڵەمەندی ئاسیای ناوەڕاسـتەوە سرۆشـیان وەرگرتـووە " وە لەهـەر بارێکـدا شـاکانی ساسـانی زیـاتر لـە سـنورەکانی خـودی ئێـران تێپەڕیون .

دیاری کردنی ڕەگەزی نەژادێك لە هونەردا بـە تایبـەتی لـە قۆنـاغی ساسـانی دا کـە لـە برەودا بووە لە قۆناغەکانی دوایی هونەری ئێراندا " ڕاستەوخۆ لەگیانی میللـەت پەرسـتی و ڕەگەزییەوە سەر هەڵدەدات ...هەرچەندە لە قۆناغەکانی دواییدا هونەری ئێرانی زیاتر دابـە بڕیـار دراوەکـانی هونـەری ساسـانی — بیـان بـەکار برد"چـونکە هونەرمەنـد ئـەو دابـە بڕیاردراوانـەیان بەهـەمان ڕێکخـستن بـەکار دەبـرد کـە شـاعیران لـە دەریـای شـیعردا

دەیهۆنییەوە ، بەڵام هەمان شێوە کە دەریای شیعری دەشێت لای چەند زمانێك سروشتی بێت ( واتە لە ڕووی زارەوەی تەعبیرییەوە "و" )دابە بڕیاردراوە هونەرییەکانیش دەشێ لە نێوان چەند میللەتێکدا هاوبەش بن ، وە ڕاستەوخۆش پێودانگی میللەت نین.

شانشینەکانی ساسانی بە دەستی خێڵە عەرەبییەکان لەناوچوون و کەمتر بینایەك لە شوێنەواری ئەو قۆناغە لە دەستی ڕەگەز پەرستییە عەرەبەکان مایەوە . لە دوایدا ئێران بەناوی یەکێ لە ملکەچانی ئیمپراتۆری ئیسلام ژیانێکی نوێی دەستپێکرد ... بەڵام یەکەی هونەری ئەو قۆناغە (1258 – 661)پەیوەندی نییە بە فلان یان فیسار بنکەی جوگرافییە وە ، بەڵکو پەیوەندە بە پارێزگاریی خەلیفە عەرەبەکانەوە ، وە لە سای پاێزگاری خەلیفەدا هونەر ڕەنگی نێو دەوڵەتی لە خۆ گرت .

ڕاستە کە ئێرانییەکان بەتایبەتی لە قۆناغی خەلیفەی عەباسی دا بە ڕێژەیەکی زۆر ئاگایان لە سەر بەخۆیی خۆیان بوو لەبەر پێدانی سەرانەی زۆر ئازاد بوون ئایینی خۆیان بژێنن ، بەلاّ ئەو ئایینە هەرگیز وەك مەسیحییەت بە شێوەیەکی پرتاو و هێز بزوێنەری هونەر نەبو ە چ لەکاتی دەسەڵاتی عەرەبەکان و چلە قۆناغی دەسەڵاتدارێتی تورکە مەغۆلەکان دا ... واتە بۆ ماوەی هەشتا سەدە ئێرانییەکان بەشێوەی – گەل – هونەرمەندەکانیان بە زۆر و خوایش کۆچیان کرد – فەرمان ڕەوایانی ئێران کە زۆر جار خۆیا ڕووت بوون لە هەستیاری هەستی ئێرانییەکانیان دەرهەق بە جوانی دیاری دەکرد و ئەوانیان بەرەو دیلی و ژێر دەستەیی فەرمانی عەرەبەکان دەنارد .

لە ڕۆژهەڵاتەوە واتە لە سنورەکانی هیندەوە تاوەکو ئیسپانیا لە ڕۆژئاوا هونەرمەندانی ئێرانی بۆ هەر جێگەیەك دەچوون ڕێوڕەسمی خۆیان لە تەك خۆیان دا دەبرد ، نەخشی خەیاڵیی سەرسوڕێن و گیانداران ، وێنەکاریی ئاڵۆز و گوڵ و لق و چڵی پڕ لە گەلاّ و – لە هەر جێگەیەك نەمامی ئەم هونەرەیان دەڕواند و لە ناو هەر میللەت و وڵاتێکی دی دا ڕەسەنایەتی هونەری خۆیان بلاّو دەکردەوە و بەو جۆرە هونەرەکەیان لە ناو میللەتانی دی دا دەناسرا.

پاش ئەم هونەرەی کە ئێمە بە هونەری ئێرانی ناوی دەبەین ، کە لەوانەیە بەر لـە هـەر هونەرێکی دی لە جۆرەها جێگە و شوێنی جیاوازدا سەری هەڵدابێت " توانای ئـەم هونـەرە سەرانسەری جیهانی شارسـتانی گرتـەوە ... ئـەم هونـەرە هەمیـشە بـەربلاوترین هونـەرە چونکە کات و شـوێنی بـە هـیچ ڕوویـەك ناتوانرێـت دیـاری بکرێـت ... دەتـوانین بڵـێن کـە هونەرمەندانی نەژادێکی تایبەت هەڵگری ئەم هونەرە بوون ، دەتوانین بڵێین ئەو هونـەرەی ئەو نەژادە لە دەشتە پڕ نهێنییەکانی ئاسیای ناوەڕاستدا بلاو بۆتەوە و بـە کـۆچ و ڕەوی خۆی و بە دەسەڵاتی ئەو هونەرەیان شێوەی شێوازێکی نێو دەوڵەتی بەدی هێنا .

بە ڕوانگەی من ئەو قۆناغە گرنگترین قۆنـاغی هونـەری ئێرانییـە ... قۆنـاغێکی دی بـە پێکهێنـانی حکومـەتی " نیـشتیمانی یـا میللـی " سـەفەوی کـە لـە سـەرەتای سـەدەی شانزەیەمدا دەست پێ دەکات ، ڕۆڵی خـۆی دەبینـێ ... لـە ئێـران دا قۆنـاغی بـاوەڕێکی میللیش بەدی دێت و ئێرانییـەکان دیـسانەوە خۆیـان بـە لێپرسـراو دەزانـن بەرامبـەری ... هونەری میللی بە مانای تـەواوی وشـە لـەو قۆناغـەوە دەسـت پێـدەکات " وە کاتێـك کـە( هونەری ئێرانی ) ناو دەبەین ، زۆر جار مەبەستمان وێنەکارییەکانی ئەو سەردەمەیە.

ئێمە دەستنیشان کردنی ڕەگەزی ئایینی لە هونەری ئێرانـی دا " تەنانـەت لـە هونـەری سە فەویش دا دوچاری کۆسپمان دەکات لە ڕووبە ڕووکردنـەوەی خـەڵکانی ئـەوروپی دا یـا ڕۆژئاوادا .

زیاتر بەو ڕووەی کە دەیزانین لە هونەری ئایینی دا چاوەڕوانی بینینی سیمبولی مرۆڤـی سەر بە ئایینێکی مرۆڤی دەبینەوە ... بەلأم کێشانی وێنەی مرۆڤ سەدەها ساڵ لە بـاوەڕی ئێرانی دا قەدەغە بوو ، لە ئەنجامدا هونەری ئێرانی زیـاتر لـە هونـەری مەسـیحی ڕوویـەکی ناکەسی "غیر شخصی " پـەیدا کرد " بەوەی کە مەسیحییەت لـە بـواری وێنانـدنی مـرۆڤ دا دەسترۆ بوو...

لەبەر ئەو هۆکارانە هونەری ئێرانی زیاتر لە ژیـان دوور دەکەوتـەوە ، تـا کـاتێکیش کـە قەدەغەبوونی وێنەکێشانی مـرۆڤ لـەکار کـەوت و دەسـەلأتی نـەما ، هەمیـسان شـێوازێکی جوانکاریی زۆر بەهێز لە جێیدا مایەوە کـە خرۆشـی ڕەسـەنی هونەرمەنـد بـوو لـە هونـەردا گەشەی کرد " چونکە من جیـاوازی لـە نێـوان هونـەرە جوانـەکان و هونـەری جوانکـاری دا "تزیینی" پەسەند ناکەم و باوەڕم وایە کە هونەر یەکە یەکە یان یەك یەکەیە .

ئەتوانیت بلێین کە ئەو خـود پەرسـتییەی لـەکاتی ڕێنیـسانس بـە دواوە بـەدی هـات ، هونەرمەنـدانی ئـەورووپی هـۆی بـەیانی ڕاسـتەوخۆیان لـە ویـست و ئـارەزووی ڕۆژانـەی خەڵکییەوە بەدی هێنا بۆ داهێنانەکانیان ...

لای هونەرمەندانی ئێرانی ئەم بیرۆکەیە بوونی نەبوو ، هونەرمەندی ئێرانی لـە بنـچینەدا بەدی هێنەری شتی بەسودی وەك پارچەی گۆزە و ماددەی ئاسنی و ( وێنەی 32) فەرش و کتێبە باوەڕییەکانە پاشان ئامرازی زانستی .

ئـەو کەسـانەی کـە لەهونـەری ئێرانـی دا بـەدوای " لایـەنی مرۆڤانـەدا " دەگـەڕێن زۆر دوچاری ئەندێشە دەبن ، بـەلأم ئـەوەی بـەدی دەهێـنن بریتییـە لـە بەرهـەمی یـەکێك لـە هەستیارترین و زانستی ترین میللەت کە جیهان بە خۆیەوە دیوە " دەربارەی ئـەم خاڵـەش کـە لـەم جـۆرە بەرهەمانـە کـە لـەو کـەلتورەدا زادە دەبێـت و شـتی سـادە و ڕۆژەکـین — جۆرێکە لە پڕماناترین وانە کە ڕۆژئاوایی یەکان دەتوانن ئەوانی تری پێ دا بدەن .

## 44 — هونەری بێزەنتی

قۆنـاغی بێزەنتـی چـی لـە ڕوانگـەی بۆچـونی گـشتی و چـی لـە ڕوانگـەی تۆژینـەوەی هەندەکیانەوە ئاڵۆزترین قۆناغی مێژوویی یە ... دەتوانین بلێین زاراوەی بێزەنتـی هـەرگیز بە ڕوویەکی ڕاست پێناس نەکراوە ، تاوەکو ئەم چەند ساڵانەی پێـشوو هونـەری بێزەنتـی هەمان هونەری سەدەی ناوەڕاست بوو کە تـەنها لای چـەند دێرینـە ناسـانێك زیـاتر بـوونی نەبوو... ڕاستە کە ڕاسکین بناغەو ڕەنگو بۆی ئەم هونـەرەی پێنـاس کـردوە... بـەلأم بـە

باوەڕی من دەبێت وای گریمـان بکـەین کـە گـشت وەرگێڕانێکـی ئێـستاییمان بـۆ هونـەری بێزەنتی لە هەستیاریی سەرەکیی ( ڕاسکین ) ەوە تێراو دەبێت.

بەڵام ڕاسکین کە هێشتا بە ڕێژەگریی جـوانیی یۆنـانی – ڕۆمـانی – بنـچینەدارنەر بـوو توانیی هونەری بێزەنتی تەنها لە ڕووی دوودڵییەوە پێناس بکات .ڕاسکین لـە توانایـدا بـوو چـڕی و دەوڵەمەنـدیی ڕەنگـی هونـەری بێزەنتـی بـە گیـان و دڵ بپارێزێـت و هـەمان ئـەو کاریگەرییە جوانناسییەی کە ئەم هونەرە دەیتوانی لەسەر بینەری دابنێ نـەمر بکـات و بـۆ هەمیشە بیژێنێت .

بـەڵام سـەرئەنجام ناچـاربوو ڕەخنـە لـە درەنـدەییان بگرێـت ، چـونکە لـە ڕوانگـەی ڕاسکین دا هونەری بێزەنتی پلەی ناوەندیی هەبوو لە نێـوان ئاشـکرایی یـا ڕوونـی هونـەری یۆنانی و مەزنی یا باڵایی هونەری گوتیك دا.

چیی دی ناتوانین هونەری بێزەنتی بەم چاوە تەماشـا بکـەین و چـی ی دی ئێمـە بـەو ئەندازەیە لە ژێر کاریگەری پێودانگە کلاسیکی یەکاندا نین .

هەمان شێوە لە نیازی چەسپاو و با لادەستیی ڕاستەقینەی هونەری بێزەنتـی دا زیـاتر بەڵگە و گەواهی شك دەبەین کـە بتـوانین ئـەو هونـەرە تـەنها بـەناوی بوویـەکی نێـوان دوو دەسەڵاتی دەرەکی بناسین ... ڕێگـی بـدە بـە نـاوی یەکـەمین بابـەتی تۆژینـەوە ، ژیـانی مێژوویی ئەم هونەرە ، واتە بەردەوامی و مانەوەی بەناوی شـێوازێکی کاریگـەرەوە لەبـەر چاو بگرین .

قوستەنتین ئیمپراتۆری بەهێز و پایەی پایتەختی خـۆی لـە کـەناری – بوسـفور – لـە ساڵی $330$ دا پەیرێژ کردووە ... دەکرێ ئەم ساڵە بە ساڵ و کاتی مێژووی دەسـتپێکردن و سەرهەڵدانی هونەری بێزەنتی بزانین.

شاری قوستەنتینیە لە ئەنجامدا لە ساڵی $1453$ دا بەدەستی تورکـەکان ڕوخێنـرا ... ئەم یانزە سەدەیەش گرنگە بۆ مێـژووی هونـەری بێزەنتـی و کـەمتر لەمـە شـیاو نییـە ... چونکە هەتا بەر لە $330$ یش کارتێکەری جیاواز لە کایەدا بوو بۆ کۆکردنەوە و پێکهێنانی

شـێوازێکی نـوێ ... وە تـاوەکو دوو یـا سـێ سـەدەش دوای ڕوخانـدنی قوسـتەنتینیە شێوازێکی بێزەنتی لە ڕوسیا و یۆنان برەویان بە ژیانی خۆی دا.

دەتـوانین بڵـێین کـە هونـەری بێزەنتـی لـە سـەدەی حەوتەیەمـەوە تـاوەکو سـەدەی دوانزەیەم لەوپەڕی گەشەی خۆیدا بووە و لەم قۆناغەیدایـە کـە پیـت و فـەڕترین دیـاردەی ئەو هونەرە بەدەست دەخەین.

گیبــوون = Gibbon بــەهۆی هەڵەیەکــەوە کــەدەربارەی داڕوخــان کــردی و بــەهۆی ناتواناییەوە لە تێگەیشتنی بەهای مەسـیحییەتدا ، بـەر لەهـەر کەسـێ لـە درەنگناسـاندنی ڕاستیی هونەری بێزەنتـی دا کەمتەرخـەمی کـردووە . هـەمان شـێوە شـتێکی سـەیرە کـە بەرگریکەرانی مەسیحییەت ئامادەن هونەری گوتیك ستایش بکەن لەبەر ئەوەی کە هـاوڕای شـکۆ و مـەزنیی دینـەویی کڵێـسایە " هـیچ لێکۆڵینەوەیـەکیان دەربـارەی ئـەو هونەرانـە نەکردووە کە هاوتای شکۆی هەمان کڵێسا بووە.

هونەری بێزەنتی هەم لە سەرەتای خۆ پەروەردە کردنیدا لە ڕۆژهەڵاتی نزیك و هەم لە بڵاوبونەوەی لەسەرەخۆی لەناوچەی مید پیترانـەدا هـەنگاو بـە هـەنگاو لەکـەڵ کەنیـسەدا هاوڕێ بووە ... بۆیە دەبێت ئەم هونەرە لە هەنگاوی یەکەم دا بـەناوی هونـەرێکی ئـایینی بەسەر بکرێتەوە ( وێنە33). ئەمە ئایینی ترین هونەرە کە مەسیحییەت بەخۆیـەوە بینـی وە " چونکە هونەری گوتیك بە زوویی ڕەنگی هومانیزمی پەیداکردووە .

هەر شتێکیش هومانیـستی بێـت نـاتوانێ تـەواو خواوەنـدی یـان پیرۆزبێـت ، هونـەری بێزەنتی هونەرێکی پیرۆزە ، هەرچەندە بەشێکی زۆری ئەو هونـەرە لـە پیاهەڵـدانی پلـە و پایە و شکۆی ئیمپراتۆرەکان پێکهاتووە ، نەك بە پیاهەڵدانی شکۆ و مـەزنیی خواوەنـددا " دیسانەوە بە حوکمی ئـەوەی کـە هونەرمەنـدانی بێزەنتـی دەسـەلآت و خـاوەن شـکۆیی و تەخت بە سرۆش و پێدراوی خواوەند دەزانن — شـکۆداریی سـەر زەمینـی بـە پێـچەوانەی وێنەی کاروباری ئاسمانی لە پێش چاو دەگرن دەشێت مرۆڤ لە ڕادەبەدەر خەریکی لایـەنی ئایینی و کاروباری ڕاهیبانەی هونەری بێزەنتییەوە بێت " چونکە ئەو چۆنێتییە دەتوانرێت

بە بێ بەکاربردنی هەستیاری جوانناسی ڕاستی بدرکێنرێت...وە لەو شێوەیەدا ئەم مەترسییەمان دێتە ڕێ کە بکەوینەچاڵی درکاندنی هونەرەوە بە ڕوویەکی زانستی و عەقلانیی پەتی .

چاتر وایە خەریکی لایەنی غەزەلیی هونەری بێزەنتی بین و پشت بە تێڕوانینی ڕاستەوخۆی هەستی ببەستین چ لە ڕووی ڕەنگ و شکڵەوە چ لە ڕووی ئەو چۆنێتییە نادیارەوە کە زۆر جار بە " بۆ شایی = ئاتمۆسفار" ناوی دەبەین .

هیچ هونەرێك ( بەتەنها هەندێ لە جۆرەکانی هونەری ڕۆژهەلاتی نەبێ کە هونەری بێزەنتی لە پەیوەندییەکی نزیکدا لەگەڵیان دا ) ناتوانێ لە ژێر کارتێکەری غەریزەییمان دا بەو جۆرە کارمان تێ بکات ...

لەوانەیە لەبەر هۆی ئامادەییمان بێت کە ئەم هونەرە تەواو خاڵی لە بارودۆخێ کە بە جەوهەری بێگانەن بکۆڵینەوە و بارێکی یاریدەدەر بۆ درکاندنی ئەو هونەرە لە ئێمەدا سەر هەڵبدات .

بەلاّم هەر کە بارێکی وەها بەدی هات " ئەوا لەبەرامبەر هونەری بێزەنتی دا بە چێژێکی دەست و بردو ڕاستەوخۆ – کە یەکەمین و دواهەمین نیشانەی ئەزمونی جوانناسییە تەسلیم دەبین .

## 44 – هونەری سلتی

یەکەم – هونەری سلتی لە خۆیدا یەکێکە لە سەرسوڕێن ترین قۆناغی مێژوویی هونەر، لە پای ڕووداوی مێژوویی جیاوازدا باکوری ترین ناوچەکانی ئەوروپا – ئیرلەندە و سکۆتلەند و ئیسلەندە – باکوری سکەندینافیا – شێوازێکی پێش مێژوویی ڕەسەنیان پاراستووە .

ئەم شێوازە لە ناوچەی " ڕاین " ی ناوەندەوە سەری هەڵدا و بە یاریدەی هەرێمەکانی سلتی کە نزیکە بە دوورگەکانی بەریتانیا بۆ ئەوێ گوێزراوەتەوە .

وە لەو قۆناغانەدا کە هێرشی ویلایەتەکانی تری خاکی ئەوروپا هاتە کایەوە تایبەتێتی ئەم شێوازە لە دورگەکانی بەریتانیا پارێزراو مایەوە .

ڕەوتی گەشەی هونەری ئەوروپی لە قۆناغی ناوبراو دا بە ( سەدە ڕەشەکان 400 – 1000 زایینی ) گەلێك بەهێزە و هونەری سلتیش تیایدا هاوبەشە ... بەلاّم ئەو بەرهەمانەی کە سەر بەم قۆناغەن و بە یادگار ماونەتەوە گەلێ کەم و دەگمەنن .

ڕاست بەرچاو دەکەوێت کە هونەری سلتی کۆن سەر بە قۆناغی پێش ڕۆمییەکان لە ئیرلەندە بەشێوەی ڕەوتێکی بەردەوام ماوەتەوە ، تا ئەو کاتەی کە هۆکارێکی نوێ – واتە مەسیحییەت –لە باکوردا سەری هەڵدا . لە بەریتانیادا بلاّوبوونەوەی مەسیحییەت گەلێ سست بلاّوبوەوە کە بەلای کەمەوە دووسەد ساڵ درێژەی کێشا .تەنینەوەی دەسەلاّتی مەسیحییەت بەسەر بەریتانیادا لە قۆناغی دەسەلاّتدارێتی ڕۆمەکاندا بوو کە بەلگەی تەواومان بۆ سەلماندنی لەبەر دەستا نییە ... مێژووی دەستپێکردنی مەسیحییەت لەم ولاّتەدا بە سەفەری پیرۆز نینیان = st – Ninian دەست پێ دەکات کە لە شاگردانی پیرۆز مارتین بوو = St- Martin کە لە ساڵی 412 ی زایینی دا کەنیسەیەکی لە وایتهورن = Whithorn لە هەرێمی ڤیکتۆ نشایر = Wigtownshire بنیات نا.

زۆری نەخایاند کە ئیرلەندایش بەدەستی پیرۆز پاتریك =– St- Patrick باوەڕیان بە مەسیحییەت هێنا .

بەدرێژایی سەدەی شەشەم مەسیحییەت لە وایلز ، وە لە پیکتها لە باکوری سوکتلەندەو ساکسۆنیا لە ئینگلتەرەدا هەم بلاّو بوەوە ... لە سەدەی شەشەم وحەوتەمدا ئەم کەنیسەیەی باکوور بووە پەناگای مەسیحییەت لە ئەوروپاداو ئەم قۆناغە لە ڕەوتی گەشەی هونەردا بە گرنگترین قۆناغی هونەری دەژمێردرێت لەو کاتەدا و پەیوەندیی ڕاستەوخۆ لە نێوان باکوورو ڕۆژهەلاّتدا بەدی هات بە جۆرێك کە یەکێ لە مێژوونووسانی دوایی مێژووی کەنیسەی سلتی دەڵێت :– " بەهۆی ڕاهێشتنەوە کە پیرۆز نینیان لە پیرۆز مارتین – ەوە بینیبووی – وە ئەویش لە ئەزمونەکانی ڕۆژهەلاّت – ی هیلاری پیرۆز =

St . Hilary – ئاگادار بوو بـوو " ئـەو کەنیـسەیەی بـەناوی کەنیـسەی سـکوتلەند ناسـرا لـە هەمان سەرەتاوە بەناوەڕۆکی ڕۆژهـەلاتیی دۆعـا و نوێـژو شـێوەکانی ڕاگەیانـدنی ئـایینی ڕۆژهەلاتی ئاشنایەتی پەیـدا کـرد ." [1] کـۆی هونـەری سـلتی بـۆ دوو قۆنـاغی دیـاری کـراو دابەش دەبێت " یەکەمیان قۆناغی کۆنی ( پێش مەسـیح ) کـە شـێوازی خـۆی ڕاسـتەوخۆ لەسەردەمی بەردینی نویٚ وە دەست پێدەکات ... دووەمیان قۆنـاغی ( پـاش مەسـیح ) ە کە تیایدا شوێنەوار و کاریگەری شێوازی ڕۆژهەلاتی لە هونەری سلتی دا دەرکەوت .

دکتۆر ماهر = Mahr لە کتێبەکەیدا بەناوی (هونەری مەسیحی لە ئیرلەندی کۆن دا)ئەم قۆناغەی پاش مەسیح بۆ چەند شێوازێك دابەش دەکات :

1- شێوازی ناوخۆیی . لە سەدەی حەوتەمەوە تاوەکو سەرهەلّدانی ڤیکینگە کـان = viking لە سالّی 850 .

2- شێوازی ئیرلەندی ڤیکینگ= Hiberno – viking لە 850- 1000 لـەقۆناغی زالّ بوونی ڤیکینگەوە بەسر ئیرلەنددا.

3- دواهەمین قۆناغی وێنەکردنی گیاندلران 1000 – 1125.

4- شـێوازی ئیرلەنـدی ڕۆمـی = Hilrino Romanesque لـە سـالّەکانی 1125 تـا سەردەمی داگیرکردنی ئینگلتەرە بەدەستی نەرویجییەکان.

جوانکاری = تـزیین – لـە سـەرەتای قۆنـاغی سـلتی دا جوانکـاری هێلّـی و ئەنـدازەیی ڕووتە کارییە یا ئەبستراکشن " ناسـراوترین جـۆری ئـەم جوانکارییانـە بریتییـە لـە شـریتی تێکهەلّکێشراو یا جوانکاریی حەسیری کە شکلّی سادەیان لەسەر گۆڕە سـلتییەکان ئـەمڕۆ بەدی دەکرێت .

---

[1] . The rise and relations of the church of scotland.

نایـابترین شـكڵیان لـە كتێبـی كـێڵس = Book Of Kells — دا دەبینرێـت كـە كتێبێـك نووسینی سەر بە سەدەی هەشتەم — ە كە سەر بە دانیشگای ترینتیی یە لە شاری دۆبلـن " وێنە 36" .

ناوەرۆكی ڕاستەقینەی ئـەو جوانكارییـە لەلایـەن مێژووناسـێكی هونـەری ئەڵمانییـەوە بەناوی لامپرخت = Lamprecht زۆر بەڕوونی پێناس كراوە : — " لەو جوانكارییانەدا چـەند نەخشێكی بنچینەیی هەن كە تێكئالآن و چنینیان چـۆنێتیی هونـەرییان نیـشان دەدات ... لەسەرەتادا تەنها هێڵ و خاڵە "النقطة والخط" شریت یا بەن بوونی هەیە ... پاشان شكڵی چەماوە و بازنە و مارپێچ و هێڵی شكاوە وشـكڵی " S " بـەكار بـراوە، ئەوانـە ڕاسـتەوخۆ نەخشی بەربلاو فراوان نین ، بەلاَم لە شێوەی بەكاربردنیان دا چی جۆرایەتییـەك " تنـوع" یا هەمەجۆری بەكار هاتووە ؟

جارێك تەریب و یەكسان بەرامبەر بەیـەك ، جـارێكی دی لـە یـەكتری ئـالآو و ئـامێزان ، جارێكی تر گرێ دراو و جـارێكیتر تێـك هەڵـچنراو ... یـان بـەگرێی شـێوە چـنراو بەرامبـەر بەیەك یان لەتەك یەكترییەوە دانراون .

بەهــەمان ڕێكخــستن نەخــشی لــە یــەكتری ئــالآو بــەدی دێــت ، كــە وەك مەتــەڵێك دەردەكەوێت كە لە چنینی دا بە دوای ڕێچارە و حـەلكردن دا پێـچاو پـێچ لـول دەخـوات و لەهـەمان كاتـدا یـەك ئـەوی دی كـێش و ڕاپـێچ دەكـا و پاڵەپەسـتۆیانە لەگـەڵ یـەكتری دا ...شكڵەكان وەك ئەوەی خاوەن هەست و ژیان بن بەو جۆرە سەرنجی مـرۆڤ ڕادەكێـشن و بەجوڵەی بزێویان سەرنج ڕادەكێشن . "

گرنگیی ئەو جۆرە هونەرە نا ئۆرگانی و سەرو ئۆرگانییەم لە پـاراگرافی 32 دا پێنـاس كردووە " ئـەو جـۆرە بـەیان كردنـە لـە دژایـەتی ڕاسـتەوخۆدا بەشـێوەی بـەیانی كلاسـیك دانراون ، كە شێوەیەكە ئورگانی و سروشت شێوە و هێمن و ڕەزا بەخش .

گرنگیی شێوازی باكووری بەڕوویەكی  تایبەت لە چییەتی كێشەی ژیانی دا لە چـییەتی تەواو ئەبستراكتی دا شاراوەیە " وە لەم چییەتییە دا یا چۆنێتییەدا یە كـە ئێمـە پێویـستە

خێڵە باکورییەکان بەسەر بکەینەوە... گیانداریی‌یەك کە بە وتەی ڤریگنر = Worringer " لە ژیانی چەپ بووی نێو مرۆڤی باکوورەوە " بەدی دێت .

سیمبولی مەسیحی شێوە تێکەڵ بەم سەر زەمینە تاریك و ئەبستراکتەی هونەر بوون کە لە کەسانێك دەچوون وەك ئەوەی لەسەر زەمینی نامۆوە هاتبوون ... دوو باڵندەی بەهەشتی لە یەك هێلانەدا کە بەهێڵی ئەندازەیی وێنەکراون ، جێگەیەك دەگرن و هێشووە ترێیەکی ڕۆژهەلاتییان لە دەنوکدایە . داوود و هەر سێ منداڵەکەی لە داخانی تەنوردا وەڕوو دەکەون ... وێنەی ئادەم و حەوا ، قوربانی کردنی ئیسحاق لە نێوان جوانکاریی ئەبستراکتی دا بەدی دەکرێت " هەروەها وێنەی حەزرەتی عیسا لە نێوان فریشتەکان دا لەسەر ڕووی بەرد دەنەخشێنن.

ئەم جۆرە بەردانە لە ئێرلەندەو سکۆتلەندە و لەو جێگایانەدا کە بۆ چەندین سەدە بوونیان هەبوو ماونەتەوە " وە هیچ بەرهەمێك لە جیهان دا لە ڕووی مانا و ناوەڕۆکەوە وەکو ئەوانە خرۆشێنەر نین .ئەم بەردانە نمایندەی دە هەزار ساڵ مێژووی مرۆڤن ، ئەم مێژووەش لە کۆتایی ترین بارودۆخی گیانیی مرۆڤ ، لە نزیکترین و ووردترین مییانەیدا سەبارەت بە بەزەیی خواوەندەوە نیشان دەدەن .

## 45 – ڕووبەڕووبونەوە بە هونەری مەسیحی –

لەو قۆناغە مەزنەی هونەردا کە تیایدا مەسیحییەت بەو پەڕی توانەمەندی بەیانی نیازەکانی خۆی گەیشت ، لە مێژووی ئێمەدا دواهەمین قۆناغە کە تیایدا هونەر خاوەنی تایبەتمەندێتی گشتییە ... قۆناغەکانی سەرەتایی و کلاسیك و ڕۆژهەلاتی و هونەری گوتیكو ئەمانە گشتیان جۆر و شێوازی هونەرن ،جۆر و شێوازی تری هونەری گشتیان لەمانە دەکەونەوە.

هونەری ڕۆمـی دەشـێت بـە قۆنـاغی لاسـایی كـراوەی دواكەوتوانـەی هونـەری یۆنـانی لەقەڵەم بدرێت كە لەویشدا بە ئاگانییە لە هاوسەنگیی ئۆرگانی ، ئەوەش كە بەیانی دەكات خۆشی بەخش نییە بەڵكو ڕەزامەندییە ... هاوڕێژە نییە بەڵكو توانامەندییە .

لێكۆڵینــەوە لــە بــارەی جوانناســییەوە ســەرە لەســەر بنــچینەی هونــەری ڕۆمــی دەستپێكرد . لەبـەر ئەمـە سەرسوڕێن نییـە كـە ڕێژەیـەكی زۆر لـە هونـەر هێشتا لامـان تێنەگەیشتراو ماوەتەوە !

ڕێنیسانس تەقەلایەك بوو بـۆ دورخـستنەوەی ڕەگـەزی بـاكوری هونـەری مەسـیحی و گەڕانەوە بۆ هونەری كلاسیك . ڕێنیسانس ڕەنگدانەوەی قۆنـاغێكی نـا مەسـیحی بـوو لـە زانستی ئەوروپادا... قۆناغی ئەو فەرمانڕەوایانـە بـوو كـە جوانكارییـان فـەرز كـرد بەسـەر پەرستندا یا بەسەر كەشی ئاییني دا . بەڵام كاریگەری قۆناغێك لەسەر هونەرمەندانێك كـە لە ژێر مەرجایەتییەكانی ئەو قۆناغەدا دەهاتنە ژیانەوە وەهایە كە تەنانەت ئەو كەسانەش كە سرۆشیان لە ئاین وەردەگرت هەمان شێوە نیازەكانی خۆیان هاوتای داب و دەستوری باوی سەردەم بەیان كرد .

ئەم خاڵەش بەرەو لێكۆڵینەوەیەكی سەرسوڕێنمان دەبات لە مێژووی هونەردا ئـەویش بریتییە لە پەیوەندی هونەرمەند وەك تاك بـە ئایـدیای گـشتیی سـەردەمەكەیەوە ... لـەم مەسەلەیەدا سێ ڕۆڵ هاوبەشە : ڕۆڵی كات و ڕۆڵی نەژاد و ڕۆڵی ژیانی خودی ... ئایـا ئـەم هۆكارانە چۆن كاریگەر لەسەر یەكتری دەخەنەوە و كامیان شوێنەواری كاریگـەری لەسـەر ئەوی تریان بەهێزترە ؟

## 46 – هێزە ماددی و نا ماددییەكان

بـەكورتی دەتـوانین بڵـێین تایبەتمەنـدێتی هـەر قۆناغێـك توانـای مـاددی دەستنیـشان دەكات، مانای توانای نەژادیی هـەرێم " ئـابوری و كۆمەڵایـەتی . بـۆ ئـەوەی ئـەو خاڵـە بـە ڕوویەكی گەلێك سـادە شـاكار بكـەین ، دەتـوانین بڵـێین ئـەو وڵاتـەی دارو درەختـی زۆری

هەبێت " دەبێتە هۆی گەشـەی بینـای کـەل و پـەلی داری ... لەوێـدا هونـەری کـاری دار — خواست بە پلەی بالاْ دەگات ... بۆ نمونە لـە ئەسـکەندەناڤیا ن هونـەری کـاری دار بـەکار بردنی بەو شێوەیەیە کە لیێ دوایین .

لەو جێگەیەدا کە بەردی مەڕ مەڕ و تەرزی بەردی هەمەجۆری لێ یە ، هونـەری پەیکـەر تاشی گەشە دەکات ... بەلاْم ئـەم هۆکـارە مادییانـە هـەرگیز ناتوانێـت دیـاردە و گەشـەو تەواویی قۆناغەکانی هونەر بەگشتی شی بکاتەوە .

ماددە هەمیشە هەلگری پەیامی مانەوییە ، کەنیسەیەکی گوتیك تەنها بینایەکی بەردین نی یە ...بەلکو بە واتای پرۆفیسۆر ڤۆرینگەر " ئایینی بەردی "یە .

زۆر جار هەولێ دراوە کەمالی کەنیسەی گوتیك بەشێوەیەکی میکانیکی ڕوون بکەنەوە " ئەگەر دوو تاقی [1] ڕۆمی لەیەك بدرێن هەیوانێك پێك دەهێنن ، وەستونی هەیوانەکان ئەگەر پتەو بکرێن ئەوا تاقی زەربی "قولێ" بەدی دەهێنن ( مەبەست لەتاقی گـەورەو فـراوانترە ) ، تاقی زەربیش [2] هۆیەکە بۆ بەدی هێنانی بـەرزایی زیـاتر ... بـەرزاییش بـە نۆبـەی خـۆی کەلـە پایـەی " کۆلەکـە" دەرەکـی بـەدی دێنـێ ، کەلـە پایـەش پەیوەسـتە بـە منـارە و گومەزەوە ، بەم پێوانەکارییە دەتوانین بەرەو پێشەوە بچین تا ئەو جێگەیەی کـە تـەواوی کەنیسە بەشێوەی زنجیرە ڕێگەچارە یەکی بابەتی ئەندازیاری شی بکەینەوە .

بەلاْم ئەم کارە ئەو هەستە ڕوون ناکاتەوە کە مرۆڤ لە کاتی چوونە ژورەوەیـدا هەسـتی پیێ دەکات بۆ ناو هەمان کەنیسە ، چونکە مرۆڤ لە بەرامبەر یەکەیەکدا خـۆی دەبینێتـەوە کە لایەنی مانەویی هەیـە ... هەسـتەکانی مـرۆڤیش بـە یاریـدەی هەسـتێکی جـوانی یـەوە دەخرۆشێن کە زیاترە لە ڕێگە چارەی مەسەلەیەکی ئەندازیار.

[1] —تاق: مەبەست لە سەقفی ژوورە(بنمیچ)
[2] —گومەز: تاقی گومەزی

# 47 – دەسەڵاتی کەنیسە

هونەری گوتیك لە هونەری ڕۆمییەوە " ڕۆمانسك " بەدی دەهات" هونەری ڕۆمانسك بەلای کەمەوە هونەرێکی وەرگێڕاو بوو بە ڕووکەش و شێوە قەریحەی باکوری دەنواند کە شوێنگەی دێرینی هونەری ڕۆژهەلاتییە . دەتوانین بلێین کە خواستی هونەری ڕۆمانسك لە گۆڕانیدا بۆ هونەری گوتیك و خواستی هونەری گوتیك لە گەیشتن بەوپەڕی بالابوونی خۆی ئەمە بوو کە زیاتر و زیاتر چۆنێتیی باکوری لە خۆی بگرێت .

هەڵبەتە ئەمەش شتێکە کە مرۆڤ چاوەڕوانی دەکات ... بەلام بەدی هاتنی ئەم گۆڕانکارییە بە یاریدەی هۆکاری بێ ئەندازە بەهێزتر دەبێت کە ئەویش کەنیسەی مەسیحییە .

کەنیسە لە زۆربەی ڕۆژەکانی قۆناغی هونەری گوتیك دا بە مانای تەواوی وشە دەزگایەکی جیهانی بوو ، ئەم دەزگایەش تەنها کەنیسە نەبوو ، بەڵکو خاوەن پلە و پایەی کەنیسەکان بە زمانێك دەدوان کە بەهیچ جۆرێ جیاوازی نیشان نەدەدا کە لە چی ولاتێکی ئەوروپاوە هاتوون ... ئەم خاڵەش نەك تەنهادەربارەی پلەی بالای ئەسقەفەکان ڕاستی سەلمێن بووە بەڵکو دەربارەی قەشەکانیش " بە تایبەتی ئەوانەی لە ڕاگەیاندنی ئینجیل دا کورتەیەکیان کەمیان دەزانی کە هیچ جیاوازی نەبوو .

ئەم چۆنێتییە نێودەوڵەتییەی کەنیسە بووە هۆکاری کە هونەری کەنیسە مەیلدارێتییەکی یەك ئاڕاستەو یەك دەست و هاوتایی پەیدا بکات ... بەتایبەتی کاتێك کە کەنیسە دەربارەی چۆنێتی دانان و بەکاربردنی بابەتی ئایینی دەستوری دیارو ئاشکرای ڕادەگەیاند .

بەم پێیە لە تەواوی قۆناغی گوتیك دا هونەری کاهینی کەنیسە بوونی هەبوو و مەیلدار بوو بە سیمبولێکی بوون و هزرێتی و نەرێتی هەمەجۆر و بڕیار دراو " کەچی لە هەمان

کاتدا هونەرێکی " ژێـر زەمینـی" ش بـوونی هـەبوو کـە سـەر بـە عـەوامی خـەڵکی بـوو ، هونەرێ بوونی بەهێز و میللی و تا ڕادەیەکیش کێوی یان دڕندانە .

لێرەدا هەمان داستانی میسر جارێکی دی دوپـاتبووەو ... هەڵبەتـە گـەلێك لـە پیـشە گـەرانی ناڕۆحـانی لـە دەزگـا ڕۆحانییـەکان دا کاریـان دەکـرد و ناچـار بـوون بـە فـەرمانی کاردارانی خاوەن فـەزڵ و پایـە کـار بکـەن ... تـەنها کاتێـك کـە دوور بـوون لـە چـاودێری قەشەکانیان ئازادانە دەیانتوانی بە مەیلی خۆیـان کـار بکـەن و یـاری هەمـەجۆری شـیرین بەدی بهێنن کە زۆر جار لە کەنار و گۆشەی شاراوەی کەنیسەکان دا مرۆڤ دەیان بینێ .

# 48 – هونەری گوتیك

ئەم جیاوازییەی لە نێوان هونەری کاهینی و هونەری عەوامی گوتیـك لـەو ئاراسـتەیەوە باس دەکەم کە ئەو ڕەگەزە باکورییەی بەردەوام لەکاردا بوو و وێنـەی دەرەکیـی بـە پێـی خواستی ناو خۆیی " محلـی "ئـاڵوگۆڕ دەکـرد – لـە هـەمان هونـەردا گـروپ و خـەڵکانێك دەکرێ ببینرێ .

بەدبەختانە لەگەڵ ئەوەدا کـە هزنـەری خـەڵکانی سـەدەی ناوەڕاسـت تاڕادەیـەکی زۆر هیچیان لەبەر دەستا نییە " بەڵام کەمێك لە هونەری کەنیسەی گوتیك –مان بۆ ماوەتەوە.

ئەم هونەرەش هەرگیز بەناوی هونەر نەیاندەناساند و نرخێکـی ئـەوتۆیان بـۆ دانـەدەنا ... گۆزەگەرییەکانی سەدەی ناوەڕاست کرچن و پەروەردەیان نەکردووە و واتـە کارامـەیی هونەرییان پێوە دیار نییە . بەڵام لە ڕووی هێزی هاوسەنگی و هێڵی دەرەکییەوە هـەروەها لە ڕووی بەدی هێنان و شکڵ و قەبارەوە – لە ڕووی بەیانی ڕاستەوخۆی وێنـەیی یـەوە – من جگە لە هەندێ دەفری گۆزەیی و پەیکەری بۆشـی چـینی سـەر بـە قۆنـاغی زنجـیرەی چـوو = ) 255 – cho1122 پ . ز )و هەنـدێ لـە پەیکـەری کـاری ڕەشپێـستەکان – زیـاتر شتێکی ئەوتۆم لە بەردەستا نییە کە شایەنی لێکچواندن و هەڵسەنگاندن بێت بە باشـترین دەفری سەدەی ناوەڕاست .

دوو کۆتـایی تـەوەری هونـەر لـە سـەدەکانی ناوەڕاسـت دا بـە یـەکتری دەگـەن : لـەم شتانەدا ئێمـە تـەنها ڕووبـەڕووی بـەیانی سـادەی ویـستی سـەر بـە وێنـە دەبینـەوە ... لـە پەیکـەری سـەرو دەسـتی شـکاودا کـە لـە ( وێنـەی 36 )دا دەیبیـنین تـەواوی جـوانی و گیاندارییەکی زۆری ئایینێك لە پەیکەرێکی بەردین دا ڕەنگی داوەتـەوە ..., لەگـەڵ ئەمـەش دا گۆزەی سەدەی ناوەندین لەم جۆرە پەیکەرە کەمبەهاتر نین ... ئەمەش زیاتر دەتوانین پێداگرین و بڵێین " سەدەی ناوەڕاست بەبێ بـوونی ئـەو هونـەری گۆزەکارییـە نـەیتوانیوە پەیکەرێکی وەها بەدی بهێنێت ، یەکـەمیان سـەرەتایی و سـادەیە و دووەمیـان ڕوحـانی و بەنرخ " بەڵام هەردوکیان خاوەنی ئەو یەکە وێنەییەن کە بەبێ ئـەو هـیچ شـتێکی هونـەری شیاو نییە .

## 49 – گوتیکی ئینگلیزی

لە ئینگلتەرە ، هونەری ڕەسەنی خەڵکی لە سەدەی ناوەڕاسـت دا هـەرگیز زیـادەڕۆیی بەسەر هونەری کەنیسەدا نەکرد ، بەڵام ئەو هونەرەی بە شێوەیەکی قوڵ ئاڵوگۆڕ کرد .

لە ڕەوتی ئەم گۆڕانەدا هونەری کاهینی هێدی هێـدی چـۆنێتیی نێودەوڵـەتی خـۆی لـە دەستداو خاسییەتی ناوخۆیی پەیدا کرد .

لە سەدەی دوانزەیەم و سیانزەیەمدا سەختە بتوانین هونەری فەڕەنساو ئینگلتـەرە لـە یەکتری جیابکەینەوە " بەڵام لەسەرخۆ جیاوازیی ناجۆر والا دەبێت ، شێواز کە بەشـێوەی شتێکی ناخودی "غیر شخصی " بەدی هاتبوو ، لایەنی خـودی " تاکەکەسـی " پـەیداکرد ... لە هونەری ئینگلیزی دا چۆنێتییەك سـەر هەڵـدەدات کـە لـە ڕوانگـەی منـدا بێجگـە لـە ووشەی "شیرین" بە شتێکی تری ناونابەم ، مەبەستیشم لە شیرین تەنها نیانی و ناسـکییە دەرهەق بە جوانی شتە سادەکان ( گەڵا – چرۆ– گـول– گیانـدار– منـداڵ ). پاشـان ئـەم مەیلدارێتییە بـەرەو هەسـتیاریکردن چـوو و بـە دارمـان گـەیی " بـەڵام تـا ئـەو کاتـەی کـە

لەبەردەوامی و برەودا بوو " چێژێکی ڕاستیانە و خۆشڕوویی کە تیایدا بەکار دەبرا ، لەڕەوتی گەشەی هونەری ڕۆژئاوادا شتێکی سەر بەتاکە کەس بوو.

بەلاّم لەم هونەرەش تاکە بەرهەمێکی زیندوو لەپاش بەجێ نەماوە .کەنیسە گەورەکانی ئێمە لە ڕاستی دا قالّبێکی غەمگین و شکۆی جوانیی ڕابردووی خۆیانن " ئەو کەنیسانەی کە هەریەکەیان پارچەیەك گەوهەری بێگیانی جوانی بوون ، ئێستاکە بێجگە لە کۆشك و تەلاری خالّی شتێکی دی نین، ئەو زیانەش کە لە تاعونی ترسناکی تۆلّەسێنی گیانی بە " پوریتانیزم " ناسراو کەوتەوە و هەلّمەتی بردە سەر وێنەکێشانی ئینگلیزی و شیعری ئینگلیزی و مۆسیقا و سەمای ئینگلیزی – زیانی لە توانای تێگەیشتنمان بەدەرە و نا شایەنی باوەڕ کردنە .

## 50 – هونەری ڕێنیسانس

هونەری ڕێنیسانسی ئیتالیا جێ تۆژینەوەی هێندە بەر بلاّوە و هێندە دووپات و پڕ سەرنج دەربارەی تۆژیونەتەوە کە لەم یاداشتەدا کورتەیەك دەربارەی بەسە .

تابلۆی بێ شوماری مامۆستایانی ئیتالی دەمانترسێنێ بەجۆرێکی وەها کە دەشێ چاوەکانمان دابخەین و لە ئەزمونی سەرسوڕێنی هونەری ئیتالی تێپەڕین یا لابدەین . بەلاّم ئەگەر گۆشەیەکی تەسك بکەینە جێ باسی تۆژینەوەمان " بۆ نمونە تەنها گوێ بە هێلّکارییەکانی کەلّە مامۆستایانی ئیتالّی بدەین " ئەوا دەشێت لەو مەترسییە خۆمان پڕ هێز بکەین .

دەربارەی هێلّکارییەکان " دەتوانین لە پەیوەندی ڕاستەوخۆتردا بین لە گەلّ کەسێتی هونەرمەندەکان دا

تابلۆی هونەرمەندەکان چەندینجار دەستکاری کراون – چونکە ئەگەر دووبارە وێنە نەکێشرێتەوە — ئەوا ناچار ڕەنگەکانیان دەپەڕێ و لە کالّ بوونەوە و پرواندنیان دا نادیار دەبن ... تێپەڕینی کات پەردەیەکی تەڕ و تازەی بەسەر ئەو تابلۆیانەدا داوە .

ئەو تابلۆ هونەرییانە ئەگەر بهاتایە و دووچاری ئەم عەیبـە بـچوکانە نەهاتنایـە، دەشـیا ئەم کۆ سپەیان هەبوایە کەخەڵکی سـادە دووچـاری ترسـێکی کـەم دەبـوون لـە ڕووبـەڕوو بونەوەیان دا لە بەرامبەر ئـەم شـاکارە هونەرییـە مەزنانـەدا کـە هونەرمەنـد کـۆی هـۆش و شارەزایی خۆی تیا خستۆتە کار .

بۆ تێگەیشتنی تابلۆی وەك " دارکاری کردنی عیـسا " بەرهـەمی پـیرۆ دیلافرانچیـسکا (وێنە 17) گەر بمانەوێت لە ڕادەی باڵای کاریگەریی ئەو تابلۆیە تێبگەین بە تـەنها پەرچـە کـرداری هەسـتی کـافی نییـە ...چـونکە خواسـتمانە بـزانین لـە بـیری هونەرمەنـد دا چـی ڕوویداوە ... بۆچی خودی بابەتی دارکاریکردنی لە ژێر سایەی سێ ئەنـدامی پـڕ نهێنیـی دا کە لە پێشەوەی تابلۆدا وەستاون بەدی هێناوە " و بۆچی ئەم تابلۆیـە بـە گـشت سـەیر و سەمەرەی خۆی توانیوێتی بەم شێوەیە سەرسوڕێنە وێنەی بارودۆخی مەبەستی خـۆی بـە ئێمە بگەیەنێت ؟

بەڵام دەربارەی هیڵکاری بە هیچ یـەکێ لـەم بابەتانـە دەستەوەسـتان نـابین ... ئێمـە پەیوەندییـەکی ڕاسـتەوخۆ لەگـەڵ قەریحـەی هونەرمەنـد دا پەیـدا دەکـەین " ئەمـەش لـە ڕاستیدا دڵمان دەخاتە لێدان .

## 51 – هێڵکارییەکانی مامۆستایانی ئیتالی*

( مەبەست لە هێڵکاری = تصمیم ) ە بەڵام گرنگی هێڵکاریەکانی مامۆسـتایانی ئیتـالی پەیوەسـتی بەلێـدانی دڵـی خەڵکییـەوە نییـە ... دەکـرێ بـە ڕاسـتی دەربـارەی هونـەری هێڵکاری وتووێـژ بکرێت . بـەم مانایـە کـە ئـەو هونـەرە لـە خۆیـدا هونـەرێکی تایبەتـە و ڕاستەوخۆ پێشینەی وێنەکێشانی نیيە.

* دەکرێ نەخشە ڕاستتربێت بەکاربردن – بەڵام من هێڵکاری بە ڕاستتر دەزانم .

ڕاسکین جارێکیان پەنجەی بۆ ئەوە ڕاکێشا کە لە کۆی گەلەری یەکانی ئەوروپادا تاقە هێڵکاری یەکی لاوازی یا مندالآنەی ئوستاندانی گەورە بەدی ناکرێت " بەڵکو گشتیان هێڵکاری مامۆستایانەن و لێهاتویی هونەری بیان پێوەدیارە .

ڕاسکین ئەم خاڵە ی وەها ڕوون کردۆتەوە کە ئێمەی خەڵکی چاخی نوێ هەمیشە وا فێر کراوین یا هەوڵمان داوە فێر بین کە بەهۆی هێڵکارییەوە هەوڵی وێنە کێشان بدەین " لە کاتێکدا مامۆستایانی دێرین لە ڕێگەی وێنەکێشانەوە هێڵکارییان دەکرد " بە منداڵی فڵچەیان دەدایە دەستیان و ناچار دەکران بە فڵچە وێنە بکێشن یا هێڵکاری بکەن تا کاتێك نیازی وێنەکێشانیان هەبێ بە قەڵەم بتوانن قەڵەم بەهەمان کارامەیی فڵچە بەکار بەرن – یان بەچێچەوانەوە .

مایکلّ ئەنجلۆ فڵچەی وێنەی پەڕی نووسین بەکار دەهێنا ... بەلأم ئەو مامۆستایانە فڵچەیان لە ڕووی توانامەندی خۆیانەوە بەکار بردووە و ئەم کارەشیان بۆ نواندنی خێرایی بیرێك یا ئەندێشەیەك بەکاربردووە یا بۆ دیاری کردنی تایبەتمەندێتی مۆدێل " بەلأم هەرگیز قەڵە میان بۆ مەشقی وێنە کێشان بەکار نەدەبرد ."

ئەم وتانەی من دەیانسەلمێنم بە ڕوانگەی خودی خۆم مەرجی بنچینەیی هێڵکاری فێربوون بەیان دەکات لای مامۆستایانی دێرین .

ئەم هێڵکارییانە هونەرێکی جیاواز پێکدەهێنن جیاواز لە وێنەکێشان و پەیوەندییان بە وێنەکێشانەوە ئەمەیە کە هۆکارێکن بۆنیشاندانی خێرو دەستوبردی بینراوێك ( واتە سکێچی سەرەکی ) یان بیرێك کە لە پاشان دا ویستراییێت بە وێنەکێشان بەدیی بهێنن .

بەلأم پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بەڕوودانی خودی وێنەکێشانەوە نییە چونکە خێرا نووسین وا ناناسین کە مەشقێکی گونجاو بێت بۆ هونەری نووسین .

## 52 – هونەری نەخشاندن = هێڵکاری = Design

کاریگەریی هێڵکاریی مامۆستایانی مەزن ، بەشێکی بەهۆی شارەزایی فـراوان و دڵنیـای قەڵەمی دەستی مامۆستا بەدی دێت ، هونەرمەند قەڵەم بە لێهاتوییەکی وەها بەکار دەبات کە بە واتای ڕاسکین : جوانیی هەمان قەڵەمی ناوبراوە .

تایبەتمەنـدێتی دی هــەن دەربـارەی هێڵکـاری کـە چـۆنێتی تایبــەتی (هـێڵن) هێـڵ ڕەگەزێکە کە ئارامی و خرۆشی پێـوە دیـارە ، لێـدان یـا وەشـاندن و بـەکاربردنی هێـڵ بـە یاریدەی قەڵەمەوە خێرایی پێوە دیارە و ناشایەنی چککردنەوەیە " بە پاڵپشتی کـێش لـە جێگەی بینایدا.

هەڵبەتە هێڵکارییەکان لەڕووی مەبەسـتەوە لـە یـەکتری جیـاوازن ، بۆیـە جۆرەکانیـان هەمان شێوە جیـاوازە...هەنـدێ نەخـشە جـۆرە حاڵـەتێکی ژیـان بـەخش یـان تیـشکێکی ناگـەهانی ڕۆشـنایی دیـدە بـەدی دێـنن وێنـەی نەخـشەکانی کاراپاچـیو = Carpaccio " نیـشاندنی ئـایینی " " هەنـدێکی دی" ڕاهێنـان "ی پـڕ سـەرنجن کـە بـۆ مەبەسـتێك یـا بابـەتێکی ناسـراو بـەدی هێنـراون وەك " ڕاهێنانـەکانی = مەشـقەکانی " پیـسانیللۆ = Pisanello دەربارەی گیانداران ( وێنە 38).

بـەڵام لـە کـۆی ئـەم جـۆرە هێڵکارییانـەدا ئاگادارییـەکی تایبـەت دەربـارەی دیـدی هونەرمەند بەدی دێت ، هونەرمەنـد و بینـەریش سـەربەخۆیان لەهـەر سـاتێکدا سـەرنج لـە شـتێکی تایبـەت دەدەن ، زۆربـەی تابلۆهونەرییـەکان سـەرنجی بینـەر دابـەش دەکـەن " سەرەتا سەرنج لە پەیکەری دەستی چەپ دەدەین ، پاشان سەرنج لە کۆمەڵـەی دەسـتی ڕاست و لـە دواییـدا دیمـەنی دوور و پردێك کـە لـە دیمەنەکەیـدا ولآخێـك لەسـەر پردەکـە دەبینرێ لە حاڵەتی ڕێکردن دا ، بۆیە ناچار خۆمان دەبینین کە تابلۆ هونەرییەکە لە پـێش چاوماندا کوت کوت و دابەش بکەین و لە دواییدا هەوڵ بـدەین ئـەو پارچـانە لـە هەسـتماندا پێکەوە لێکدەین و تێیان بگەین ... هەوڵ دەدەین تا گشت ئـەو بەشـانە کـە سـەرنجی نـا

تەبای ئێمەی گرد کردۆتەوە لە یەکەی بینایەکی تەواودا پێکەوە دارێژین و مەبەستی کێش و وێنــەی هاورێــژە و بۆشــایی = ئاتمۆســفار —و بــەهای ڕەنــگ بخەینــە ڕوو، ئــەو کاتــە بەتەواوی تابلۆکە و بەشەکانی لە یەکەیەکدا لە هزری بینەردا بەرجەستەدەبێت .

سەرکەوتویی تابلۆ پەیوەندە بە پێکەوە بەستنی پارچەکانەوە لـە زەینـی بینـەردا ... هەڵبەتە لە ڕاستی دا ڕوودانـی ئـەم تێکـەڵ کـردن و پێکـەوە بەسـتنە غـەریزیترو خێراتـرە لەوەی بە چەند وشەیەکی ناشیانە بتـوانین بـەیانی بکـەین ... جـۆرە تابلۆیـەك هـەن کـە دیدەی مـرۆڤ دەربارەیـان بەهـەمان ئەنـدازەی هێڵکـاری گرنگیـی هەیـە — هـەمان شـێوە هێڵکاریی ئاڵۆزیش هەیە کـە بەئەنـدازەی تابلۆیـەکی وێنەکێشراو شـایەنی ڕوونکردنـەوەو شیکردنەوەن .

بەلاّم بەپێی عادەت هێڵکاری ئەو پایەی هەیە کە بەدی هێنەری پارچەیەکی بـچوکە لـە ژیان — وەك تابلۆیەك ، پۆرترێتی کەسێك ، شکڵی ماسولکەیەك ، بینای گوڵێك " هێڵکـاری شـتێکە لـەم جـۆرە و لـە هـەمان کـاتیش دا دیـارترین شـوێنەواری دەسـت و پەنجـەی هونەرمەندێکە کە بۆمان بەجێ دەمێنێ .

بەسەرداچـوونەوە لــە هێڵکــاری دا تــەنها بنـچینەی پێویـستی ڕەخنــەی زانــستیی هونەرنییە، بەڵکو چاترین وەرزشە بۆ هەستیاریی مرۆڤ .

شێوازی تایبەتی هـەر هونەرمەنـدێك زیـاتر لـە هێڵکارییـەکانی دا دەردەکـەوێت " ئـەم خاڵەش بە تایبەتی دەربارەی مامۆستایانی گەورەی ئیتالی ڕاستە.

هێڵکارییــەکانی ئــەو مامۆســتایانە گەلاّیــەکن لــە دەفتــەری یاداشــتەکانیان ، ئــەو دەفتەرانەش ( پێش ئەوەی بلاّو بکرێنەوە ) تەنها بـۆ یاداشـت کردنـی بـیر و ڕای تایبـەتی بەکار دەبرێن ... یاداشت نووسیش دەربەستی ئـەوە نایـەت کـە کەسـانی دی سـەرنج لـە دەستنووس و دەستکردەکانیان دەدەن ، ئەگەر چی ئەوان تەنها بەخواستی دڵـی خۆیـان و بۆ قوڵبوونەوە لە بیرەکانیان دەنووسن و هێڵکاری دەکەن ... بۆیـە وا دەردەکـەوێت کـە هونەرمەندانی ڕێنیسانس کەسانێ بوون کە زەینیان دووچاری پشکنینی زەینی = یا بـیری

بووە " وەك لیۆناردۆ کە مەیلی خولقاندنی گیانداری ئەفسانەیی تاك شاخ = قۆچ و پەریی مرۆڤ شێوەی هەبوو ... هەروەها قاڵبگەریی تۆپ دروستکردن و دروستکردنی گوڵە کێویلەی مەیل دەکرد.

نمونەی دووەم سینیورلی = Signorelli و پولایولو = Pollaiuolo یە ئەم دوو هونەرمەندە هەمیشە هەوڵیان دەدا پەیکەری بزێو لەحاڵەتی جوانی دا بەدی بێنن " هەروەها مایکل ئەنجلۆ کە توانامەندی و ئەندامکاریی بابەتە بینراوەکانی تاقی دەکردەوە .

ئەم هونەرە هێڵکارییە هێندە گرانە کە مەترسی ئەمە دەکەین لە کاری ڕەسەنی هونەرمەند ، واتە وێنەکێشان و پەیکەرسازی تێنەگەین ... بەم شێوەیە پێویستە ئاگادار بین کە هێڵکاری هونەرێکی جیایە ... کاتێکیش سۆراغی وێنەکێشان یان پەیکەرتاشی دەکەین : ڕووبەڕووی بەهای تر دەبینەوە.

## 53 – هونەری هزری = عەقڵی

ڕێگەیەکی دی بۆ گەیشتن بە هونەری قۆناغێکی وەك ڕێنیسانس ئەمەیە کە هەستیاری نوێی خۆمان وەکار بخەین " پێویستە چۆن ناوی پرشنگداری لیوناردۆ و ڕافائیل و مایکل ئەنجلۆ پۆلداری بکەین ؟

هەر سەردەمە خاوەنی تەرتیبی خۆیەتی کە پەیوەندە بە قۆناغێکی کاتی و هەستیاری ئەو سەردەمە خۆیەوە .

چییەتییەك لە بەرهەمی ئۆچلو = Uccelo — دا گریمانە ؟ ئەم بەرهەمە مانای چییە بۆ هەستیاری ئەم چەرخە نوێیەمان ؟

ئایا ئەم چۆنێتییە لە بەرهەمی کۆی مامۆستایانی هونەرمەندی ڕێنیسانس دا بوونی هەیە ؟ ئایا چی شتێك ئەم چۆنێتییە دیاری دەکاو داوەرە بەسەر پێودانگ و زانستەکانی هونەردا ؟

ئۆچیلۆ زۆرجار والآکەری دووری نیشان دانە = پێرسـپێکتیڤ = Perespective هـەروەها زانستی دیمەن و بینراوەکان " بەلاّم ئـەم دووری نیـشان دانـە ئەگـەر بێـت و بەشـێوەیەکی سنوردار دەسنیشان نەکرێت ، ئەوا بیّ مانا دەبێت .

ئۆچیلۆ داهێنـەری پێرسـپێکتیڤ نییـە ، بـەڵکو یەکـەم هونەرمەنـدە کـە زرنگانـە لـەو بوارەدا ئۆقرەی گرتووە و چێژی لە دیمەکانی بینیوە ... ئەو پێرسپێکتیڤی بە شێوەیەکی پێویست بەکار دەبرد " نەك تەنها لـە پێنـاوی ئـەوەدا کـە ڕوویـەکی ڕاسـتی بـەتابلۆکانی بدات بەڵکە لە پێناوی ئەوەدا کـە تـابلۆو وێنـەکانی خـۆی ڕاسـتگۆش بکـات ... تـابلۆی " تێکشکانی سان ڕۆمانۆ" نمونەیەکـە لـەم مەبەسـتە : هاوڕێـژەی بنـچینەیی لـەم تابلۆیـەدا هاوڕێژەیەکـە لـە نێـوان هێڵـی نێزەکـان و سـتونەکان دا و بەشـەکانی پـشتەوەی دیمەنـە دوورەکانی ناو تابلۆکەدا بەدی هاتووە .بەکاربردنی ڕەنگ بە ڕوویەکی ویستراو تەنانەت بە ڕوویەکی بڕیاردراو هـەمان شـێوە هاوتایـە لەگـەڵ پێرسـپێکتیڤ دا –هەسـت دەکـەین کـە ئۆچیلۆ ڕەنگەکانی ڕاسـتەوخۆ لـە ڕوانگـەی جوانکارییـەوە بـەکاردەبرد ، هەرچـەندە ئـەم جۆرە بەکار بردنە شوێنەواری ڕاست وەڕوکەوتنی ڕەنگەکان لاواز دەکات ، ئەم خاڵەش لـە تابلۆی جوانی " شوێن شکار لە شەودا " بە ڕۆشنی ئاشکرا دەبێت .

بـەم پێیـە چـۆنێتییەك کـە ئۆچـیلۆ – مـان لا گـرنگ دەکـات بریتییـە لـە بـەکاربردنی ئاگایانەی هۆکارێك کە لەبەر دەستیدا بوو – واتە ئۆچێلۆ هونەرمەندیّ یا وێنەکێشیّ نەبوو کە بەشێوەیەکی ناخود ئاگایانە و بەزەبری هەستەکانی خـۆی وێنـە بکێـشیّ : بـەڵکو ئـەو ئاگایانە " عەقلانە " و بە ڕوویەکی ویسترا و گریمان کـراو ، لەسـەر بناغەیـەکی هـزری کـە پێشتر بەئاگا بوو لێی کاری دەکرد .

هەندێکی دی لە هونەرمەندانی ڕێنیسانس هەمان شـێوە لـەم چـۆنێتییەدا هاوکـاری ئـۆ چـولۆن – بـۆ نمونـە ئانـدرنا دولاکاسـتانیۆ و کوزیموتـورا = Cosimotura و لـە گـشتیان بالآدەس تر پـیرۆ دێلافرانچیسکا – یـە . چـۆنیتی دەرەکـی ئـەم هونەرمەندانەیـە زۆر لـە

یـەکتری جیـاوازن ، بـەلاّم گـشتیان بەیاریـدەی چـۆنێتییەك کـە دەتـوانین بـە شـێوازی — پێشین— Apriori ناوی بەرین دیاری دەکرێن و دەناسرێن.

لە ڕاستی دا فرانچیسکا دەکـرێ بـە یەکـەمین هونەرمەنـدی کۆبێـست — نـاو ببرێـت و تـابلۆی وەك " لێـدانی حـەزرەتی مەسـیح " ( وینـە 38 ) خـاوەنی داڕشـتنێکی تـەواو ئەندازەیی یە کەلە چوارلای بەدوای یەکدا هاتووە پێك هاتوە . پیرۆ دیلا فرانچیسکا مژدە بەخشی قەریحەیەکی نوێیە لە هونەردا .هونەرمەندێکە هەسـتەکانی خـۆی بـە شـێوەیەکی بنچینە هزری بەدی دەهێنا ، تەنانەت نامەیشی دەربـارەی ئەندازەگـەری هەیـە و ئەمـەش ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە گریمانی هزری بوونی کارەکانی ئەو خەیاڵێکی نوێ نەبووە .

هەمان چۆنێتی بە هزری بوونی هونەرمەندانی وەك پیرۆدیلا و ئۆچێلۆیە کە دەبنە هۆی بـەدی هێنـانی قەریحـەی نـوێ : چـونکە مەیلـداریێتی ڕەسـەنی هونـەری نـوێ . سـەرەڕای چەندین زیاڕۆیی کردنی ئیکسپریسۆ نیستی — لـەو ئاراسـتەیەدا بـووە کـە ڕەگـەزی بـەدی هێنـانی هزریـان هێناوەتـە نێـو هونـەرەوە ... لەبەرئـەم هۆیەشـە کـە بـە پێـچەوانەی چـاوەڕوانکردنی زوربـەی ڕەخنـەگرانی هونـەر هێـشتاکە وێنەکێـشانی ئەبـستراکتی لـە برەودایەو بەدیهێنەری شێوازی وێنەیی هونەرمەندانێکە کە دەشێ بە بەیانکەری قەریحەی نوێ بناسرێن لە هونەردا، نمونەی ئەم هونەرمەندانەش — بن نیکلسن = Bennicholsen و نائۆم گابۆ =Naum Gabo — یە .

بەلاّم ئایا مەبەست لە هێنانە ناوەوەی ڕەگـەزی هـزری لـە هونـەردا چییە ؟ مەبەسـت تەنها بریتییە لە حەقی بەکاربردنی هێزی هزری بەناونیشانی بنچینەی هونەر .

بۆچونی هزری هەرگیز ناکرێت بە مادەی یەکـەمی هونـەر بزانرێـت " لەلایـەکی دییـەوە سۆزە بەدی نەهاتوەکانی وێنەکێشیش لە نائاگایی دا هەمان شێوە ناشێ ماددەی یەکەمی هونەر بێت .

لـە وێنەکێـشان دا هـەمان شـێوە وەك شـیعر بۆچـونەکان یـا سـۆزەکان خـاڵی دەستپێکردنی بەدیهێنانی تەواوی قەریحەی مرۆڤە کە بە بەرهەمی هونەری ناودەبرێت .

ئـەم بەدیهێنانـە یـا خۆویـست و بڕیـار دراوە ، یـان غـەریزەیی " لـە هـەردوو بارەکـەدا کۆیەکی کاملە کە دەتوانیّ کۆی هەستەکانمان بە خۆیەوە سەرگەرم بکات .

## 54 — ڕیالیزم

لە میانەی نێوان هونەری ئایـدیالی ڕێنیـسانس و هونـەری هـزری دا ئەمڕۆکـە جۆرەهـا قۆناغی خەیاڵی و ڕیالیزم بەدی دەکرێت .

ڕیالیزم یەکێکە لە هەرە ئالۆزترین وشە کە لـە رەخنـەی هونـەری دا بـەکار دەبرێـت ، بەڵام ئـەم ئالۆزییـە نابێتـە ڕێگـر بـۆ زۆر بەکارنـەبردنی ... لەسـەر ئـەم بۆچـوونەمان ئـەم ناونیشانەی ڕیـالیزم هـەرگیز جێگـەی ڕەزامەنـدی و قبـوڵی هـیچ قوتابخانەیـەکی هونـەری نەبووە .

لـەبارترین مانـای وشـەی ریـالیزم دەشـیّ لەبـەکاربردنی فەلـسەفییانەیدا بێـت . لـە فەلـسەفەدا ریـالیزم یـان لـە ڕوانگـەی مێژوویـیـەوە بەرامبەرەکـەی " نومینـالیزم " (ڕەسەنایەتی ناولێنان) ە و بە شاکارێکی گشتی تر ناوی تیۆرێکی تایبەتە لە بواری زانست دا و لە باوەڕیّ دەدوێت لە پشتبەستووە بە ڕاستییە دیدەییەکانی جیهانی دەرەکی .

تێڕەوانی ڕەخنەی ئەدەبی بیّ گومان لە سەرەتادا ئـەم زاراوەیـەیان واتـە ڕیـالیزم لـە فەلسەفەدا بەڕووتی وەرگرتووە و بیّ ماوەدان ڕاستی مانای وشەکە لە نێو چووە .

نووسەری ڕیالیزم کەسـێکە کـە ئاشـکراو بـە ڕووکـەش لـە هەڵبـژاردنی بـواری ژیـان دا لایەنگرییەکی تایبەت نیشان دەدات ، بەڵکو دیمەن و ئادەم وشتەکان بەوجۆرەی کـە وەڕو دەکەون و چاو دەیانبینیّ پێناسی دەکات .

بەڵام لە ڕاستی دا لەو جێگەیەدا کە هونەر هەمیشە پێویـستی بـە هەڵبژاردنـە ( ئەگـەر چی بە بەڵگـەی کـەم جێگـەیی و ڕێنمـایی ئـابووری ) . نووسـەری ڕیالیـست کەسێکە کـە بوارێکی تایبەت لە ژیان دەخاتـە ژێـر چـاودێرییەوە و ئـەوەش ئـەو بوارەیـە کـە لـە هـیچ جێگەیەکدا پێناس و ژیاندنی نییە .

تێڕوانینی فەلسەفی ڕەخنەی هونەری کەمترە لە ڕەخنەی ئەدەبی ، چونکە ڕەگ و ڕیشە و چڵ و گەڵای ئەو برەوی هەمان ڕەخنەی ئەدەبییە لە زەمینەی هونەردا .

ئەو هونەرەی کە دەکرێ بە مانای تەواوی وشە بە ڕیالیستی ناو ببرێت " هونەرێکە بەهەر شێوە و هەوڵێك هەوڵ دەدات دەرکەوتی دەرەکیی شتە بینراوەکان نیشان بدات ... ئەم جۆرە هونەرەش هەروەکو فەلسەفەی ریالیزم باوەڕی بەڕاستیی ڕووکەشی دیدەیی شتەکانە.

ئیمپریسیونیزمی سەدەی نۆزدەیەم جۆرێکە لەو هونەرە ، بەڵام لە ڕاستی دا ئیمپریسیونیستەکان جۆرە ڕیالیزمێکی زانستیانەیان لە شێوازی کارەکانیان دا تێکەڵ بە تەرزی بینگەیان کرد کە زیاتر ئایدیالیستی بوو و دەکرێ ئەو شێوازەی ئەوان بە هۆنینەوەیی = غەزەلیات ناوبەرین . بۆبینینی وێنەکارییە ڕیالیستییەکان ، بە مانای وشە کە بەگشتی شایەنی پەسەندن ، پێویستە چاو بە وێنەکێشانی هونەری هۆڵەندی دا بگێڕین بەتایبەتی بەرهەمەکانی – ڕۆبنس و پیتەر برۆگل = Pieter Brueghel .

## 55 – کۆپی کردن = دوپاتکردنەوە .

جۆرج مارلی =George Marlier لە وتارێکدا کە لە " کۆنگرەی نێودەوڵەتی مێژووی هونەر " دا خوێندییەوە لە برۆکسل ، ساڵی 1930 " جیاوازییەکی دیاری کرد کە مەسەلەکە زۆر ڕۆشن دەکاتەوە .

مارلی وتی " پێویستە لە نێوان ڕیالیزم دا کە بە مانای کۆپی کردنی موو بە مووی ڕاستی دێ و ڕیالیزمێك کە بەمانای نیشان دانی دیمەنی ژیانی هەژارانە جیاوازی بکەین .

کاتێ کە دەربارەی مەکتەبی وێنەکێشانی هۆڵەندی دەدوێین " زۆر جار سروشتیانە خەڵکی مانای یەکەم لە پێش چاودەگرن ...

بەلأم بەپێی نیازەکانی مارلی دەربارەی هونەری هۆڵەندی لە سەدەی یانزەیەمەوە تاوەکو سەردەمی ئێستا نیشان دەدات ، بۆچونی یا رەچاوکردنی لەو جۆرەی ریالیزم لەو ماوەیەوە تا ئێستا دەگمەن بوونی هەبووە .

لە وێنەکێشانی هۆڵەندی دا هەمیشە شێوازێکی دیاری کراو بوونی هەبووە ، گا مەبەستمان لە وێنەکێشانی هونەری هۆڵەندی بەرهەمەکانی سەدەی پانزەیەم بێ کە ملکەچی دا بەبڕیار دراوەکانی سەدەی ناوەڕاست بوو — و گا لایەنی خۆکردی بەرهەمی وەك ڕۆبنس — و— یوردینس —ە = Jordaens —و پەیڕەوانیانە و گا شێوازی سەرسوڕێنی و خەو ئاسای هونەرمەندانی نوێ تری وەك جیمز ئانسۆر = James Ensor و — فریتس ڤان دن بێرگ = Frits Van Den Berghe — ە... لەهەر حاڵەتێکدا پێوستە گوێ ڕایەڵی ئەمە بین کە لە هیچ یەکێك لەو مەکتەبە وێنەکێشانە هۆڵەندیانە دا مەبەست لە هونەر و وێنەکێشان دووپاتکردنەوە و کۆپیی جیهانی دەرەکی نییە شێوەی موو بە موویی .

لە ڕاستی دا لە هونەری هۆڵەندی دا شکۆ و جوانیی هونەری دەرباری نابینرێ ... وێنەکێشانی هۆڵەندی هونەری خەڵکی چینی بۆرژوایە ( کاسبکار) و بە پێی خواست و مەبەستەکانی بۆرژوا بەدی دێت .

کارێکی بەد نییە بابەتی " ستایشی مەجوسەکان" لە پێش چاو بگرین و ببینین کە تەرزی وێنەکێشانی ئەم بابەتە بەدەستی دوو هونەرمەند دا کە نمونەی مەکتەبی ئیتالی و مەکتەبی هۆڵەندین چی جیاوازییەکیان هەیە .

بۆنمونە لەم بارەیەوە تابلۆی ڤینسێنزۆ فووپا = Vincenzo Foppa لە پێش چاو دەگرین، لەم تابلۆیەدا خودی حەزرەتی مریەم بەشێوەی ئافرەتێکی ئایدیاڵی نیشان دراوە و ویقارو ئارامییەکی زۆری هەیە " مەجوسەکانیش نمونەی ویست ئازایەتی و جوانە مەردین ، لەسەرو سیمای ئەندامەکا ن دا نەجابەت و ئەدەب سەر شارە .

ئێستا لە هەمان تابلۆ دەربارەی هەمان بابەت دەڕوانین لە مەکتەبی هۆڵەندی دا کە تابلۆیەکی مابوزە = Mabuse کە بێ بەرییە لە بریك و باکی جوانی ، بەم شێوەیە دەبینین

کـه حـەزرەتی مریـەم لـەم تابلۆیـەدا ئـافرەتێکی ئایـدیالی نییـە و بـە تـەواوی دیـارە کـە ئـافرەتێکی خانـەدانی هۆلەندییـە ... مەجوسـەکانیش خـاڵی نـین لـە نەجابـەت ، بـەڵام ڕوخساری ئەوان کە بێ شك لەبەر مۆدێل دا کێشراوە دڵتـەنگی و شـەهوەی ژیـان نیـشان دەدەن ... بەسەر گروپی کەسـەکانەوە چـەند فریـشتەیەك لـە حاڵـەتی فـڕین دان ، بـەڵام لەبەشی خوارەوەدا ڕاستەوخۆ لە پێشەوەی تابلۆدا بەرد فەرشی شکاو بەرچاو دەکەوێت و دوو توولـە سـەگیش دەبینـرێ کـە یـەکێکیان سـەرگەرمی جـوینی پەرچـە ئێـسکێکە ... مـابوزە تایبەتمەنـدە لـە نێـوان هونەرمەنـدانی ولاتەکـەی خۆیـدا لـەرووی شـکۆ وجـوانی بەخـشینەوە " کـاتێ دەگـەین بـە بەرهـەمی وێنەکێـشانی وەك پیتـەر برۆگـل - یـان - هیرونیموس بوش = Hieronymus Bosch ئێدی هیچ جۆرە هاوجۆرییەك بە ئایدیالیزم بەدی ناکرێـت ، مرۆڤـەکان نـەك تـەنها لـە ژیانـەوە وەرگـیراون ، بـەڵکو لـە ڕووی مەبەسـتەوە کەسەکان لەنێوان گەوجـەو بەدفـەڕدا وەر گـیراون ( وێنـە 41) . ڕووی یـان دیمـەنی ئـەم تابلۆیە پیسە و لە چارەی مرۆڤەکان دا شوێنەواری هۆش و نەزاکەت بەدی ناکرێت ... ئایـا برۆگل بەم کارە چـی مانایـەك بـەدی دێـنێ ؟ لەوانەیـە ئـەم کـارە بێجگـە لـە تێگەیـشتنی عادەتێکی سادە شتێکی تر نەبێت ، خودی برۆگل بابایەکی لادێی بوو " یوسـف دارتـاش و مریەمی کچ و هەموو شتێ سەر بەوان دێهاتی بوون ... برۆگـل دەیویـست ئـەم خاڵـە ڕوون بکاتەوە وە دەیزانی بە چەق بەستن لە سەر ئەم خا ڵـە ڕاسـتیی بەسـەرهاتەکان گـەورەتر ڕەنگ پێ دەداتەوە .

هەستیاریی و شکۆ و بەزەیی ئەم بابەتـە لـە هـیچ جێگەیەکدا وەك لـەم تابلۆیـەدا کـە نمونەی ڕێنمای کردنی ( ئایدیاڵ) ی ڕیالیستییە دیار نییە "

چونکە ڕیالیزم - یش لـە کۆتـایی دا فرمـانی ئایدیایەکـە - و تـەنها ئایدیالێکـە کـە لـە ڕەگەزی دڵخۆشکەرانەی جۆری مرۆڤ بوونی نی یە .

## 56 – ناتوراليزم = سروشتچێتی = سروشتیزم –

بەڵام بۆ تێگەیشتنی تەواوی شێوازی وێنەکێشانی هۆڵەندی پێویست دەکات پێناسمان لەمە زیاتر بێت ، بۆنمونە وشەی " ناتوراليزم " سروشتگەری " کـە دەشـێ لێـرەدا بـەکار ببرێت ، بۆ بەیانی مەبەستی مامۆستایانی دێرینی ئەم مەکتەبە زۆر زوو نەگەییو دەکەوێتـە ڕوو . لەم مەکتەبەدا ڕاستیگەری = واقعییەت هەمان ئایدیایە و ئەمـەش خـاڵی مەبەسـتی نادیارمان کەمێ لەبارتر دەکات .

هونەرمەندانی وەك ڤان ئایك = Van Eyck یان مێملینك = Memlink هەر وەکو هاوکارە ئیتالییـەکانیان شـێوەی مرۆڤـەکان لـە ڕاسـتی یـا لـە سروشـت ڕووت ناکەنـەوە و کـاری ڕووتەکاری واتە ئەبستراکشن تا ئەو جێگەیە بەردەوام نابێ کە شێوەی هاوبەشی شکڵەکان بگات بە مرۆڤێکی ئایدیالی. وێنەکێشی هۆڵەنـدی شـێوەیەکی دیـار واتـە سـادەو دواکـەوتو هەڵدەبژێرێت، ئەوەش بە عەشق وپەیوەندییـەکی وەهـا دەتۆژێتـەوەو وێنـە دەکێـشێ کـە کەسەکان بە کۆی ناجۆرییانەوە بەشێوەی باڵاترین ڕەنگدانەوەی ئادیالی هونەرمەنـد وەڕوو دەکەون هونەرمەند وەرو دەکەون .

تابلۆی " داخ کردنی پیرۆز فرانسیس " کاری یـان ڤـان ئایـك ( وێنـە 40) دەکـرێ بـۆ نمونە لەپێش چاو بگرین .

مێژووی ئەم تابلۆیـە لـە نێـوان سـاڵەکانی 1430–1440 – دایـە ... پێرسـپێکتیڤی باگراوندی ئەم تابلۆیە لە پێوانەدا بە بەرهەمی ئەم قۆناغە گەلێ بەهێز و سروشـتییە ... لـە خودی تابلۆکەدا درك و گوڵ و گەلاَ زۆر بە وردەکاری کێشراوە .

بەم شێوەیە تەواوی دیمەنەکە یەکەیـەکی ئایدیالییـە کـە بـۆ مەبەسـتی خـودی پـەنای بردۆتە بەر وردەکاری کردن . ئێستا بڕوانە پەیکەری خودی پیرۆز فرانسیس ، ئەگـەر ئـەم پەیکەرە بە مانای تەواوی وشە ڕیالیست بێت ، لێرەدا پێویست دەکات چاوەڕوانی بینینـی دیمەنێکی خرۆشێنەر بین – وەك ڕوخسارێك کە لەئازاردا تێکشێواوە و برینێك کـە خوێنـە

لێ دەچۆڕێ – بەڵام لێرەدا ڕووبەڕووی پەیکەرێکی مۆمیایی پیرۆزێك نابینەوە کە خاڵییە لە هەر جۆرە مانایەکی دەرونزانی ... ئەوەی دەیبینین وێنەیەکی ئارام و زیندووە کە لە ڕاستی دا لەبەر مرۆڤێکی ڕاستی دا کێشراوە .

گەر بمانەوێ ئەم خاڵە لە ڕووی هەریەکێ لە بەرهەمی مامۆستایانی کۆنی مەکتەبی هۆڵەندی دا بە نمونە بهێنینەوە گەر بمانەوێت : لەسەر ڕووی تابلۆی ناسراو بە میحرابی کەنیسەی پیرۆز باڤۆن= Saint Bavon لەخنت= Ghent " لەسەر ڕووی بەرهەمێکی دیی یان ڤان ئایك لە بروگز= Bruges کە ناوبانگی کەمترە بەڵام دەشێ نرخی زیاتر بێت. واتە تابلۆی مەریەمی داوێن پاك و پیرۆز دۆناتیان = St. Donatian و پیرۆز جەرگیس St.George ..لەم تابلۆیەدا حەزرەتی مریەم ئافرەتێکی تەواو سادەیە و ناشرینە ... منداڵ لە کۆشی دا لەڕو لاوازە ، پیرۆز جەرگیس سەربازێکی لاو و بەزەبروزەنگە ، شوێن سەرنجی تابلۆ کەسێکە بەناوی جۆرج ڤان دار پیل – ە = George Vander Paele و لەنێوانی پیرۆز جەرگیس و حەزرەتی مریەمدا لەسەر ئەژنۆ دانیشتووە ، یەکێکە لە ڕاستیترین وێنە کە لەسەرتاسەری وێنەکێشانی ئەوروپا دا دەبینرێت .

پاش ڤان ئایك دەتوانین ڕوو بکەینە بەرهەمەکانی میملینك کە بە باوەڕی من هونەرمەندێکی گەورەترە لە ڤان ئایك ، چونکە لە زۆر ڕووەوە لەو قوڵترە ، بەڵام لەهەمان کاتدا بابەتی ڕاستی وێنە دەکێشێ ، چونکە هەست دەکات بە وێنە کێشانی بابەتی ڕاستی دەتوانێ بابەتی ئایدیاڵی ڕەنگپێبداتەوە ... پێ دەچێ کە وێنەکێشانی هۆڵەندی بیانەوێت بڵێن کە بابەتی خواوەندانە تەنها لەنێوان وەچەی مرۆڤدا دەست دەکەوێت .

بروگل بەڕوویەکی باڵاتر ئەم گرێیەی بەو پەڕی توانا گەیاندووە و لە تابلۆی " هەڵاتن بۆ میسر " دا ناتوانرێ ڕوخساری یوسف و حەزرەتی مریەم لە نێوان کۆچەرەکان دا کە لە بەرگی میوانسەرایەکدا کۆبونەتەوە بەئاسانی بناسرێتەوە .

هەمان شێوە لە تابلۆی " کەوتنە خوارەوەی ئیکارۆس " دا تابلۆکە زیاتر وێنەی پیاوێك والا دەکات کە لە بەشی چەپی تابلۆکە دا خەریکە زەوی دەکێڵێ و وێنەی

کەشتییەك کە چارۆکەی هەڵداوە لە دەریا دا ، ئیکارۆسی بێ چارەش لە پای پارچە بەردە دوردەستەکانەوە دەستەودامانی شەپۆلەکانە.

برایانی برۆگل ، و هیرونیمۆس بوش کە بەر لەوان دەژیا و سرۆشبەخشی ئەوان بوو — نمایندەی جۆرێکی باڵاتری ڕێبازی ڕیالیزمن .

دەربارەی ئەم هونەرمەندانە ریالیزم شێوەیەکی خەیاڵیانەی لە خۆی گرتووە . هەمان شێوەکە لە لایەکەوە دەتوانین بە شتی ڕاستی دەستپێبکەین و بە ئەبستراکت بگەین کە شێوەی ئایدیاڵی کۆی ڕاستییەکانە ، بەڕووی پێچەوانەش هەمان دەکرێ بەشێوازێك بگەین کە نکۆڵی کەری کۆی ڕاستەقینە بێت — واتە ئایدیایەکی ئاشکرا ، وڕێنەیەك لە شکڵ و مەبەستداری و کۆتایی یەکان— لە جۆر و بەشێك گۆڕانکاری و هەڵس و کەوتێ کە شایەنی ڕەچاوکردن بێت لەسەر بنچینەی واقیع... بەیان کەرو گێڕەوەی زانستی جیاوازبێت " بروگلیش لە ڕاستی دا کاری وەهای هەیە کە ئەفسانەیین یا بەند و بالۆرەکانی کردووە بە بابەتی تابلۆکانی.

## 57 – ڕۆبنس

بەرهەمەکانی ڕۆبنس لە ئانتڤێرپ Antwerp زیاتر لەهەر جێگەیەکی دی شایەنی بینینە و ئەوپەڕی دەسەلآت و گەورەیی نمایندەی شێوازی فینلاندییە ، بگرە ڕۆبنس لەمانەش باڵادەستتر و زیاترە و لە مێژووی هونەردا خاوەن گرنگییەکی فراوانەو بۆ ئەو کەسانەی کە تێگەیشتنیان لە سروش و بۆ هاتنەوە ڕوویەکی ڕۆمانتیکی هەیە تا ڕادەیەك گێژن بەکارەکانی ئەو ... دەربارەی ڕۆبنس دەکرێ بەخاترجەمییەوە بە ڕۆتینی باو لەهونەردا بگەین .

هەر شتێکی باش کە لە ئەندازەی باشی تێ پەڕی ... کەمێك مەلەل بەدی دێنێ ، زۆربەی خەڵکیش ، ئەگەر دەمیان بکەینەوە دان بەوەدا دەنێن کە ڕۆبنس دوچاری مەلەلیان دەکات .

تراژیدیای هونەرمەندانی مەزن کە ژیانی خۆیان تەرخان دەکەن بۆ بەدیهێنانی ڕێژەیەکی زۆر لەبەرهەمی هونەری ئەمانەن کە سەرەنجام مەبەستەکانی خۆیان بار تەقا دەکەن ... دەشێ ئەمەش لە لاوازیی خۆمانەوە بێت ، بەڵام هەمیشە دڵخوازی شاکارەکانی پیرۆدیلا و ڤیر میر دلفت Vermeer of Delft — ین کە بەرهەمیان کەمترە و چۆنێتی بەرهەمەکانیشیان یەکدەستی ترە " بەڵام دەربارەی سەرو مرۆڤیی وەك ڕۆبنس بە شاباشێکی وشك و برنگ ڕازی دەبین ، چونکە بەرهەمەکانی نزیکەی هەزار و پێنج سەد تابلۆن .

چۆنێتی ئەو تابلۆیانەش هێندە جیاوازە کە چاترین بەرهەمی لە ئەژماردی چاترین ئەو تابلۆیانەن کە تاوەکو ئێستا کێشراون ... بەدترین بەرهەمی ڕۆبنس بەڕادەیەك ناجۆرن کە ناشێ لەبەرهەمی شاگردان و لاسایی کەرەوانی جیابکرێتەوە.

ئەگەر تەنها پەنجا تابلۆ لە بەرهەمەکانی ڕۆبنس لەبەر دەستا بوایە " ئەوا لە چاترین پلەی ئەو هیچ گومانمان نەدەکرد " بەڵام لەبەر ئەوەی هەزارو پێنج سەد تابلۆمان لەبەر دەستایە ، ڕازی نین کە یەکێ لەو تابلۆیانە ی خاڵی نییە لە کەم و کوڕی .

دەشێ ئەو تابلۆیانە ڕونکردنەوەی ڕەوان بێت ، بەڵام پێویستە کە ڕونکراوەکان روون بکرێتەوە تا بتوانرێت ئەوانە ڕەت بکرێتەوە ... نەك تەنها مەزنیی پلە و پایەی ڕۆبنس بەناوی هونەرمەند " بەڵکو گرنگیی ئەو بەناوی نمایندەیەکی بلیمەت بەئاسانی پەیوەستە بە پایەی ئەوو بەرهەمەکانی .

ڕۆبنس چواردە ساڵ بوو کە بەشێوەی شاگردێك دەستی بە ژیان کرد ، لەحەڤدە ساڵیدا خوێندنی وێنەکێشانی دەستپێکرد و لەبیست ساڵیدا بە پلەی مامۆستایی گەیی ... نزیکەی هەشتا ساڵ لە ئیتالیا سەرگەرمی سەفەر بوو ، گومانی تیادا نییە کە زۆر شت فێر بووە ، لە ئیتالیا کەمتر فێری وانە بوو کە لەڕوانگەی بلیمەتییەوە گرنگییەکی بنچینەی هەبێت .

ئۆژین فرۆ مێنتین = Eugene Fromentin چاترین داخوازی کە تاوەکو ئێستا دەربارەی ڕۆبنس نووسراوە لە کتێبی ئەودا بەناوی " مامۆستایانی پێشوو"= Maitres Of Autrefais

ـهـاتووه، باسـەکە لـە ڕسـتەیەکی کـورت دا کـورت دەکاتـەوە ... کـاتیٚ کـە ڕۆبـنس لـە سەفەری ئیتالیا گەڕایەوە " داوایان لێی کرد کە ڕاهێنانـەکانی خـۆی نیـشان بـدات ، بـەڵام ئەو لەتابلۆکانی زیاتر شتێکی تری پیٚ نەبوو تا نیشانیانی بدات . " ڕۆبنس لـە سـەرکەوتن و پێشەوە چوونی خۆی هەرگیز دودڵ نەبوو .

هەرچەندە دەشیٚ پەشیمان بـین لـەوەی کـە ڕۆبـنس ڕەخنـەی لـە خـۆی نـەدەگرت ، ڕاستی ئەمەیـە کـە ئـەم هونەرمەنـدە دڵنیـایی شـێوازی خـۆی لەهـەمان ڕێگـەدا بەدەسـت هێناوە .

بە دەربڕینێکی سادە ڕۆبنس پیاوی کار بوو و بە هەمان ئامادەیی وێنەی دەکێـشا کـە ئەوانی تر شمشێر بازییان پیٚ دەکرد یا وەکو جەنگاوەرێك ... هتد ...

ڕاست بڵێین وێنەکێشان کاسپیی ئەو بوو ، لە هەمان کاتدا کە پلەی دیاری کرا قیمـەتی خۆیشی دیاری کرد و جۆری ئەو تابلۆیانەی کە وێنەی دەکێشان پەیوەست بـوو بـەو ڕێـژە پارەیە وە کە وەریدەگرت لەبریدا . چۆنێتی کارەکانی بـە ڕوویـەکی ئاگایانـە نـەدەگۆڕی ، بەڵام دووری و هاوسەنگی و ئاڵۆزیی تابلۆی بڕیاردراو بە ڕوویەکی پڕ سەرنج دیـاری دەکـرد .

کـاری ڕۆبـنس تـەنها سـنوردار نـەبوو بـە وێنەکێـشانەوە ... لـەم بارەیـەوە هـەم دژایەتییـەکی بـەهێزی لەگـەڵ چـەمکە ڕۆمانتیکییـەکانی دا هـەبوو ... وەك دەزانـین دیپلۆماتێکی لێهاتووش بوو، گەلیٚ لە بابەتی تایبەت و نمایندەیی وڵاتەکەی لە ئەستۆدا بوو و لەم ڕۆڵەیشی دا بە ئەندازەی وێنەکێـشیٚ سـەرکەتوو بـوو ... ژیـانی تایبـەتیی بـەجوانی یاچاتر بڵێین بە وێل خەرجێتی تێکەڵ بوو " پێویستی بە جێگەو هۆکاری حەوانەوە وماڵو پارەی زۆر بوو .

لەگەڵ گشت ئەمانـەدا هەمیـسان بـە پێـچەوانەی بۆچـونی ڕۆمانتیکییەکانـەوە خـووی گرتبوو بە نەزم و ڕێکوپێکییەکی پڕ سەرنجەوە ... وەفا دار بوو دەرهەق هەردوو ژنەکـەی ... پەیوەندی سادە و سەر ڕاست بوو لەگەڵ هاوڕێکانی دا ... باوکێکی گەورە و میهرەبان

بوو بۆ خێزانەکەی ... فرومانتن دەڵێت " ژیانی پڕ بوو لـە ڕۆشـنی ، ڕۆبـنس ژیـانی خـۆی وەکو تابلۆکانی ڕۆشن دەکردەوە ."

فرومـانتن لـە کۆتـایی باسـەکەیدا دەڵێـت کـە لـەم ژیانـەدا هـیچ شـتێکی هێمـادار و گومانلێکراو بوونی نییە بێجگە لە ڕازی خۆشەویستی و بەروبوومی .

دەربارەی تابلۆکانی ڕۆبنس شتێکی نوێ بوونی نییـە بـۆ بـاس ... مـن تـەنها دەتـوانم چـەند خاڵێـك کـە پێـشتر دووپـات کراونەتـەوە یـاد بهێنمـەوە ، یەکـەم خـاڵ کاریگـەری سەرسوڕێنی کەسێتی ڕۆ بنس خۆیەتی کە لە کارە سەرەتایی یـەکانی دا دەبینـرێ ، واتـە بەر لە چوونی بۆ ئیتالیا و لە دواهەمین کاریدا کە لە دوای شەست ساڵی کێشاوێتی هـەمان کاریگەری دەبینرێ .

"کەسێتی " یەکێکە لەو وشانەی کە لەکاتی باسـی ڕەخنەلێگرتنـدا زۆر پێویـستی بـە پێناسکردن هەیە ... بەڵام ئێمە ناتوانین ئەوە بەبێ پێناس هەم دیاری بکـەین . دەتـوانین بڵێین کە ئامادەیی تاییـەت بـۆ فلانـە و بـۆ هـەمان ڕەنـگ ، بـۆ فـلان و بەهـەمان حاڵـەتی هۆکاری وێنە – بۆ هەمان جۆری داڕشـتن و– ئەوانـە نیـشاندەری ئـەو یەکەیـەن کـە هـەر مرۆڤێکی بلیمەت دەبێ پێی بگات .

دەربارەی ڕۆبنس ئەو یەکبونە هێنـدە دڵنیایـە – واتـە هونەرمەنـد لـە کـار و ئامـانجی خۆی هێندە دڵنیایە – کە شـیاوی هەڵـەکردن ڕەچـاو ناکرێـت ... هـەر فڵـچە وەشـاندنێك نیشاندەرو سەلمێنەری هاوسەنگی و هاوڕێژەیی یە لە کە سێتی ئەودا .

سـەرەڕای ئەمانـەش چـۆنێتی دی لـە بەرهەمـەکانی ڕۆبـنس دا بـوونی هەیـە کـە مـن دەتوانم تەنها بە ڕێگەی مەنفی پێناسی بکەم " ئەو چۆنێتییەش جۆرێکە لە نەبوونی ئایـدیا ، یان هەندێ جار جۆرە لەدەستدانێکی بەهێزیی هەستەکان بەدی دەکرێت .

ڕۆبنس بەئاگا بوو لە هەستی شکۆمەندی – لـە هەسـتی مـەزنی و تەقـەلای گیـان ... ئەو دەیزانی کە ژیانی هزر لـە کۆتـایی دا هـەمان ژیـانی لەشـییە ، وە ژیـانی هـزری ئەگـەر بکرێت خۆی لە بۆتەی چالاکیی ئەندامی دا بەدی بهێنێ ئەوا شتێکی بێ هودەیـە ... بـەڵام

لەم تێورەدا هیچ " پەیامێکی " ، خەیاڵێکی خۆشنودکەر ، یا ئەفسانەیەکی سەرسوڕێن ، یا فیرار لە ژیان بوونی نییە .

کەواتە دەبینین کە ڕۆبنس پەیوەندە بەو خاسیەتە گشتییەی هونەری هۆڵەندییەوە کە دەربارەی دواین و ئەویش بریتییە لە ئایدیای هەمان بابەتی ڕاستەقینە ... بەلآم ڕۆبنس ئەم خاسیەتە بۆ پلەی بالآتر پێش دەخات . وێنەکێشی وەك میملینك پەیوەندە بەبابەتی وێنەکێشانی خۆیەوە چونکە دەیزانی کە ئەم کەسانە بە گشت پیرۆزییەکیانەوە مرۆڤی سادەی وەك من و تۆ بوون ، بەلآم ڕۆبنس بە بابەتەکانی ئەوە دەڵێت ئەم پیاوانە یا کەسانە پیرۆزو بەناوبانگن ، تەنها لەبەرئەوەی مرۆڤن .

ڕۆبنس ژنەکەی خۆی هێلن فۆرمنت = Helen Fourment – ی وەك مۆدێلی مریەمی کچ بەکار برد " بەلآم ئەم کارە نیشانەی ئەوەیە کە بابەتەکە دنیایی یەو جێ گومانی ئەو نەبووە ، بەڵکو تەنها نیشانەی سادەیی ژیانە – واتە بەیانی ڕاستیی شتەکان بوو .

بەم شێوەیە ڕۆبنس نیازمەند بوو بڵێت کە گەورەترین ساتەکانی ژیان نە بۆ ئەوانە بەدی دێ کە چاوەڕوانین ، نە بۆ ئەوانەش کە شایەنیین . بەڵکو تەنها بۆ کەسانێ بەدی دێ کە بە ڕێکەوت لە ڕەوتی ئەم ساڵآنەدا بونیان هەیە .

بەلآم وا دەردەکەوێت کە ڕۆبنس لەلایەکەوە دوچاری لەرزانێکی شاراوە بوبێت ، ئەوەیش لە وێنەکێشانی حەزرەتی مەسیح دایە .

لەم بارەیەوە ڕۆبنس ئامادەیی شتێکی جیاوازی دژ بە بلیمەتیی خۆی هەست پێ دەکرد ... دەشێ لە بەرامبەر تەماشاکەرانی – ئایدیالیزمی ڕۆمانتیك – ی بەرهەمەکانی بووبێت کە لەم بارەیەوە بێ ئەندازە گۆشەگیری دەکرد .

تەنها لە دیمەنە گەورەکانی لەخاجداندایە کە ڕیالیزم – ی خۆی ناچار دەکرد کە هەر جۆرە هاوگونجاندنێ بخاتە لاوە " بەلای کە مەوە لەیەك تابلۆدا واتە لە " مەسیحی مردودا" کۆی لەباری هەست و ترسانی بابەتەکە بەیان کراوە – ڕاست بەهەمان بەڵگە کە ڕوخساری حەزرەتی مەسیح ڕوخساری لەشێکی ئەشکەنجە دیدەیە ( وێنە 42) .

# 58 – ئالگریکۆ

لەڕوانگـەی بـەهای جوانناسـییەوە ، پێویـستە ئـالگریکۆ ( وێنـە 16 ، 18) لەتـەك ڕۆبنس دا دابنێین ... کەسێتی ئەو دووە جیاوازیی هەیە کـە جیـاوازی بنـچینەیی شـێوازی هونەرییان بەدی دەهێنێت .

لێکـچونی نێوانیــان لــە بــواری ڕۆحــی و تەنانــەت لــە لایــەنی دیــدەی بەرجەســتە کردنیانەوەیە.

ڕۆبنس و ئالگریکۆ هەمان وەك ڕۆبنس بالآترە لە جیاوازییـە میللییـەکان ... ئـالگریکۆ وەکو شکسپیر خاوەن بلیمەتییەکی گشتییە ... لەگەڵ ئەم جیاوازییەدا کـە ئـالگریکۆ وەك شکسپیر دژ بـە گـشت هونـەرێ نییـە ، ئـەم بەسـەر لایـەنێکی شکـسپیردا زاڵـە و ئەمـەش بالآترین لایەنی ئەوە کە لایەنی تراژیدییە .

لەبەرهەمەکانی ئالگریکۆ دا چۆنێتییەك هەیە کە هەمیـشە خۆنەویـست دەمخاتـە یـادی شـانۆنامەی "شـای لـیر" ە وە کـە بەرهـەمی شکـسپیرە " بـەلای کەمـەوە لـە یـەکێ لـە پەردەکان دا واتە " ناشتنی کنت ئورگاسی = The Burial of Count Orgaz – ....

ئالگریگۆ لە ناسکیی هەستی ئایینی دا بە پلەیەك دەگات کە لای شکسپیر نەناسراوە.

ژیانی ئالگریکۆ لە بواری خاوەن شکۆیی و بەربلآوی دا هێندە جیاواز نەبوو لە ڕۆبنس " بەڵآم ئالگریکۆ سورتر و گونجاندن نەپەسەند کەرتربوو .

دیدەی ئالگریکۆ لایەنی خـودیی بـەهێزتری هـەبوو و لـە پێنـاوی ڕەزامەنـدێتی خۆیـدا کاری دەکرد نەك لە پێناوی ڕەزامەندێتی خۆیدا کـاری دەکـرد نـەك لـە پێنـاوی ڕازیکردنـی مــشتەرێکانی دا ... خــاڵی سەرســوڕێنیش لێــرەدا یــە کــە لەگــەڵ بــوونی تــوڕەیی دەسترۆیـشتوانی ڕەسمـی ، خـەڵکی کارەکانیـان زۆر لاپەسـەند بـوو ... ڕاسـتە کـە لـە بۆچونی تراژیدیدا کە دەرهەق بە ژیان هەیبوو ، بە شتێ هاوتای سروشـت و خـوی خـەڵکی ئیسپانی بوو ...لەگەڵ ئەوەدا کە خودی ئەو ئیسپانی نەبوو کەچی لە ڕاستی دا زیـاتر لـە ڤلاسیکوس = Velazques – ئیسپانی تر بوو.

ڤلاسیکۆس هونەرمەندێکی " ئەهلی دنیا " بوو " بەلاَم ڕۆبنس و ئالگریکۆ لەگەڵ ئەوەدا کە خەڵکی ئەم دنیایە بوون ، هونەرمەندانێ بوون پەیوەند بە دونیایەکی دی . هەڵبەتە هەستیاری گشتیی سەردەمی خۆیان — واتە بزوتن و ئازادی ڕەنگدانەوەی گیانی هونەری بارۆك — یان تاپرادەیەك نیشان دەدا ... بەلاَم هەستی تراژیدی ئەمان لە ژیان دا هەرگیز نەیدەتوانی بۆ قۆناغی یارییە پیشەسازییەکانی شێوازی بارۆك بڕوخێت .

## 59 — بارۆك و ڕۆکۆك

کەمێ سەیرە کە لەکتێبێکی بچوکدا دەربارەی هونەری ڕوکوکو = Diekunst des rococo لە نێوان وێنەکان دا ڕووبەڕووی بەرهەمی هونەرمەندان دەبینەوە کە زۆر لەیەکتری جیاوازن لەڕووی شێوازەوە، نمونەی ئەمانە : واتۆ = Watteau ، جۆرج مورلند = George Morland — شاردن = Chardin — و گویا = Goya — گروز= Greuze — هوگارث = Hogarth ئایا ئەم هونەرمەندە لێکنەچوانە دەکرێ پێکەوە بەیەك چاو سەیر بکەین ؟

هەڵبەتە پێداویستییەك مێژووی یەکپارچە دەشێت ئەم نا هاوگونجاندنە دیارە ئاڕاستە بکات .

لەپاش هونەری ڕێنیسانس هونەری بارۆك بەدی دێت و بەم شێوەیە دەگەین بە ساڵەکانی — 1715 — .

لە ساڵی 1760 — ەوە دەتوانین جۆرەکانی شێوازە هونەرییەکان بەناوی تایبەتی خۆیان دیاری بکەین — واتە شێوازی کلاسیك و شێوازی ڕۆمانتیك . لە نێوانی ئەو ساڵانەدا کە لە سەرنجی یەکەمەوە بە ڕوکەش قۆناغی تێکئاڵۆزان بووە ، یەك شێوازی بەرجەستە بوونی هەبوو — ئەویش شێوازی ڕۆکۆکە .

سروشتییە کە ناوی ئەم شێوازە بەم قۆناغە لە مێژووی هونەردا ناوبرێت ، چونکە ئەم شێوازە ئەگەر زاڵ نەبوایە بەسەر کۆی شێوازەکانی دی دا بەلای کەمەوە لە گشتیان جیاواز بوو .

بەڵام ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە ئەمەیە کە لەبەر ئەوەی ئەم ناوەمـان لاپەسـەندە و ئەو چۆنێتییانەی کە ئەو هونەرە لەخۆدەگرن والأمان کردن " دەبینین کە تاڕادەیـەك کـۆی بەرهەمەکانی ئەم قۆناغە لـە جێگـەی خۆیـان دا دابـین دەبـن .شـێوازی ڕۆکـۆك لەحاڵـەتی پاراوی خۆیدا یەك لادان بوو ، بەڵام لەهەمان کاتدا بە پایەداری گەیشت بوو.

لە هونەری ئەو قۆناغە دا هونەرێ چـنگ ناکـەوێ کـە تێـراو نـەبوبێ بـەگیانی هونـەری ڕۆکۆك ... چونکە ئەم شێوازە دواهەمین ڕەنگدانـەوەی شـێوازێکی ڕەسـەنی ئەوروپییـە ، مەگەر پڕوپاگەندەی ئەوە بکەین کە شێوازێکی تایبەت هەم بەناوێکی نوێ بوونی هەیە .

ئەو شێوازانەی کـە لـە دوادوایـی ساڵەکانی سـەدەی هەژدەیەمـەوە تـاوەکو چـارەکی یەکـەمی سـەدەی بیـستەم بەسـەر هونـەری ئـەوروپی دا زاڵ بـوون لـە بنـچینەدا شـێوازی لێوەکەوتو یا وەرگێراوبوون ، شتێ بوون زیاتر پەیوەنـد بـە زانـست و پـەروەردە و کـەمتر پەیوەند بوون بە ڕەنگدانەوەی شێوەیەکی مانەوی و ڕەسەن .

بەڵام هەرچی زیاتر شێوازی ڕۆکوکۆ بەسەر بکەینەوە ، زیاتر تێبینی ئەوە دەکەین کـە ئەم شـێوازە حاڵـەت و ژیـانی یـەکێ لـە گـەورەترین قۆناغـەکانی مێـژووی ئـەوروپا دیـاری دەکات.

Rococo ڕۆکوکۆ لە وشەیەکی فەڕەنسییەوە دەکەوێتەوە "rocaille" بە مانـای پارچـە بەردێ دێ واتە ئەو بەردەی کە بە هۆیەوە ئەشکەوتە دەستکردەکانیان پێ جـوان دەکـرد یان بەمانای ( بەردی نەخش) .

هۆی ئەمەی بۆچی ئەم وشەیەیان بەسەر ئەو شێوازە هونەرییەدا دابڕیوە تـەواو ڕۆشـن نییە " چونکە ئەو جۆرە ئەشکەوتە دەستکردانە لە قۆناغەکانی پێشودا ، واتـە سـەردەمی بارۆك ، هـەمان شـێوە وێنەکێـشراوە و خـودی وشـەی بـارۆك = Baroque — یـش هـەمان لێوەهاتنی یا داکەوتنی هەیە " واتە لە وشـەی بورتوغالییـەوە هـاتووە — Gorraco — واتـە مرواری ورد و نارێك کە لە گەوهەرسازی ئەو سەردەمەدا بەکاربراوە ... دیسانەوە کـاربردی ئەم وشەیە بۆ هەمان تەرزو شێوازی هونەر لـەو قۆناغـەدا مایـەی تێگەیـشتن نییـە . بـەڵام

شـوێنگەی لێوەداکـەوتنی ئـەم وشـەیە هەرچـەندە پـڕ پـێچ و پـەنا بێـت " لـە ڕوانگـەی بیستنەوە زۆر لەبارو گونجاوە بۆ بەکاربردن .

بـارۆك بـە دەنگـی تێـر و سـەنگینی خـۆی شـکڵی هاوسـەنگ و نـەرم و تێـرڕەنگ کـە پێویست دەکا بە جوڵە بەدی بێن تا کار بکەنە سـەر بینـەر " زۆر بـەجوانی نیـشان دەدات .وە — ڕۆکۆکۆ — ش بە سێ هیجای هاوسەنگی کە دوانیان لەیەك دەچن لە دەنگی ناسکی زەنگۆڵەیەك دەچێت لەژێر سەرپۆشەوە — کـە دەنگـی دێ بـە دەم ڕاکردنـەوە ، لەهـەمان کاتدا هاوسەنگ دەنگی لێوە دێت .

مـەیلی پەیوەنـدی بـە هونـەری بـارۆك لـە ئـەڵمانیاوە سـەری هەڵـدا ، لـەم وڵاتـەدا بڵاوبونـەوەی کتێبـی " سـەرهەڵدانی هونـەری بـارۆك لـە ڕۆم = Barockkunst in Rom بەرهـەمی ئـالویس ڕیگـڵ = Alois Riegl هۆکـارێکی گـرنگ بـوو . کتێبەکـەی ڕیگـڵ لێکۆڵینەوەیەکە لە وەرگێڕاوی شێوازی بارۆك و لەوانەشە یەکەمین کتێب بێت کـە تیایـدا شێوازی بارۆك بەچڕ و پڕی پێناسکراوە و لە وتووێژی هونەری ڕێنیسانس جیاکراوەتەوە .

لـە ڕوانگـەی مێژوونووسـی وەك یـاکوب بورکهـارت Yakob Burckhardt — دا کـە تێبێکـی گەورەی دەربارەی ڕێنیسانس لە ساڵەکانی حەفتای سەدەی پێشودا بڵاوکـردەوە " هونـەری بارۆك جگە لە داڕمان و داتەپینی شێوازی کلاسیك — ی ڕێنیسانس شتێکی دی نەبوو.

هـاینریش ۆڵفلـین = Heinrich Wolfflin کـە کتێبـی " ڕێنیـسانس و بـارۆك — ی " Renaiassanse and Borok" لە ساڵی 1888 دا بە چاپ گەیاند " سەرەتا جیـاوازیی مێـژوویی نێوان هەردوو شێوازی ڕێنیسانس و بارۆکی بە ڕۆشنی خستە ڕوو ، پێناسەی ئەو دەرهـەق بـارۆك یـانی " جوڵـەی شـیاو لـە قـەبارەدا " لەگـەڵ ئـەوەدا کـە تـەواو گـشتی نییـە و سەرنجەکانی کەمێ ناجۆرن بەڵام بورکهارت تەکانێ بوو لەو بوارەدا بەرەو باشتر .

## 60 – پێناسەی بارۆك

وشەی بارۆك لەسەرسوڕاندن و هەوەس ونغرۆبونی نەرێت دەدوێت بەرهـەمی هونـەری دەشێ لە دووڕێگەوە بە یەکسانی پێناسە بکرێت : یەکەمیان ڕێگەی هونەری کلاسیکە کـە ڕێگـەی هـزری کـردن و ئایدیالیزمــە – واتــە پــشکنینی هــاو گونجاندنــە هزرییــەکان و هارمۆنییەتی ئایـدیالی و کورتـەی جـوانیی ئایـدیالی " ڕێگـەی دووەم ڕێگـەی خەیاڵییـە کـە بریتییە لە نکۆڵی کردنی ڕاستی و دژوەستان بە کۆی یاسا و هۆکارە وجودییەکانی .

هەردوو ڕێگەکەش چێژێکی جوانناسی بە مرۆڤ دەبەخشن ، دەربارەی ئەمەش کە مرۆڤ کامەیانی لاپەسەندە بەپێی چاوەڕوانکراو پەیوەندە بە میزاج و خودی تایبەتی کەسـانەوە " بێ گومان ئەوەی ڕێگەی لە دەرکی هونەری بارۆك گرتووە لای زۆربەی خەڵکی بێجگە لـە پێش زەینی شتێکی دی نییە " ئەم پێش زەینییە هەمان شێوە کە ریگـڵ هـەوڵی دا ڕونـی بکاتەوە لەگەڵ سروشتی ڕاستەقینەی مرۆڤی باکوردا نکۆڵی دارە .

چونکە لە نێوان هونەری باکورو هونەری کلاسیك دا بوونی نییە . لە هونەری باکوری دا هەمیشە جەخت ئاڕاستەی حاڵەتی گیانییە ( یان هەمان شت کە ڕۆجەر فرای بە "قـەبارەی دەروونناسی " ناوی دەبات ) " ئێمەیش ئەمە نەك تەنها لە کەلێـساکانی گوتیـك دا ، بـەڵکو لە تابلۆکانی ڕامبراند و تێرنەر دا بە ڕۆشنی دەبینین.

لە هونەری کلاسیك دا ، بەتایبەتی لـە هونـەری کلاسـیکی ڕێنیسانـسی ئیتالیـادا کـۆی کۆششی ئاڕاستەی بەکاربردنی ماددەی کارە – ئاراسـتەی کارێکـە کـە هونەرمەنـد لەگـەڵ ڕووی دەرەکیی شتێکدا ئەنجامی دەدات ( بەم ئاڕاسـتەیە یـە کـە لـە هونـەری کلاسـیك دا بنەمای یاسایی هێندە شایەنی گرنگییە ).

لە شێوازی بارۆك دا هونەری ئیتالیا بەشێوەی هونەری باکوری نزیك دەبێتـەوە – واتـە دەست دەکات بە نیشان دانی حاڵەتی گیانی یان قەبارەی دەرونزانی .

بەم شێوەیە هونەری ئیتالیا دیسانەوە پەیوەندی خۆی لەگەڵ بەکاربردنی ماددەدا لە دەست نادات و کۆی دژواری و غەرابەتی هونەری بارۆکیش لەم دژایەتییەوە سەر هەڵدەدات .

شێوازی بارۆك لەڕووی نیازی گیانییەوە و لەڕووی هۆکارەوە هونەرێکی ماددییە .

مایکڵ ئەنجلۆ ( وێنە 43) بە باوکی هونەری بارۆك ناو دەبەن و لە توێی ئەم شێوازەدا تا ئەوێ دەکرێ وەدووکەوین .

مایکڵ ئەنجلۆ لە هەنگاوی یەکەمدا پەیکەر تاش بوو خۆی بە پەیکەرتاش ناودەبرد " بەڵام لە هونەری بینکاریدایە کە ئەو خۆی بە هونەرمەندێکی بارۆك نیشان دەدات . ئەگەر بەرهەمی نمونەی بیناکاری ئەو لە پێش چاو بگرین وەك گۆڕستانی جولیانۆ میدتسی = Giuliano de medici لە کەنیسەی سان لورنتسۆ = st. Lorenzo لە فلۆرانس – یان دالآنی کتێبخانەکەی لورنتسو لە هەمان شاردا – جۆرە کۆمپۆزیشنێ دەبینین کە تیایدا بەشی جیاواز – ستون ، پەنجەرەکان کەتیبە و هتد – هیچ مەبەستێکی بیناکاری ئەنجام نادەن ، بەڵکو تەنها لە پێناوی جوانکاری دا بەکاربراون .

بەتایبەتی دەشێ ئاراستەی ئەمە بین کە هەندێ لە تاقچە و دەرگاکان تەنها بۆ مەبەستی بەدیهێنانی سێبەر دروست کراون ... یان لە پێناوی والآ کردنی نەخشێکی یا دیمەنێکی تایبەت .

بەکورتی لەم کۆمپۆزیشنی بیناکارییەدا دەبینین نەك ڕێنوماکاری یاساکانی بیناکاری بەڵکو ڕێنومایی کەری یاسای وێنەکێشان و پەیکەرتاشییە " و شێوازی بارۆك – یش لە بیناکاری دا دەکرێ بەگشتی بە هۆشمەندییەکی نا بەجێ ناوبەرین ... ئەگەر تۆ لەو باوەڕەدا بیت کە هەر هونەرێك پێویستە سەر بەیاسای تایبەت و مادەی کاربردنی ئەو هونەرە بێت ، لەو شێوەیەدا من تێناگەم تۆ چۆن نیازمەندی عوزری شێوازی بارۆك بدەیتەوە " لەلایەکی ترەوە ئەگەر باوەڕت هەبێ کە سەرکەوتویی هونەرمەند لە ڕەزامەند

كردنی هەستیاری ئێمەدا یەكانە مەرجی هونەرە ، لەم شێوەیەدا كۆششی هونەری بارۆك بۆ بەدی هێنانی كۆمپۆزیشن لە بەرد — ئازاری تۆ ناشێ بدات .

لەهەر شێوەیەكدا ئەو مرۆڤە گومڕایە گریمانەی تۆ پەسەند بكات ئەویش ئەمەیە كە ڕاستییەكی مێژوویی نا ڕیكوپێك دان پیادا بنێ كە گیانی بارۆك ، هەرچەندە هەڵەش بەكاربرێت — بووە پارچەیەك لەبیری كاتولیكی و بەشێوەی هونەرێكی دژی ڕیفۆرم بەدی هات.

لەهەر جێگەیەكیش ئەم شێوازە تەشەنەیكرد — لە ڕۆمەوە تا ڤییەن و ئەڵمانیای خوارو و ڕاین و ئیسپانیا ومەكسیك و پورتوگال و پاراگوای و پیرۆ و تەنانەت لە پكین — یش (كە كۆشكی هاوینەی ئیمپراتۆر بە دەستی یەسوعەكان بنیاتنرا ) — بە شێوەی شێوازێكی زاڵ بەدی هات و ڕێگەی دا كە گیانی مرۆڤ بەتاڵ لە كۆت و بەندی شێوازی كلاسیك بە زمانی بێ سنوری خەیاڵ — ی خۆیەوە سەرگەرم بێت .

## 61 – پێناسەی ڕۆكۆك –

هونەری ڕۆكۆكۆ لە فەڕەنسا هاتە ژیانەوە و لە ئەڵمانیا دا بە پلەی باڵای گەشە كردن گەیشت ، ئەگەر بمانەوێ كەسێ بە نمایندە و داهێنەری ئەم شێوازە ناونووس بكەین " ئەوا ئەم شانازییە دەخرێتە پاڵ دوو بیناكاری پاریسی : ڕۆبرت دو كوت = Robert de Cotte — و ژیل ماری ئۆپنورد = Gilles MarieOppenord — كە هەردویان شاگردی ژویل هاردوان مانسار = Jules Hardouin – Mansart — بوون ، بیناكەری ناسراوی كۆشكی ڤێرسای بوون .

ئوتێلی دولا تغلێغ Hotel de La Trilliere و نوێژخانەی ڤێرسای بەدەستی دوكوت بەدی هات ... بەڵام كاری بنچینەیی ئەو هوتێل دولار ڤیلەر بوو لە پاریس .

ئۆپنور كەسێكی هۆڵەندی بوو كە لە ئیتالیا خوێندبووی و ماكس ئوسبورن لە كتێبێكدا كە یادی كرایەوە ڕاست دەڵێت كە ئەم خاڵەی دوایی خاڵی نییە لە گرنگی " چونكە لە

نێوان شێوازی بارۆك — ی دوایی ئیتالیادا كە مـەیلێكی بـەرەو ئـازادی بـزوتن خـستەگەر و شێوازی نویٚ دا كـە ئـازادیی تـەواوی بزوتنـی بەدەسـت هێنـا — بـیٚ گومـان پەیوەندییـەك بوونی هەیە .

ڕۆكۆكۆ لە شێوەی شێوازدا لە جوانكاریی ناوەوەی بینادا سەریهەڵدا .

بارۆك گەیشتبووە قۆناغێك كە لەو قۆناغەدا نـاوەوەی بینـا كۆپییـەكی لـەبری دانـەری دەرەوەی بینـا بـوو " واتـە سـتون و بنمـیچ و كـۆی جوانكـاری و جوانكـاریی = ئارایـشتی دەرەكی لە ناوەوەی بینادا پێچەوانە دەكرایەوە .

وەرِوخستنەكانی دوكوت و ئوپنور لەڕاستی دا لەمەزیاتر نەبوو كە ئەوان گەیـشتنە ئـەو باوەڕەی كە مەرجایەتی زاڵ بەسەر بەرژەوەندیی ڕازاندنەوەی دەرەكی دا چـیی دی هاوتـا نییە بـە جوانكـاری نـاوەكی = داخلـی " بـەكورتی مانـای وایـە كـە لـەنێو چـوار دیوارێكـدا دەشێت لەبری ماددەی بەرد مادەیەكی وەك پلاستیك بەكار ببرێـت ... وە لەهـەمان كاتـدا كە مادەیەكی جیاواز بەكار هێنرا ، ئازادیی بیناكاری لە سنورداری و تەنگەبەری تـیٚ پـەڕی و شكلّی تایبەتی شێوازی ڕۆكۆك بەدی هات .

لێرەدا هەم وەك هەر جێگەیەكی دیی مێژووی هونەر هەڵە دەبێت ئەگەر گۆڕانی شـێواز بە بەدیهێنانی یا ئاشكراكردنی بەرژەوەندیٚنویٚ سنوردار بكەین .

دەشیٚ ڕاستر ئەمە بێت كە بڵێین "ویستی" سەر بەڕەنگدانەوەی فلاّنە حالّـەتی گیـانی و ( لـەم بارەیـەوە ویـستی سـەر بـە " ئـازادی " لـە بەرامبـەر " خـودێتی" كلاسـیك دا ) یەكەمین هۆكارە و هەمان هۆكاریشە كە بـەكاربردنی بەرژەوەنـدی نـویٚ دەكاتـە مایـە ... ویستی ئازادی بەر لەوەی كە لـە شـێوازی ڕۆكۆكـۆی دوكـوت و ئوپنـوردا سـەر هەڵبـدات ، لەبیناكاری بارۆكی باشوردا ڕەنگی دابووەوە .

دەشیٚ ویستی ئازادی هەروەكو ویستی هونەری گوتیك بـە ڕەنگپێدانـەوەی بـارودۆخی خوایەتی و گیانی بالاّیی لەبەرد دەبوو بگاتە باكوریش تاوەكو ڕەنگدانەوەی بـیری خـۆی " واتە ڕێچارەی پراكتیكی پەیدا بكات . لـە ڕاسـتی دا پرۆفیـسۆر ڤرینگـەر پەنجـە بـۆ ئـەوە

درێژدەكات—ئەو پەنجە بۆ راكێشانەش گەلێ رۆشنە — كە رۆكۆكۆ لەراستی دا وا نیشان دانی نوێی گیانی باكوریی هونەرە كە سەرەتا لە شێوازی گوتیك دا بەتەواوی رەنگی دابووەوە و پاشان لەژێر دەسەلاتی بێگانەی هونەری رێنیسانس دا لەپێش چاوان نا پەیدا بوو یا وون بوو.

رۆكۆكۆ رەنگدانەوەی یا بەرجەستەكردنی جوڵەی بی سرەوتە لە زەمینەی هونەرداو هاوبەشی كردنی خەڵیباكوریش لە پێكهاتی هونەری گوتیك دا بێجگە لەو جوڵە بێ سرەوتە شتێكی دی نەبوو .

لێكچونێ كە لە نێوان خۆشنوسییەكانی لاپەڕەیەكی كتێبی باوەڕی دۆعای سەدەی دەیەم یا دوانزەیەمدا بە جوانكاریی روكەشی دەستڕەنگینی شارل كریسان = Charles Cressent — دا دەبینرێ ، راستەوخۆ لێكچونێكی رێكەوتییە . هەمان شێوەش لە كارەكانی فرانسوا دو كۆڤیلی = Francois de Cuvillies — دا بەدی دەكرێ ... ئەمە یەكێكە لەو بەروبومانەی كە دوو كۆتایی بەیەكتری دەگەیەنن " هەرچەندە دەشێ بوترێت كە لە زەمینەی هاوبەش دا كۆتاییەكان یەكان هەمیشە هەمیشە لەگەڵ یەكتری دا لە بەیەكتری گەیشتن دان .

## 62 – ناوەڕۆكی رۆكۆكۆ

رۆكۆكۆ لە فەرەنسا زیاتر لە شێوەی ئارایشتی ناوەكی زیاتر پەروەردە نەبوو. لەبەر هۆكارێكی نادیار وڵاتی فەرەنسا لە برەودان بە شێوازی رۆكۆكدا نكۆڵی كرد یا رادەیەكی لوژیكی كە بریتی بوو لە هاوجووت كردنی بەرژەوەندی دەرەكی لەگەڵ شێوازی ناوەوەیی دا.

ژوست ئورێل مسونیە = Just – Aurele Meissonier وێنەیە یا نەخشەیەكی لەباری بۆ رووی دەرەكیی كەنیسەی سان سوپلیس كێشابوو ، بەڵام نەخشەكەی ئەویان لا پەسەند

نەبوو و لەبری دا نەخشەی وشك و كلاسیكی ژان نیكۆلا سرڤاندونی = Jean – Nicalas Servandoni بیان پەسەند كرد بۆ بەدیهێنان .

لە فەرەنسا شێوازی ڕۆكۆكۆ لەبەشی ناوەوە و ڕووكەوتا مایەوە ، لەوانەیە ئەمەش بێ هۆ نەبوو " چونكە كە ئەڵمانیا دەبینین كە سەرشێتی ڕۆكۆكۆ هەموو جێگەیەكی گرتەوە و تەنانەت بەشێتییەكی پیرۆزیش دەناسرێت .تاوەكو جێگەیەك لەنێوان كۆی شێوازە هەمە جۆرەكان دا كە شوێنەواری خۆیان لەو وولاتە خستۆتەوە " شێوازی ڕۆكۆكۆ لە گشتیان تایبەتمەند تر و میللی ترە " وە بەم شێوەیەش لە ئەڵمانیاش جەوهەری شێوازی ڕۆكۆكۆو نایابترین وەڕوكەوتی لەشتی وردیش دا دەكرێ ببینرێت ... بە تایبەتی لەو ماددانەدا كە ڕاستەوخۆ ڕۆكۆكن — یانی چینی .

تەواوی شێوازی ڕۆكۆك یا گیانی ئەو شێوازە لە پەیكەرێكی بچكۆلە و ناسكی مامۆستای پەیكەر سازدا دەردەكەوێ و ڕەنگدەداتەوە كە ناوی فرانس ئانتون بوستلی = Franz Anton Bustelli — یە كە ناوی = كلاین پلاستیك = ە Kleinplastic پەیكەری ناسك .

بوستلی مامۆستایەكی ئیتالی بوو كە لەنێوان ساڵەكانی 1754 و 1763 بۆ كارگەی چینی سازی نیمفنبورگ = Nymphenburg كاری قاڵب سازی دەكرد ( وێنە 45) .

كندلەر = Kandler كە لە كارگەی مایسن كاری دەكرد لە بوستلی كەمدەست تر نەبوو ن بەلاّم تەنها بوستلی گوڵی سەر مێزی ئەو قۆناغەیە .

لە نێوان پەیكەرێكی چینی كە مرۆڤ دەتوانێ بەدەستیەوە بگرێت و كۆشكەكانی نیمفنبورگ دا یا برووڵ = Bruhl دەشێ جیاوازییەكی زۆر هەبێت ، بەلاّم ئەگەر لە نێوانی ئەو دوو نەخشە مەزن و ناسكانەدا شتێ لە دەست بدەین یا لەدەستمان دابێ ئەوا هەمان گیانی تایبەتی شێوازی ڕۆكۆكۆ —یە . لە ڕاستی دا سەبارەت بە كۆششی پڕ سەرەنجی فەرەنساییەكان یەكان دەكرێ بپرسین كە ئایا لەوانەیە ئەڵمانییەكان لە بەكار بردنی شێوازی ڕۆكۆك دا لە گشت دیاریدانێكی هێزی ئافەریدەكردن دا زیاتر لە ڕادە هەنگاویان هەڵێنابێت ؟

دەکرێ کە ڕوکۆکۆ بەناوی " ئیرادەی سەر بە ئازادی لە زەمینەی هونەردا " پێناس بکەین " بەلاّم ئایا ئەم پێناسە مەبەست پڕ دەکاتەوە ؟ ئازادی بۆچی ؟ لە وە لاّمدا دەکرێ بلّێین ئازادی لە پێناوی سەرگەرم کردن — بوون دا " و ئەم وەلاّمەیش بۆ پێناسەی گیانی ڕۆکۆکۆ ڕاستییەکی تەواوە .

ڕۆکۆکۆ هەولّ دەدات بۆ بەدیهێنانی جوانی بەبێ ڕێنمایی کردنی تێبینی سودمەندێتی ئازادیی خۆی هەبێت .

ڕۆکۆکۆ هونەرێکی ئەبستراکتیکییە " هونەرە بۆ هونەر " تا ئەو کاتەی دامێنی بە هونەری جوانکاری و ئارایشتییەوە تەنراوە زیانی نییە و مرۆڤی دلّخۆش چێژێکی فراوانی لێ دەبینن . بەلاّم ژورێکی ڕۆکۆکۆ — کە کەمترین نمونەی ئەم شێوازەیە — خواوەند دەکاتە نسیبی شەیتان . سەرەڕای ئەمەش بیناکاری ڕۆکۆکۆ هەمیشە حالّەتێکی کۆن و بەنرخ پەیدا دەکات .

لە مەرجایەتی وێنەکێشان دا لەسەر تابلۆ ، گیانی ڕۆکۆك هیچ سنورداریێتییەك ناناسێت ، وە تەنها بەوەی کە کلیلی ئەم گیانە دەست کەوت " ڕووی نالێکچوون لە بەرهەمەکانی: : واتۆ و مۆلند ، شاردن و گویا ، گروز و هۆگارت ، دەست لە دەستی یەك دەنێن و هەمان هەستی ئازادی بە ئێمە دادەدەن .

هەمان مەیل بە ئازادی لە پێناوی سەرگەرم کردن بوونە کە سرۆش بە هونەرمەندانی ئەم قۆناغە دەبەخشێ ... لەهەمان کاتیش دا بە کۆسپە یا زەحمەتە بتوانین ڕازیبین بەمەی کە سەرگەرم بوون بە دروستکردنی بەردی قەبرەوە یا میحرابی کەنیسەوە شتێکی باشە...

ئەگەر ئاگادار نەبین کە ئەم نیاز و مەبەستە لەڕاستی دا چەندە ماقولّە ، پەی بە ڕازی شێوازی ڕۆکۆکۆ ناتوانین ببەین .

ڕۆکۆکۆ سەلمێنەری ژیانە تەنانەت لەبەردەمی مەرگیشا .

## 63 – دیمەن سازی = ستیل لایف

مێژووی دیمەنسازی لەم ڕووەوە سەرنج ڕاکێشەرە کە مێژوویەکی بەردەوام نییە " لە ڕاستی دا ئەم مێژووە پەیوەندە بەسەردەمی نوێوە .

لە گۆڕستانەکانی میسری و لە ڕۆمدا جۆرە وێنەکێشانێك هەن کە دەکرێ بە دیمەن ناو ببرێن ، چونکە تیایاندا بەرد و دار و درەخت و سەوزایی بەشێوەیەکی سروشتی وێنەکێشراون " بەڵام لێکچونی ئەم وێنانە لەگەڵ بۆچونی گشتیمان دا زیاترە " بۆنمونە : – لێکچوونی کاغەزی دیواری چینی بەم جۆرە ڕەچاو ناکرێت ... مەبەست لەم وێنانە زەمینی بووە و لە پێناوی ژیان ( یا مەرگ دا) و هەرگیز بە ناونیشانی شتێکی جیاواز کە مرۆڤ لەڕوانگەی جوانناسییەوە تێیان دەڕوانێت جێگەی سەرنج نەبوون ... نیشان دانی ڕوانگەی گشتی دەربارەی شتێکی زیان بەخشو لەنێوان کۆمەڵێك وێنەدا هەمیشە کارێکی ترسناکە . بەڵام بە لە پێش چاوگرتنی ئەم مەرجە زیادییە دەکرێ بوترێت کە دیمەن سازی لە ئەوروپادا لە داهێنانی تایبەتی ڕێنیسانسە.

گشتمان دەزانین کە چۆن دیمەن لە شێوە ی زەمینەی پشتی سەری پەیکەرەکان دا بەشێوەی یەك بەشی تایبەتی وێنەکاری بەدی هات . لە بەرهەمی هونەرمەندانی مەکتەبی ڤینیزیا ( وەك چیما = Cima و تینتۆرینتۆ ) دا بوو کە ڕەگەزی دیمەن لە سەرەخۆ زاڵ بوو بەسەر بابەتی تابلۆ دا .

دەشێ کۆنترین یاد هێنانەوە دەربارەی دیمەنی سروشتی وێنەکردن کە بەناوی بەشێکی یا لقێکی جیاواز لە وێنەکێشان بوو دۆرێر = Durer و هەڵوێستێتی کە لە ساڵی 1521 دا دەربارەی پاتینیر = Patinir ڕوونی دەکاتەوە " بەم ڕوونکردنەوەیە کە ئەو بە " یوئاخیم " ، دیمەن سازی چاك " ناو دەبات .

ئەگەر سەرەتایەك بۆ سەرهەڵدانی دیمەن سازی نوێ لە پێش چاو بگرین دەکرێ پاتینیر ( 1485 – 1524) بە سەرەتا بناسرێ کە لە وێنە میناتۆرییەکانی دا چۆنێتی

بنچینەیی دیمەنی بەرِوویەکی تەواوتر جوانتر بەدیهێناوە . لێرەدا دەمەوێ بڵێم کە ئەم چۆنێتییە چییە " بەڵام لە سەرەتادا پێویستە بڵێم کە ئەم چۆنێتییە هیچ پەیوەندییەکی بەو شێوە زانستییە وە نییە واتە " یەکانە شێوازی پاتینیر لەم بوارەدا بە — لیوناردۆ داڤینشی — کە ئەناتۆمی بەرد و گیاکانی نیشان دەدا هاوشێوە نییە ... چونکە پاتینیر هێندە سەر گەرمی تەواوی دیمەنەکانی بوو کە بەناونیشانی تابلۆی کار لە دروستکردنی مرۆڤ دا ( لەدیمەنەکانی دا ) چاوپۆشە نەدەکرد و ناچار " مریەم و منداڵ" ی یان " هەڵاتن بۆ میسر " ی سەرباری دیمەنەکانی دەکرد تا بابەتی ناوەرۆکی تابلۆکەی ، کە هەمان دیمەن بوو سەرنج ڕاکێش ئاڕاستە بکات .

لەو باوەڕەدام کە ئەو چۆنێتییەی مەبەستمە بۆیەکەم جار بەرِوویەکی بنەبڕ و ئاشکرا بەیاریدەی خودی — ڕۆبنس — ەوە بەدی هێنرا و ئەگەر لەدەستی من دا بوایە کە تابلۆی دیمەنێك هەڵبژێرم کە چییەتی دیاریکراوی بەشی دیمەن سازی چاتر لە هەر تابلۆیەکی دی نیشان بدات " ئەوا — کۆرو = Corot — و کۆنستابڵ و کلۆد — م ڕەت دەکردەوە و پەنجەی دەخستە سەر تابلۆی " دیمەنی مانگ هەڵاتن " ی بەرهەمی ڕۆبنس .

هەمان تابلۆیە کە ڕینۆلدز = Reynolds — لە" وتاری هەشتەم " ی خۆیدا ئەوەی بەناوی گەواهی نمونەیی هەڵبژارد تاوەکو ڕوونی بکاتەوە کە لە وێنەکێشاندا هەندەکی =جزء — پێویستە فیدای بەرژەوەندی هەمەیی = کلی — بێت .

ڕینۆڵدز دەنووسێ : " ڕۆبنس نەك تەنها لە ڕادەبەدەر سروشتیانە ڕۆشنایی لەسەر دیمەنەکە تابان کردووە ، بەڵکو ئەو ڕەنگە گەرم و ناسراوانەش کە دیاری کەری بەرهەمی ئەون بە تابلۆکەی بەخشیوە... ئەم تابلۆیە زۆر جیاوازە بە دیمەنی مانگ هەڵاتن لەسەرنجی ئێمەدا ، چونکە ئەگەر ڕۆبنس ئەستێرەی سەرباری مانگ هەڵاتنەکە نەکردبایە ئەوا بە ئاسانی دەشیا بەهەڵەدا بچین و واتێ بگەین کە خۆرئاوابوونێکی کەم ڕۆشناییە .

ڕۆبنس لەو باوەڕەدا بوو کە ڕەزامەندێتی چاو لەم بارەیەوە لە هەر تێبینییەکی تر بالآتره ... ڕاستەوخۆ دەشیا کە ڕۆبنس ئەو تابلۆیەی سروشتی تر وێنە بکێشایە ... بەلآم ئەم کارە بەنرخە بە لەدەست دانی چۆنێتییەك تەواو دەبوو کە لەڕوانگەی وێنەکێش دا گەلێ زیاتر بوو — ئەویش بریتییە لە هارمۆنیی بەدی هاتوو لە کۆنتراستو هەمەجۆریی ڕەنگەکان ."

ئەگەر ئەم وتانە لە زمانی بەڕێوبەرێکی ئەمڕۆکەی " قوتابخانەی هونەری دەوڵەتی"یەوە بیبیسترێ " بەلامانەوە سەیر دەبوو ... کەچی هەمان ئەم وتانەش ئاڕاستەکەی تەواوی بەرهەمی هونەرین کە ئەمڕۆ کە لە " قوتابخانەی هونەری دەوڵەتی دا" ڕێگە نادرێن .

هەروەها لە پێناوی ئەوەدا ناوێکی لەبارتر بدەین کە ئەو چۆنێتییەی دیمەن سازی لە کۆی جۆرەکانی وێنەکێشان جیادەکاتەوە " ئەوا بە ڕای من دەبێ ئەوە بە" شیعر " ناوبەرین — ئەگەر چی پێویستە گوێڕایەڵ بین کە ئەم چۆنێتییەش هێندە ڕاست نییە " دیسانەوەش بەم کارە گوناحی بەکاربردنی زاراوەی باسێکی هونەری بە باسێکی تر لە ئەستۆ دەگرین . بەلآم لە دیمەن سازی دا سەرەتا لای پاتینیر وپاشان لای ڕۆبنس و لە دواییدا بەڕوویەکی تەواو ئاشکرا لای پوسین = Possin و کلود و کۆرۆ دەبینین کە هونەرمەند هەوڵ دەدات حاڵەتێکی تایبەتی هەستیاری بە یاریدەی تابلۆکەیەوە پێچەوانە بکاتەوە  کە بۆ ئەو دەربڕینەش ناونیشانێکی چاتر لە " شاعیرانە " شك نابەین .

ئەم چۆنێتییە تەنانەت بالآترە لە شیعر — چۆنێتییەکە  کە شیعر هەوڵدەدات بەیانی بکات بەلآم هۆکاری لەبەر دەستا نییە ...

دیمەن سازی لە بنچینەدا هونەرێکی ڕۆمانتیکییە — هونەری کەسانی سەرزەمینی سەرەتایی یە کە دیمەنیان لەکاتی خۆیان دا نەبووە و پاشان لەسەدەی هەڤدەیەمدا — بەدەستی ئێلسها یمەر = Elsheimer و بێرشیم = Berchem  ئەم هونەرە بەتایبەتی بووە هونەرێکی ڕۆمانسی " یەعنی هونەری بەدیهێنانی " کەیف و حاڵ " لە پێناوی زەوق و

مـەیل دا نـەك لـەپێناوی نیـشان دانـی ئـەزمونێكی دیـاری كـراودا ... لای كلـۆد و پۆسـین "شیعر" دیمەنسازی ڕاستەوخۆ پابەند بەشێوە وێژەیی یەكانەوە.

كلۆد ( وێنە 46) تابلۆیەك دروستدەكا و ناوی لێ دەنێت " ڕوخـانی ئیمپراتـۆری ڕۆم " و بـەم شـێوەیە خۆویـست لـەنێوان مانـای ئـەدەبی و ڕەنگدانـەوەی جـۆری دا تـەداعی = پێكداهاتن بەدی دێنێ .

كۆنستابڵ لەپێناوی ئەمەدا سەری هەڵدا تاوەكو بەهای شاعیرانەی ڕیالیزم و ناتورالیزم بژێنێ.

تێرنەر تاڕادەیەكی زۆر گۆشە هەمەلایەنـەكانی دیمەنـسازیی گرتەبـەر و هێـزی خـەیاڵی هێندە چڕ بوو كە توانیی كۆپۆزیشنێكی نوێ لە خۆی بەدی بهێنێت .

كۆرۆ و ڕۆبنس لـەبارتر و سەركێـشتر بـوون بـەلاَم بـەم شـێوەیە شـاعیر بـوون ... بـە سەرهەڵدانی ئیمپریسیونیستەكان و وەچـەكانیان سـەرەتا وا دەركـەوت كـە بـە ئانـاتۆمیی تەرزی لیۆناردۆ گەڕاوینەتەوە ، بەلاَم لە ئەنجامدا دەبینین كـە جۆرەهـا شـێوەی جیـاوازی شیعر زیاتر بوو لەوەی كە بەخەیاڵماندا دەهات .

## 64 – شێوازی ئینگلیزی

دیمەن سازی لـە خاسـیەتەكانی شـێوازی ئینگلیزییـە ، بـەكورتی تـاوەكو ئێـستا هـیچ كەسێك پێناسێكی باشی لەم شێوازە بەدەستەوە نەداوە و هیوادارم كەسێكی نـا ئینگلیـز ئەم كارەمان بۆ بكات .

ناكرێ ڕەچاو بكرێت كە گینز بارو =Gainsborough و كۆنستابڵ و تێرنەر نـا ئینگلیـزی بـن ، لەگـەڵ گـشت ئەمانـەدا جـێ كۆسـپە بتـوانین بڵـێین چـی چـۆنێتییەكی هاوبـەش لـە نێوانیاندا هەیە كە دەبێتە هۆی ئەوەی ئەوان وەها ئینگلیزی بن وە یان نەبن .

لەوانەیە ئەم چۆنێتییە پەیوەند بێت بەتەرزی ڕوبەڕووبونەوەی هاوبەشی ئەوان لەگـەڵ سروشتدا ، هەروەها كلیلی ئەم تـەرزەی ڕوبەڕوبوونەوەیـە لـە هونـەرێكی دی دا " واتـە لـە

شیعری ئینگلیزی دا دەست بکەوێت ... ڕازی مەبەست لەم پەندەی ۆردزورث دا شـاراوەیە کە دەڵێ : " بهێڵە سروشـت ئامۆژگـاری کـەرت بێـت . " وە لـەم مانایـەدا کـە کۆنـستابڵ گـوتی " دەرکـی پـاراوی ڕاسـتەقینەی سروشـت ." ئـەم تـەرزی ڕووبەڕووبوونەوەیـە پـشت بەستنە بە سروشت یا باوەڕ پێ کردنێتی کـە بـە دیـدەی تونـد خـووی هونـەری ئـەڵمان و ڕیالیزمی پڕ مەسخەرەی هونەری فەرەنسی جیاوازییەکی زۆری هەیە .

لە هونەری ئینگلیزی دا حاڵەتی خرۆشانی هونەرمەند گرنگییەکی بنچینەیی هەیـە . لـە سروشتدا ناکرێ هەرەمەکیانە کارێ ئـەنجام بـدرێت ، ئەمـەش بەشـێکە لـە ڕازی شـێوازی ئینگلیزی، بەڵام چۆنێتییەکی تریش لەم شێوازەدا بوونی هەیە کە هێندە شـایەنی شـاباش نییـە " پێناسـی ڕاسـتەوخۆی ئـەم چـۆنێتییەش هەمیـسان ئاسـان نییـە ، بـەڵام مـن لـەو باوەڕەدام کە لە پەیوەندی ئینگلیزەکانەوە بە ئاسایش سەرچاوە وەردەگرێ .

سروشـتی ئینگلتـەرە بـە ڕوویـەکی پـاراو دەرك ناکرێـت ، بـەڵام دانیـشتوانی هێنـدە زۆرنییە.

ئەوەی جێ مەبەستە ئەمەیە کە نیازمە بڵێم سروشت بۆ هونەرمەندی ئینگلیـزی جـۆرە پەناگەیەکە لە قەرەباڵغیی بوون یا ژیان .

لەوانەیە بەڵگە خوازی بێت کە ئەرکی هونەر بـەدی هێنـەری پـەناگای لـەمجۆرە بێـت " ئەمەش هەمان تیۆری ڕۆمانتیك — ە .

بەڵام لەهەمان کاتدا " ڕیالیستی " تر و " کلاسیك " ی تر ئەمەیە کە شتێکی زیاتر لـە هونەر داخواز بکەین — بمانەوێت کە زەبر و زەنگ و دیدەی هەبێت .

ئەم چۆنێتییانە لە هونەری بورژوازی دا و لـە خـۆڕازی ڕینۆڵـدز و گینـز بـارۆ نـابینین " هەروەها لە هونەری کۆنستابڵ — یش دا ڕەزامەندی نابینین .

لە بەرهەمی بلیك و تێرنەر دا ئەم چۆنێتییە دەدرەوشێتەوە " بـەڵام ئەوانـە ڕاسـتەوخۆ هونەرمەندانێکن کە دەشێ لە ڕابردویان دا لە شێوازی ئینگلیزی دودڵ بن .

بۆرژوا لە زمانی ئینگلیزی دا زاراوەیەکی خۆشنودانە نییـە — هەڵبەتـە ماوەیـەکی درێـژ بە سوربوونێکی تەواو لە زمان دا خزمەتی کردووە ، بـەڵام دەتـوانێ وشـەی گـەلێ زینـدوو بێت .

من دان بە بەکاربردنی مارکسییانەی ئـەو زاراوەیـەدا دەنـێم " مەبەسـتم لـە هونـەری " بۆرژوازی" لەو بەرهەمانەیە کە رووی بازرگانیانەیان هەبێت ...

هونەرێك کە بە پول و پارە پەستییەوە سەرو کاری هەبێت .

گینزبارۆ پۆرترێتی شەست جێنییەی دروست دەکرد لەو کارەش نەفرەتی دەهات " لە و بارەیەوە بۆ هاورێی — جاکس — نووسیوێتی :

"دڵم لە روخسارکێشان تێکەڵ دێت ، چـەند حـەز دەکـەم سـازەکەم هـەلگرم و بـچمە دێیەکی جوان و لەوێ بۆ خۆم سەرگەرمی دیمەن کێشان بم و ئاسودە و بـێ غـەم چـێژ لـە ژیان بەرم.

بەڵام ئـەم ئافرەتـە تـاس و لوسـانە و چـا خواردنـەوەیان ، سـەما کردنیـان و پیـاوانی راوچییان هتد ئەم دە ساڵەی تەمـەنی دوایـی مـن لـەهزری مـن دا دەکاتـە زەهـری مـار و دەترسم لە دواییش دا مێردێ بۆ خۆیان پەیدا نەکەن .

بەڵام جاکسن —ی ئەزیز دەزانی کە پیاو نـاتوانێ شـتێ بـەوان بڵێـت ، پێویـستە بـاری خۆمان بەرین و بە زرنگەی زەنگۆڵە رازی بین ، تەنها بەدیی ئەمەیە کە من لـە تـەپ و تـۆز قینم دێتەوەو لە گسك دان و دەم داخستنیش هەمان شێوە خۆشم نایەت .

لە کاتێکدا دەبینم ئەوانەی دی بۆخۆیان لـەنێو عەرەبانـەی سـەر چـەتردا دانیـشتون و پێیەکانیان لەوپەڕی پشودا لەناو کـادا لێ درێـژ کـردوە و دەڕواننـە درەختـە سـەوزەکان و ئاسمانە شینەکان ... لە حاڵەتێکدا کە تەنانەت نیوەی ئارەزوی من شك نابەن ... پیاو پـڕ دەبێت لێیان.

دڵخۆشیم لەمەدایە کە پێنج دانـە سـازم هەیـە ، سـیانیان کـاری جـی و دوانیـان بـاراك نورمەن دروستی کردون ." ئەگەر ئەمە " بـۆرژوا " نـەبێ بـەمانای وشـە " ئـەوا نـازانم لـە ڕاستیدا ئەم وشەیە چی مانایەکی هەیە .

لە کۆتایی دا بەم مانایە هەر کەسێکی خاوەن توانـا لـە قـوڵایی دڵییـەوە بۆرژوایـە ... تەنانەت ولیەم بلیك — یش کە چـاترین دژوەسـتی — گینـز بـارو — یـە ، خـەتای گینزبـارو نـەبوو (خـەتای ڕینۆڵـدزیش نـەبوو) بـەڵام خـەتاو تەخـسیری زەمانـە بـوو ، خـەتای سـەردەمیش کـە ڕاسـتەوخۆ لغـاوی دابـووە دەسـتی چـینی گێـل و خۆپەرسـت کـە نەیاندەتوانی هونەرمەندانی مەزن بە کارێکی ئەوتۆ ڕاسپێرن کە شایەنی بـاس بێـت بێجگـە لەمەی کە دوچاری خۆ فرۆشی و خۆ پەسەندیی هەمان چینیان بکەن . ئەگەر ووردبینـەوە " ئـەوا تـێ دەگـەین کـە ئینگلتـەرە لـە سـەردەمی گینزبـارودا خـاوەنی گـەورەترین هونەرمەندانێ بوو کە ئەورووپا لە پاش ڕۆبنس بەخۆیەوەی دیبوو... جێگـەی داخیـشە کـە کۆمەڵگەی ئینگلیزی نەیتوانیبوو بلیمەتیی ئەو لە بوارێکی ئازادانەدا ڕاگرێ .

## 65 — گینز بارۆ = Gainsborough Thomas -1727-1788

بەڵێ ، دەتوانرێت بەڵگەداریی بکرێت کە ئازادبونی گینزبارۆ هەمانە و تەبایی بوونیشی هەمان... چارەنووسی هونەرمەند ئەمەیـە کـە لەسـەر یـەك هێـڵ ببزوێـت ، لەکاتێکـدا کـە ئەوانی دی ئاسودە لە عەرەبانەدا دانیشتوون ... ئەوانەش لە ژێر زەبردا کاردەکەن ، چاتر کار دەکەن . لەگەڵ ئەمەش دا کە فەزیلەتی گینز بارۆ گەلێ باڵایە ، لاوازیشی هەمان شێوە ئاشکرایە.

گینـز بـارۆ دابـی گـشتیی نـەبوو ، هێـزی خەیاڵـە کانیـشی هێنـدە مـەتین نـەبوو ... ڕاستەوخۆ شتێکی دەگواستەوە سەر تابلۆکانی و تەنها بـە یاریـدەی ڕاسـتەوخۆ دەکەوتـە بزوتن ، نەیدەتوانی دابهێنێت ، هەر کاتێکیش هەوڵی ئەدا بابەتی نواندن هەڵبژێرێت ، بەڵام ئەمەی بۆئەنجام نـەدراوە ، تەنانـەت کۆمپۆزیـشن کاریـشی بـۆ نـەدەکرا. خـۆی بەبابـەتی

پێکهاتووەوەوە پر هێز دەکرد و تـابلۆ دووفیگۆرییـەکانی وەك تـابلۆی " ئـەلیزا و تۆماسـی لینلی = Eliza and Thomas Linley هاوگونجاندنی پێوە دیار نەبوو " کەواتە ئەنجام بەچـی دەگات ؟

پێویستە ئەنجامێ بریار بدەین کە بۆ سـەرهەڵدانی یـەك هونەرمەنـدی گـەورە تـەنها و تەنها هەستیاری و شارەزایی ڕۆڵ نابینێ .

بلیـك پێـچەوانەی گینـز بـارۆ بـوو و شـارەزایی سروشـتیی و بەهرەمەنـدیش نـەبوو بەهەسـتیاری تایبـەتی هونەرمەندانـە ... لەبەرامبـەر شـتەکانیش دا پەرچـە کـرداری ڕاسـتەوخۆی نیـشان نەئـەدا ، چـونکە هـەرگیز شـتێکی لەبەردەمـدا نـەبوو و بابەتـەکانی لەخەیاڵەکانیەوە وەردەگرت ، ئەو خرۆشانە ڕاستی یەش کە بەدی دەهێنا و بەیانی دەکرد هەستی نەبوو بەڵکو زەینی بوو لەچێوەی هزردا .

بەلأم ئەو ڕەخنەیەی کە نەتوانێ هونەرمەند لەسەر بنچینەی خاسیەتی چاکەی خـودی ئەو هەڵسەنگێنێ " ڕەخنەیەکی بـێ سـودە . بـەم ڕەچـاوکردنەی کـە ئەگـەر ڕوانگـەی یـا دیدەی — بلیك — لەگەڵ شارەزایی و تواناى هەستیی گینزبارۆ دا کۆببێتەوە " لەئەنجامدا چی کارەساتێ بەرپا دەبوو ؟... دەشیا مرۆڤ لەبەر خۆیەوە دوچاری لەرزین بێت ... بەلأم سروشت هەرگیز هێندە پابەندی مەیلەکانمان نییە کە بە کردگـاری بوویـەکی ئـەوها سـەرو مرۆڤانە ڕاپەرموێت .

لەکاتی ئێستادا چاتر وایە هەندێ لە خاسیەتە نەگۆڕەکانی گینزبارۆ دیاری بکەین .

یەکێ لەو خاسـیەتانەی ئـەو سروشـتی بـوون و بـێ ئـەرکیی ئـەوە ... گینزبـارۆ هـیچ تیورییـەکی لـەبواری وێنەکێـشان دا شـك نـەدەبرد " ئەگـەر چـی تیـۆرە ناسـراوەکانی ئوستادانی هونـەری دەخـستەکار کـە چـنگی دەکـەوتن ( لـەم خەڵەدایـە کـە گینزبـارۆ لـە ڕینۆڵدز جیا دەبێتەوە) ، هەروەها بەشـەوق و گەرمییـەوە وێنـەی دەکێـشا ، خێـراو دڵنیـا کاری دەکرد ، هیچ مەرجێکی زیادەی ڕێنومایی نەدەکرد ، لەگەڵ ئەمەش دا مەبەستەکانی خۆی بە تەواوی دەگەیاند .

ڕینۆڵدز ناچار بوو کە سەرکەوتویی ئەو بە جۆرە " جادویەك " لە قەڵەم بدات .

گینزبارۆ لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی وێنەکێشان دا بەڕوویەکی غەریزی کاری دەکرد ... ڕاسـکین دەڵێـت :– " دەسـتی گینزبـارۆ وەك جوڵـەی هـەورە سـوکەڵەکان و وەك درەوشانەوەی پرتەوی تیشکی خۆر خێرایە " ئەمەش لەبارترین جـۆری پێناسـەی تـەرزی کاری گینزبارۆی هونەرمەندە .

گەر سەرنج لە هەندەکییەکانی پۆرترێتـەکانی بـدەین ئـەوا خـاڵی گـەلێ پـڕ سـەرنج لـە پیـشەسازی ئیکسپریسیونیـستی وەرو دەخـەین یـا دەدۆزینـەوە – واتـە نوکتـە ڕێـژی = پوینگتیزم – کە بەر لە سەرهەڵدانی وانەیەکن کە کۆنستابڵ و کۆرۆ و سیزان فێری ئێمەیان کـرد ... لـە دیمەنـەکانی دا بـە واتایـەکی تایبـەت هـەمان خرۆشـی غـەریزی بەسـەر کـۆی تابلۆکانی دا زاڵە... بەکورتی لێرەدا ئەم پیشەگەرییە بۆ نیشاندانی جەوهەری – ڕۆمانتیـك – ی دیمەنی ئینگلتەرە بەشارەزایی و کارامەیی بەدی هاتوون و ئێمـە هـەرگیز لـەم جـۆرە هونەرە مانـدو نـابین ، چـونکە ئـەم هونـەرە بێجگـە لـە چـێژبینین شـتێکی ترمـان داوا لێ ناکات.

لە سەرنجی مرۆڤ نادات چونکە پڕ کاریگەر و خرۆشـانە ، نـەزۆك و هەسـتەکی نـین ... یەکێ لە نوسەرانی ژیاننامەی گینزبـارۆ واتـە سـرواڵتەر ئارمـسترانگ واتایـەکی هەیـە کـە بلیمەتی ئەم هونەرمەندە بەکورتی ڕوون دەکاتەوە " دەڵێ " گینزبارۆ یەکەم کەس بوو کە کۆی تواناکانی خۆی بۆ وەرگێڕان و گواستنەوەی سۆزەکانی بـەزمانی ڕەنـگ بـەکار بـرد ، هێز و توانا و یەکەی خرۆش و مەیلی خۆی کردبـووە پێـودانگی هونەرەکـەی خـۆی ." وە هـەمان "سـۆزی بەردەوامـە " دەبێتـە هۆکارێـك کـە تـەڕ و تـازەیی و سـەرنج ڕاکێـشانی تابلۆکانی گینزبارۆ ئەمرۆکەیش وێنەی ئەو کـات و ڕۆژە بێـت کـە تـازە لـە ژێـر دەسـتی دا بەدی دەهات .

## 66 – بليك = Blak William -1757-1828

ژمارەی تابلۆكانی بليك لە مۆزەخانەكان دا هێندە زۆر نين ، دەشـێ لەبـەر هـەمان هـۆ بێت كە زياتر لەبواری شيعردا ناوبانگی هەبوو " ئەو وێنانەيش كە لەبەر ێشبينی ی خـەڵكی دايە بۆتە هۆكاری بەهەڵەدا چوونی زۆر و نرخی ئەويان نەگەياندۆتەوە جێگەی مەبەست .

دەشێ كۆسپی ڕاستەوخۆ لەهەمان بەهەڵەدا چوونەوە بێت ، چـونكە بەهەڵـەدا چـوون لە هەڵەی ڕاستەوخۆوە بەدی دێت و تەنها لەياد بردنيش جێنياز نييە .لە چەند سەرنجێكی پەڕەوازەدا كە خەڵكی لە تابلۆكانی – بليكيان – داوە سيمای ئەويان بەجۆرەها شـێوەی جياواز هێناوەتە بەر باس .

بليك – ئەما تيۆری = – ( كەسێ لە خۆوە فێر بێت ) چارەسـەر نەكـەر " پەيامبـەری ژيانەوەی هونەری گوتيك و ڕۆماتيكييـە " بليـك وێنەكێـشی خۆشمەشـرەب ( بەڵگەيـە لای زۆربـەمان كـە مرۆڤـی خۆشمەشـرەب هونەرمەنـدانی خـراپن ) " و لـە نـاوەڕۆكی بيـستنی مرۆڤی بێكاردا ئەم خاتر جەمييە هەميشە بـوونی هەيـە كـە ئـەم مرۆڤـە خـاوەن هزرێكـی دروست نييە ... يەكێ لەم بۆ چونەی خەڵكی عەوام كە نيوەی ڕاسـتی دەپێكـێ ئەمەيـە كە خەڵكی لە وێنەكانی بليك دا چۆنێتييەكی گوتيكی دياری دەكەن .

بليك دوو ساڵ بەرهەمەكانی گوتيكی لە كەنيـسەی ڤێـست مينـستەر = Westminster و كەنيسەكانی تردا تۆژيبـووەوە ، خۆشـبينيی خـۆی دەرهـەق داهێنـەرانی نەناسـراوی ئـەو بەرهەمانە دەردەبڕی ... لەگەڵ گشت ئەمانەدا ڕاستەوخۆ هەمان ڕەگەزی كاری بليـك – ە كە خـەڵكی بەهەڵـەدا چـوون دەربـارەی ... چـونكە هەنـدێ وای بـۆ دەچـوون كـە لـەپای تۆژينەوەی بەرهەمەكانی گۆتيك دا بليـك دوچـاری جـۆرە نـەرێتێكی گـوتيكی بوبێـت ، بـۆ نمونە ئۆسبێرت بوردت = Osbert Burdett– تـا ئـەو ئاسـتە هـەنگاو دەنێـت كـە دەڵـێ : " خەياڵ ڕۆمانتيكی لە گۆشەكانی ئەو كەنيسە كۆن و پاكانەدا ڕەنگی گوتيكيان لەخۆ گرت،

وە لە پاشدا بلیك دەروازەکانی زەینی خۆی لەسەر هەر جـۆرە کارتێکـەرێکی تـر بەسـت " یان هەر کارتێکەرییەك کە لە پرتەوی دەسەلاتی گوتیك دا والا بوو بەو دەگەیی ."

وا دەردەکەوێت کە ئەم ڕستەیە دوو داخوازیی گومانلێکراو لەخۆی دەگرێت :یەکـەمیان ئەمەیە کـە دەلێـت خـەیالاتی بلیـك تاڕادەیـەك رومـانتیکی بـووە " دووەمیـان ئەمەیـە کـە وادەگەیەنێ هونەری گوتیك هونەری ڕۆمانسییە یان وەهایە کـە لـەزەینێکی رۆمانتیکییانـە خۆشی دێت .

ئاسانتر ئەمەیە لە سەرەتادا دەربارەی خواستی دووەم بتۆژینەوە ، چونکە لـە بۆتـەی ئەم باسەدا ڕەچـاوکردنێکی دی دەبیـنین دەربـارەی هونـەری گوتیـك کـە تاچـی ڕادەیـەك ڕۆشن کەرەوەی هونەری بلیك دەبێت . خودی بلیك وتویـەتی :" فـۆرمی یونـانی ، فـۆرمی ئەنـدازەیی یـە " فـۆرمی گوتیـك فـۆرمێکی زینـدووە ، فـۆرمێکی ئەنـدازەیی و لـە بـڕی بەلگەدارێتی دا هەمیشەیی یە " فۆرمی زیندوو بوونی هەمیشەیی یە." ئەم وشانە درکاندنی قولی ئەو دەربارەی هونەری گوتیك نیشان دەدات .

هونەری گوتیك هونەری هێلەو زیندووە ، لە بنچینەدا ئەم هونەرە بە گیان وەرگرتن لـە هونــەری ئەنـدازەیی و ئەبـستراکتی بـاکوری ئـەوروپا بـە یاریـدەی ڕەگـەزی خوایـەتی و ئاسمانی مەسیحییەتی ڕۆژهەلاتی بەدی هاتووە.

هونــەری گوتیــك لایــەنی هێلیــی خــۆی ( واتــە شــێوازی هێلــی هونــەری ســلتی و ئەنگلوساکسون) ی پاراستووە ، بەلام لە بری ئەو حالەتە وشکە نەخشە ئەندازەیی یـەکان ئـەم توانـا وێنەییەیانـە بـۆ بـەیان کردنـی هەسـتێکی زینـدو و سروشـتی — یـانی هەسـتی دەرهەق بە ژیانو سروشت و یەکەی خواوەندی جیهانی بینراو — بەکار دەبرد .

لەوپەڕی گەشەی هونەری گوتیك دا هەستیاری و خـەیالی ئافەریـدەی ئـەوتۆ دەبیـنین کە بەیاریدەی ڕێنمایی کردنی تەواوی شارەزایی هێلی دەرەکی بەکاربردنی شکلێ و دیـدەی لەخۆ گرتووە .

له هونەری گوتیك دا زۆربەی تواناكان له دیارترین بواردا ڕەوت دەكەن ، بـەم شـێوەیه یه كه دەتوانین بڵێین هونەری گوتیك به بوونی شوێنگەی ئاڵۆزی كه هەیەتی و بـه بـوونی ڕەوتی گەشەكردنی پڕخرۆشی كـه هەیـەتی " گـەورەترین تـەرز یاشـێوازی هونەرییـه كـه تاوەكو ئێستا به دەستی مرۆڤ داهێنراوه .

" سروشت هێڵی دەرەكی = Outline– نییه ، بەڵام خەیاڵەكانی مرۆڤ ئەوەی هەیـه ."
ئەمه قوڵترین خاڵ بوو كه بلیك — پەی پێ برد بوو، ئەم خاڵەش بـێ گومـان ئـەوی بـەرەو هونەری گوتیك ئاراسته و ڕابەری دەكرد — و هەمان خەیاڵاتی مرۆڤه كـه بەیاریـدەی هێڵـه دەرەكییەكان دیاری دەكرێت .

له كۆی پـێچ و پـەناكانی كارەكـانی بلیـك – دا وەك هونەرمەنـدی وێنـەكێش دەشـێ ببینرێ كه چۆن ئەم ڕاستییه گیان بەو دەبەخشێت .

هەمان خاڵ دەبێته هۆكار كه بلیك — له ڕینۆڵدز و هەرچییەك كه ڕینۆڵدز كـه دەیگـوت و دەیكرد بێزار دەبێت .

كاتێ بلیك دەڵێت : " شەیتان ڕینۆڵدزی بەكرێ گرتووه تاوەكو هونـەر خـراپ بكـات " له مەبەستی تێ دەگەین .

بـەڵام ڕۆشـنترین ڕونكردنـەوەی شـێوازی بلیـك — لـه كتێبێكـی بـچوكدا " كاتـالۆگی پێناسەیی " كـه ئـەو بـۆ یەكـەمین پێـشانگای تـابلۆی " سـەردان كـەرانی كـانتر بـوری " نووسیی ، هاتووه و دەڵێ : – ئایا ئەمه باوەڕی هونەرمەندێكی ڕۆمانتیكییه ؟

" چییەتی و بەیانی ئەم تابلۆیه هەرگیز شـیاو نـەبوو بـه سـێبەر و ڕونـاكی ڕۆبـنس یـا ڕامبراند یا هەر شێوازێكی فلاندەری یا ڤینیزی بەدی بهێنرێ .شێوازی ڤینیزی و فلانـدەری بریتییه له هێڵی شكاوه و قەبارەی شكاو و ڕەنگـی شـكاو ... شـێوازی بلیـك بریتییـه لـه هێڵه نەشكاوەكان و قـەباره و ڕەنگـه نەشـكاوەكان ، هونـەری ئەوانـه ون كـەری فۆڕمـه ، هونەری ئەو بەدی هێنەری فۆرم و پاراستنێتی ... هونەری ئـەو لەهـەر بارەیەكـەوه خـاڵی بەرامبەری هونەری ئەوانه .

" بناغەی گەورە و زێرینی هونەرو ژیان ئەمەیە کە هەرچی هێڵی دیاری کراو زەق تـر و ڕۆشنتر و بەهێزتر بێت " بەرهەمی هونەری تەواو ترە " وە هەرچـەندە ئـەو هێڵـە لاوازتـر و ناڕۆشنتر بێت ، نیـشانەی خـەیاڵ لاوازی و بـیٚ کـەڵکی هونـەری و پۆخڵکـاریی زیـاترە ... ناتوانـایی ئـەم فۆڕمـە والاًکـراوو دیـاری کـەرە ، لـە ناتوانـایی و کـەمیی بـیر و ئەندێـشەی هونەرمەند و جۆرە بەشەکانی شارەزایی دەدویٚ .چۆن دەتوانین دار بەڕو لە چنار و ئەسپ لە گا جیابکەینەوە بێجگە لە نیشان دانیـان بـەو هێڵـە والاًیانـە و جوڵـە وچـەمانەوەی بـیٚ پایانی ؟

ئایا ئەوەی خانویەك دیاری دەكات یان باخچەیەك بێجگە لەهێڵی دیاری کراو هۆکارێکی تری هەیە بۆ بەیان کردنی شکڵەکانی ؟ ئەوەی ڕاستگۆیی لەهەڵە گۆیی جیادەکاتەوە ئایـا شتێکی زیاترە لە هێڵی سەخت و بەتوانای ڕاستی و یەقین لە کار و نێـت و خواسـتەکان ؟ ئەگەر چاوپۆشی لەم هێڵە بکەین ئەوا مانای وایە لە خودی ژیان چاوپۆشیمان کردووە .

خاڵێکی دی هەم بوونی هەیە کە دەبـیٚ دەربـارەی تایبـەتێتی بلیـك و هـەم دەربـارەی هونەری گوتیك یاد بکرێتەوە ...

ئەگەر هونەری گوتیك هونەری ژیاوە ، ئەم هونەرە بەم بۆنەیـەوە دوپـاتی یـا وێنـەیی نییە فۆرمالیست نییە – .

لە نێوان ئەو توانامەندێتییە دا کە هونەرمەندی بـەهرەدار دەیـەوێت لـە فۆرمـە دیـاری کراوەکان دا هەڵبژێرێت و ئەو فۆرمە بیٚ سنور و نادیارانەی کە لە سروشتدا بوونیان هەیە، هیچ گونجاندنێکی پێویست بوونی نییە .

یەك هێڵ یا فۆرم – ی ژیاو بەپێی پێویست بە مانای "وەکو ژیان" دەقـاودەق نییـە ... بەڵکو تەنها بەم مانایە یە کەگیانی لەبەردا بێت و خاوەن ژیان بێت ... ڕاسـتی ئەمەیـە لە کۆی قۆناغەکانی هونەری ڕەسەن دا جیاوازی لە نێوان وێنە یـا شـکڵی ڕاسـتی و شـکڵی هونەریدا – کە هەمان شکڵی خەیاڵی مرۆڤە – دیاربووە لە دەربڕین دا .

شتی ڕاستی هەمان بابەتی نا خەیاڵییە و سرۆش تیایان دا سروشتی نییە . ئەمەیە کە دەبێتە هۆکاریٚ کە بلیك دانی پیادا دەنێت و هەوڵ دەدات بڵێت : " شتە سروشتییەکان هەمیشە خەیاڵەکان لە بوونی من دا لاواز دەکەن و دەیکوژن و لە ناوی دەبەن . " خەیاڵکردنەوە" سەرنجی رووت " لای ئەو یەکانە ڕاستی و یەکانە بەها بوو.

خەیاڵکردنەوە وشەیەکی ئاڵۆزە ، جەزبەیەکی شیاوە و دەکریٚ بۆ ئابروبردنیش بەکار ببرێت .

دەشێت ئەم خاڵە کە بلیك دەربارەی " جەزبە " بەکاری دەبات و لەو سەردەمەدا ئەو وشەیە هۆکاری سەرسەختی بوو بەهۆی بوغزکردنییەوە لە خەڵکی بۆ خۆی چنگی دەخست یا خۆی پیٚ دەناساند هۆکاربوون بۆ بەدیهێنانی بەهەڵەدا چوون دەربارەی بلیمەتیی خۆی .

دکتۆر جانسۆن جەزبە = Enthusiasm بەدڵنیایی بێهودەیی دەرهەق هاودەمی خودی خواوەند ڕاستی کردن " پێناس کرد " بە کوردی مانای وایە چەق بەستنی زات لە دڵنەواییەکی گیانی دا ... بلیك بە پەیوەندیی زۆری کە بە بەرهەمەکانی لاڤاتر = Lavater و شود نبورگ = Swedenborg — نیشانی دەدا ئەو بەدناوبوونەی سەرباری خۆی کرد.

لە زەمینەی وێنەکێشان دا بلیك داهێنەرێکی تەواو نەبوو بەڵکو پابەندی سونەتو شێوازیٚ بوو ، هەرچەندە بۆ چنگ خستنی ئەو شێوازە ڕێگەیەکی دووری دەبڕی ... لە هەمان کاتدا خاوەنی کۆنترۆڵ بوو ، لە کۆتایی دا ئەو کۆنترۆڵەی کە خۆی ئاشکرای کردبوو ڕێنومایی دەکرد ... نەك ئەمەی کە کۆمەڵگە ئەو ناچاری ئەو جۆرە کۆنترۆڵە بکەن ... واتە خودی ئەو بدۆزو بەکار بەر بوو.

ئەگەر ئێمە دووچاری دوو هەڵەی گەورە نەهاتبین — یەکەمیان ڕەچاوکردنی هونەر بە شێوەی شتێکی جەنجاڵی و عەینی پەتی ، و دووەمیان ڕونکردنەوەی هونەر بە یاریدەی سۆزێکی جوانناسییانەی پەتی — ئەوا پێویستە ئاگاداربین کە هونەر لە سادەترین

وەڕوکەوتنیدا بەگشتی سەر بەدەربڕینە لە ژیان . گاه بە ڕوویەکی ئایینی ، گاه بە شیعری و گاه فەلسەفییانە ژیان دەگرێتە خۆی .

بلیك لەم جۆرە دیدانەوە ئیلهامی وەردەگرت ، ئەم دیدانەیشی هێندە عیرفانی بوو کە توانی گۆڕینی نەبوو ، دیدەی بلیك بەم مانا پەشیمان بەخشە عیرفانی بوو ، چونکە لە شێوازی زاڵی سەردەمی خۆیدا ، واتە لە تێگەیشتنی هاوبەشی خەڵکی — دوورە پەرێز بوو.

غەریزەکانی بلیك ئەویان بەرەو جۆرێك لە هەستی ڕابەری ئاراستەکرد بوو کە پێنج سەد ساڵ بەر لەسەردەمی خۆی شیاو و باو بوو ، لەگەڵ ئەمەدا کە دەیویست هەستەکانی خۆی بە توانا و سەرنجی تەواو بەیان بکات ، ئەم خاڵە ئەویان بە سەردەمەکەی خۆی نزیکتر دەکردەوە ، بەڵام ئەمڕۆکە ئێمە زیاتر بەو نزیکترین ، هەر شتێ لە هونەری نوێ دا ڕەسەن و ئاگایانەیە ، پەسەند کەری هێڵی دیار و سەرپێچی کەری یا دژی سێبەر و ڕوناکیی تێکچڕاو " پەسەند کەری دەربڕینی خەیاڵ ئامێزی ڕاستییە و دژی لاسایی کردنەوەی پەتییە " پەسەند کەری شێوازی مانەوی و باڵایی یە و دژی شێوازی وشك و ماددی و بێ گیانە ... ئەم خاڵە لەبەرهەمەکانی سیزان و دێریان = Derain —دا لە لایەك و لە بەرهەمەکانی پیکاسۆ و لێجێ = Leger — دا لەلایەکی ترەوە بەرچاو دەکەوێت " ئەم هونەرمەندانە بەهونەرمەندانی بێ ناوی یل ناو ونی قۆناغی گوتیك زیاتر لە هونەرمەندانی قۆناغەنێوانی لێکچوون ... لە قۆناغی پاش گوتیك دا تەنها بلیك — هەیە کە لەگەڵ ئەوان دا پێوانە شایانە " ئەوەش بەم ئاراستەیە کە وەك پێشتر وتمان بلیك — هونەرمەندێکی گوتیکییە " نەك تەنها لە ڕوانگەی بۆچونەوە ، بەڵکو لە ڕوانگەی هەندەکییەتی کارەکانیشییەوە ... زنجیرەی وێنەکێشانە باڵاکانی "وێنەکانی کتێبی پیرۆز" دەشێ چاترین گەواهی ئەم پڕوپاگەندەیە بن ( وێنە47).

لە هێڵکاری یا نەخشە = دیزاین — ی ئەم وێنانەدا جەسارەت و شکۆیەکی ئەوتۆ هەن " لە بونیان دا توانایەکی ئەوتۆ و لە ڕەنگەکانیان دا کاریگەرییەکی ئەوتۆ کە بۆ بینینی —

هاونەخشیان ( یان شێوەی هەمان شێوە) پێویست دەکا سۆراغی کتێبە هێلییەکان و پەنجەرەکانی کەنیسەکانی سەدەی دوانزەیەم و سیانزەیەمدا بکەین00 .وێنەی " ئیلیاس لە حاڵەتی سواربونی گەردانەی ئاگر "دا لەگەڵ بابەتی ئاگرینی خۆیدا بە ڕۆشنییەکی تەواو لە سوتاندایە —.

بلیك تابلۆیەکی بە ڕەنگی تەمپێرا Tempera — ی جوان واتە ڕەنگی گوواش دەربارەی " ئادەم لە حاڵەتی ناولێنانی گیانداران دا " دروست کردووە کە لە ڕوانگەی هونەرییەوە لە وێنە ئاوییەکانی جوانترە بەڵام بەچاکی ڕەنگی ئاوی بەدی نەهاتووە .

ئەم وێنەیەش گیانی گوتیکی هێندە جوان نیشان داوە کە من هێندە لەسەری پێ داگری دەکەم ... ئەم خاڵە بەتایبەتی لە تەرزی کێشانی قامەت و پرچی حەزرەتی ئادەم داو باری گشتیی لەش و دەستی بەرزبۆوەی و گەڵای دار بەڕووەکان بەژورسەرییەوە دەبینرێ دەربڕینی گوتیکانەی هەیە ... هێڵکارییە ناتەواوەکانی سەر بە دۆخ و بەهەشتی دانتی — کە بلیك لەسەرە مەرگیشا کاری تیاکردن و لەهەمان کاتدا کە گیانی گوتیك — یان پاراستووە ، لە پێناوی گەیشتن بە هەستیارییەکی دی دا تەقەلایەتی و نیشانی دەدات کە حودی ئەو توانیویەتی خەیاڵی خۆی بەخەیاڵی دانتی لێکچوێنێ ... گوایە لەپێناوی سەلماندنی ئەم جەزبەیەی خەیاڵی بەربڵاوتردا توانیویەتی بەبینای وێنەیی هێڵکارییەکانی چییەتی یەکی ناسکی هێزی ببەخشێت " ئەمەیش چۆێتییەکە کە دەشێ بەر لەمانای ناوەڕۆکی — کۆمپۆزیشنەکانی کتێبی پیرۆز کارتێکەرێکی نوێ بەبینەران و بیسەران ببەخشێ .

## 67 – تێرنەر = 1775 – 1851 William Turner

ئێمە سەرگەرمی تۆژینەوە بووین دەربارەی ولیەم بلیك — بەڵام پێویست دەکات ڕۆژێکیش بە هەڵسەنگاندنی بلیمەتیی تێرنەر بگەین " لەڕاستی دا هێشتا لەژێر کارتێکەری

ئاخاوتنی ڕاسکین — داین ... ڕاسکین هێندە پاراو و کاریگەر دەربارەی تێرنەر دواوە کە ناوبانگی تێرنەر کەمێ شێواوە وەك هەورێ لە تەپ و تۆزی زێڕین دا ون بووبێت ، ئەم تەپ و تۆزەی لەسەر لاچووە ئێستاکە ، بەڵام هێشتا نەمانتوانیوە سەرنجێ لە ڕابردوو بدەین و ئەم گەورە هونەرمەندەی مێژووی وێنەکێشانی ئینگلتەرا بەڕاستی ببینین .

تێرنەر دەشێ تەنها کەڵ بێت کە لەوڵاتی خۆیدا پەیڕەوانی زۆری نەبێت ، بەڵام گومانی تێدا نییە کە یەکێکە لە مەزنترین وێنەکێشی مێژووی ئینگلتەرە .

تێرنەر لە 23 – 8 – ی 1775 هاتە ژیانەوە و لە 19– 12– 1851 کۆچی کرد ... باوکی کە تێرنەر گەڵێ دڵبەستەی بوو بۆ ماوەی پەنجاو پێنج ساڵ لەتەکیدا ژیا و لە لەندەن ئارایشتکەر بوو...دایکی کە خۆشەویست نەبوو لای تێرنەر ژنێکی توند خوو بوو کە لە ئەنجامداشێت بوو .

تێرنەر خوێندنێکی شایەن یادی پەیڕەو نەکردووە و بە درێژایی تەمەنی بێ خوێندن و فێرگە مایەوە — ئەمەش شتێکە کەدەشێ لە تیژبینی ئەودا کاریگەرییەکی باشی هەبوبێت.

لە نۆ ساڵی دا ئامادەیی وێنەکێشانی نیشان دا و لە سیانزە ساڵی دا دڵنیابوو لەوەی کە پێویستە وێنەکێش بێت و بووە شاگردی چەند ئوستادیکی وێنەکاری و هەڵکۆڵین و بیناکار ... ئەم بوونە شاگردییە هەرچەندە زیاتر لایەنی خزمەتکاری هەبوو " لای خودی تێرنەر مەشقێکی چڕو پڕ بوو لە هونەری و بنچینەی وێنەکێشان دا.

سەرهەڵدانی ئامادەیی تێرنەر دەگەڕێتەوە بۆ ساڵەکانی منداڵیی کە دەیسەلمێنێ بلیمەتیی ئەو خودی بووە و ئامادەیی یەکی سروشتی بووە لەودا .

تێرنەر هەرگیز لەو هونەرمەندانە نەبوو کە پشت بە بلیمەتی خۆی ببەستێ ، چونکە دڵنیابوو کە بلیمەتی بەبێ خۆ ڕێکخستن و کۆنترۆڵ مەزنیی چنگ ناخات " کۆنترۆڵیش لە هونەردا بێجگە لە چنگ خستنی پیشەیەکی سادە و خۆشی بەخشی شتێکی دی نییە .

هەندێ لە پیشەکانی ئەو — وەك نیشان دانی چەرخی سوڕانی ئاو هێشتاکە سەرمان دەسوڕمێنن .

توانای لە ئەستۆ گرتنی ئەم جۆرە کۆنترۆڵە بەسەر خوددا ، چۆنێتییەکە پەیوەندە بە سروشت و بینای ئەندامی مرۆڤەوە .

خاسیەتێکی دیکەی تری تێرنەر بەم شێوەیە دەتوانین ڕونبکەینەوە " ئەویش مە یلی پشکنینی بێ پایانی ئەو بوو ، ئەزمونگەر و پشکنیاری بێ ئۆقرە بوو بۆ چنگ خستنی نوکاتی سروشتی .

تێرنەر بەنێو بەهێزترین تۆفان دا دەڕۆیی و ( وێنە 48) بەلوتکەی سەختترین کەڵە بەردا سەردەکەوت و وێنەی وەدیهێنەران سەختیی زۆری سەرباری خۆی دەکرد تاوەکو بتوانێ لەبارترین و نایابترین دیاردەی سروشتی بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە .

هیچ کە سێ تاوەکو ئێستا وێنەی تێرنەر ژیانی خۆی تەرخانی پیشەکەی نەکردووە . تێرنەر کەسێکی کورتە بالاّ و لووت هەڵۆ دەنوك شێوەبوو بەدەست و پێ ی بچکۆلەوە : حەزی دەکرد خۆی بە ناپلیۆن بەرامبەری بکات و هەڵسەنگێنێ و بەدرۆوە ڕایگەیاند کە لە دایك بووی هەمان ساڵ ژینی ناپلیۆنە و کەسێتییەکی ئاڵۆزی هەبوو و لە تۆژینەوەدا دەربارەی ئەو پێویستە ئاراستەی واتای قوڵی لۆرد ئاکتۆن = Acton بین کە دەڵێ : " چاکە و خراپە لە تەنیشت یەکەوەن . لە کەسێتیی مرۆڤ دا بەدوای یەکبونی هونەریدا مەگەڕێ . "

ڕاسکین کە لایەنگری پڕجۆشتری تێرنەر بوو لە وەڵامی ژیاننامەی دا کە داوای لێ کرابوو تا خاسیەتە سەرەکییەکانی تێرنەر پێناسە بکات " ئەم سیفاتانەی پۆلێ کرد : " کەللە شەق و سەخی ، دڵ نەرمی و ( بەهێز) ، چەنەبازی ( بەهێز) ، کەچ مەیلی ، بێ وەفایی " .

ئەوەی ئێمە دەربارەی ژیانی تێرنەر دەیزانین ڕوانگەی ڕاسکین دان پیادا دەنێت " بەلاّم خاڵێکی تر سەربارو سەلمێن دەکەین ئەویش جۆرە خۆ حەشاردان و فیراری بوو لە

خەڵکی کە بوبووە هۆیەك تا تێرنەر نا سروشتی و ناکۆمەڵایەتی بێت . تێرنەر لە سـەرەتای لاویی دا لە عەشقا تێکشکا و هەرگیز ژنـی نـەهێنا . لەگـەڵ کـۆی خـەڵکی دا بـە ئـەدەب و خۆش ڕەفتار نەبوو و هاوژیانیی مەلەوانان و مشتەری ئافرەتی مەیخانـەکان و لەنـدەنی لا چاتر بوو ... بەڵام ئەم لایەنەی ژیانی بە چاکی حەشار دەدا .

تێرنەر لە بیـست و چـوار سـاڵی دا پابەنـدی ئاکـادیمیی میرنـشینی بـوو و لـە بیـست و هەشـت سـاڵی دا بەناونیـشانی ئاکادیمـست ناسـرا ... بەچـاکی دەیزانـی کـە ناوبـانگ و ( کاسپییەکەی ) پەیوەست بوو بە پاراستنی ڕوکەشییەوە . بێ شك کەسێتی تێرنەر بوو کە بووە ئەم هۆیەی هونەری دیمەن سازی بکاتـە کـاری بنـچینەیی خـۆی – گـەواهـ هـەن کـە دەیسەلمێنن ئەگەر ئەو بیویستایە ئەوا دەیتوانی پۆرترێت سازێکی زۆر چاکیش بوایە .

لە سەرەتادا بەچاکی فێرە هونەری ڕەنگی ئاوی بوو کە خاسییەتی هونەری ئینگلیـزی بوو و بووە یەکێ لە گەورەترین ڕەنگـی ئـاوی سـاز کـە تـاوەکو ئێـستا جیهـان بەخۆیـەوە دیوە.

بەڵام ڕەنگی ئاوی بەکاربردن لای ئەو هۆیەك بوو بۆ گەیشتن بە نیازێکی دی – ڕەنگـی ئاوی یاداشت و لێکۆڵینەوەیـەك بـوون کـە لـە دواییـدا لـە بەرهـەمی مـەزنی ڕەنگـی ڕۆن دا خستییە کار ... ئەو هێنـدە ڕاسـتگۆ نـەبوو کـە مەبەسـت و نیازەکـانی بـەزمانێکی ڕۆشـن بەیان بکات ، بەڵام گومانی تیـادا نییـە کـە دەیویـست مێملـی هونەرمەنـدانی وەك کلـۆد و پۆسین بکات و لەوان پێشکەوتوتر بێت .

یەکێ لە تابلۆکانی کە زیاتر نزیکە لە شێوازی کلود –ەوە بە گەلەرییەك دەبەخشێ بەو مەرجەی کە هەمیشە لەتەك تابلۆکانی کلود –ەوە نیشان بدرێ و هەڵواسرێت : تێرنـەر لـە پێوانەکردنی خۆی بەکلود – نەدەترسا .

لەگەڵ ئەوەدا کە تێرنەر بە نەزان ناودەبرا لـە بـواری خوێنـدن دا ، ئـەبێ ئـەم خاڵـەش بهێنینەوە یاد کە ئەو لە بنچینەدا وێنەکێشێکی " شاعیر " بوو " نەك تەنها لەو ڕووەوە کە هەندێ لە بابەتە ئەفسانەیی یەکانی = میتۆلۆژییەکانی پێ خۆش بوو و لە بەرهەمـەکانی دا

بەیانی دەکردن " بەڵکو لـەو رووەشـەوە کـە تێرنـەر موبتـەلای ڕەچـاو کردنـی ڕۆمـانتیکی سروشتی بوو بەتایبەتی دیمەنی سروشتی .

هەمان شێوە کە لە زەمینەی ئەدەبیات دا بالاًترین ڕەنگدانەوەی رۆمانتیکی بالأدەست بوو ، ڕەنگدانەوەی شوێنەواری ڕۆمانتیکی لە بەرهەمەکانی شاعیری هاوچەرخ بە تێرنـەر " واتە ورد زورس دەبینین –

ئەم ڕەچاو کردنە ڕۆمانتیکییە لە نووسینەکانی جان ڕاسکین دا بەشێوەیەکی تیـۆری و تەنانـــەت سەروسروشـــتی دا – میتافیزیـــك – ئاڕاســـتەبوو – بەتایبـــەتی لـــە کتێبـــی " هونەرمەنـدانی نوێـدا " کـە لـە ڕاسـتی دا دەزگایـەکی تـەواوی جواناسـییە کـە لەسـەر بنچینەی ئاڕاستەکاری بەرهەمی تێرنەر بینا کراوە .

ئەم ڕێچکەی ڕۆمانتیکە بە پێچەوانەی ئەوەی کە زۆر جـار تێـی دەگـەن ، یـەك ڕەوتـی ئایدیالیستی یا تیۆری نەبوو " بەڵکو بەپێچەوانەوە لەسـەر بنـچینەی بینینـی ڕاسـتەوخۆ و زۆر کەم زانستی دابین بوو .

بەلای کەمەوە لە ئینگلتەرەدا پەیوەندییەکی نزیکـی هـەبوو بـە ئەزمونگـەری تایبـەتی ئینگلیزییەوە .

شتێ کە هەیە ، ئەو خالأنەی کە بەو شێوەیە لـە بینینـەوە بەدەسـت دێـت بەیاریـدەی هێـزی خـەیاڵ دەگۆڕدرێـت " ئەنجامەکەیـشی ئەمەیـە کـە" شـیعر " بەوپـەڕی قـوڵی و بەرفراوانی مانای ووشە بوو کە بناغەی کاری ڕۆمانتیکی بوو . ڕاسکین ئەم پرۆسێسە بـەم وشانە پێناسە دەکات :

" بالأترین هێزی خەیاڵ هەمیشە ماددەکانی کاری خۆی وەها ڕێك دەخات کـە هـەرگیز لە بۆتەی توێکڵ و گەرد و تۆزی شکڵی دەرەکی دا نەمێنێتەوە و خودی شتەدەرەکییەکان وەلاوە دەنێت و لە ناوەڕۆکی ئاگرینی داخوازیدا خۆی تاو دەدات " هیچ کارێکی دی گیـانی ئەو ڕازی ناکات " لێکچونەکان و ڕەنگدانـەوە ڕوکەشـەکانی بابـەت دەشـێ بـەهیچ دووچـار نەیەت : خەیاڵ دەسەلأتی خۆی لە گشت بوارێکدا دەتەنێتەوە و خۆی بـە ڕەگ و ڕیـشەی

بابەت دەگەیەنێ لە خۆشاوی ژیانی هەمان بابەت کـە جـێ نیـازی وێنـاندنێتی خـۆی تێـراو دەکات : کاتێ کە گەیشتە ڕەگ و ڕیشە ، ئازادە یا سەرپشکە لەوەی هـەر جـۆرە چـڵێکی بوێت بیڕوێنی، بەجۆرێکی وەهـا کـە هەمیـشە لـەناو خۆشـاوی هـەمان چـڵەکان دا بێـت و هەرچۆنێکیش بیەوێت سەرپشکە لە تاشین و بڕینـی چـڵەکان و بـەکاربردنیان بـۆ دروسـت کردنی شتی تر لەوان یا بۆ بەکاربردنی بەروبوومی چاتر و جوانتر لەو درەختە کۆنـە " ئـەم پرۆسێسەی بڕین و تاشینی لقەکان کارێکە کە هێزی خـەیاڵ خۆشـی پـێ نایـەت و زۆرجـار بەم کارە هەڵناسێت " چونکە کار و ئامادەیی ئەم هێزی خەیاڵە ئەوەیە کە خۆی بە ڕەگ و ڕیشە بگەیەنێت ، وە چییەتی و بوونی ئەو هەمان دەستێوەردانە لە ناوەڕۆکی شتەکان .

دەستی لە لێدانی ئەم دڵـە هەڵـدەگرێ و لـە پێـشگوێی دا دەمێنێتـەوە ، ئـەم هێـزەی خەیاڵە بە چاو سەرنج نـادات ، بـە دەنـگ و بـاس داوەری ناکـات ، دەربـارەی رووکەشـی دیاردەکان نادوێت، چونکە هەرشتێ کە نیازمەندە بیڵێ و بیکات لە دەرونەوە و لە دەرون دا ئەنجامی دەدات .

ئـەم ڕایـە بـەر لـە سـەد سـاڵ لەمـەو پـێش نووسـراوە = 1846 و هەرچـەندە لـەو سەردەمەدا کەسێ پەی پێ نەبردبوو کەسیش تێی نەگەیی ، بەڵام لەو پارچە نوسـراوانەی ڕاسکین دا تیۆرێکی نوێ لە بواری هونەردا بۆ جیهان کەوتە ڕوو کە بووە هۆی ڕاپـەڕینێکی نوێ .

تێرنەر بە " باوکی ئیمپریسسیونیست = ڕەنگدانەوە خوازی " نـاو دەبـەن ،بـەڵام ئـەو بـەو پێودانگـە شـیاوی ئەوەیـە کـە بـاوکی ئیکسپریـسیونیزم — دەربـڕین خـوازی — یـش ناوببرێت .

ئەمڕۆکە ئێمە لەم وشەیەی " خەیاڵداری " لەم "هێزە سەلمێنەر و گاڵتەجارکـەرە کـە بەواتای ڕاسکین "باڵاترین هێـزی بـیری مرۆڤـە" دەشـێ هێنـدە خۆشمـان نەیـەت ، بـەڵام لەهـەمان هەڵوێـست و جێگەدایـە کـە گەمـژەیی خۆمـان دەخەینـە ڕوو و هـیچ یـەکێ لـە

ئوستادانی ئێمە ناتوانن لەرووی ڕاستی و توانامەندی و لێهاتویی یەوە بگەنە پلەو پایەی هونەرمەندێکی وەك تێرنەر .

کاری تێرنەر لە بواری تایبەتی ی دا گەلێ بەر بلاو و هەمەجۆرە ، لە بواری کاردا ئەو یەکێکە لە زۆر بەرهەم دارترین وێنەکێش ... تێرنەر کارێکی زۆری کردۆتە سەر ئیمپریسیونیستەکانی فەرەنسی و ئیکسپریسیونیستە ئەڵمانییەکان — بەلام ناسنامە و بلیمەتی ئەو هێندە بەربلاو نییە ... لەبەر هەمان هۆکارە کە بەرهەمەکانی تێرنەر تەنها لە ئەمەریکا و ئینگلتەرە چاودێری دەکرێن ... بەرهەمەکانی ئەو کە دەشێ مەزنترین وەڕوخستنێ بێت لە شکۆ و دەسەلاتی سروشت کە مرۆڤ تاوەکو ئێستا چنگی خستووە ، زۆر جار لەپێش چاوی خەڵکی جیهان حەشاردراوە و کەمتر نیشان دەدرێت .

## 68 — سروشت و هونەر

مەبەستمان لە " سروشت "هەمان جیهانی بینراو و ڕووکەشە ، بەلام بەم پێناسەیە مەسەلەی پەیوەندی وێنەکێش بە سروشتەوە ئاسان ناکەین ... ئاسانترە کە تۆژینەوەکەمان بەڕاستییەکی دیاری کراوی وەك دیمەن سنوردار بکەین .

دووبابەت شایانی باسن " یەکەمیان — ڕووی جیاوازی لە نێوان هونەر و سروشت دا چییە ؟

ئایا لە نێوان جوانیی دیمەنێکی ڕاستی و هەمان جوانی دا کە لە تابلۆیەکی وێنەکێشراودا بەدی دەکرێت جیاوازییەکی بنچینەیی بوونی هەیە "

ئەگەر وەلامێکی پۆزەتیف بۆ ئەم پرسە بدەینەوە — بەو شێوەیەی کە پێویست دەکا وەلام بدەینەوە — لەو شێوەیەدا ڕووبەڕوی ئەم مەسەلەیە دەبینەوە کە کاری وێنەکێش کە لەنێوان ئێمە و سروشت دا بەدی دێت چییە ؟

ئەگـەر هونـەر بێجگـە لـە ڕێکخستنی دیاردەکـانی سروشـت شـتێکی دی نـەبێ ، ئـەوا کەمترین لاسایی کردنەوەی سروشت چاکترین بەرهـەمی هونـەری دەبـوو و هێندەیـشی نەدەما کە وێنەگری = فۆتۆگرافی – جێگەی وێنەکێشان بگرێتەوە .

ئەمڕۆکە ئەو جۆرەی وێنەکێشان کە زۆربەی وێنەکێش خەرجیی ژیانی خۆی پێ دابـین دەکات ( وێنەی پۆرترێت کێشان و دیمەنی جوگرافیایی ) جێگـەی خـۆی بـە وێنـەگرتن = فۆتۆگراف بەخشیوە .

بەڵام ڕاستی ئەمەیە کە تەنانەت مرۆڤی کێویش نکۆڵی لەو فریـوە ناکـات کـە فۆتـۆ لـە جێگەی بەرهەمی هونەریدا دەیدات – بۆیە لەبەر ئەم هۆیـە بـەبێ پەنابردنـە بـەر تیـورێکی تەواوی جوانناسانە وەژورکەوتنە نێو ئەم ڕونکردنەوەیە مەحاڵە .

بە زمانێکی گەلێ سادە دەتوانین بڵێین کە وێنەکێش لە دیمـەن کێـشان دا ( وەلـە هـەر کارێکی دی دا ) نایەوێت دیاردەی بینراوی ئەو دیمەنە پێناسە بکات ، بەڵکو دەیەوێ شتێ دەربارەی دیمـەنی وێنەکێـشراو بـە ئێمـە ڕاگەیـەنێت ... ئـەم شـتەش دەشـێ بینینـێ یـا هەستێك بێت کە هاوبەشە لەنێوان ئێمە و هونەرمەندا " بـەڵام ئـەم شـتە زۆربـەی کاتـەکان وەڕوخستنێکی نوێیە یا دیدێکی تازەیە کە هونەرمەند مەیلێتی بە ئاگاییمانی بگەیەنێت .

هەرچەندە ئەو وەڕوخستنە " کشف" نوێتر بێت ، ئەجری یـا پاداشـتی هونەرمەنـد لـە ڕوانگـەمان دا زیـاترە ، وە گریمـانی ئێمـە هەمیـشە لەسـەر ئەمـە بەنـدە کـە هونەرمەنـد کارامەیی هونەریی تەواوی هەبێ تاوەکو پەیامەکەی خۆی بە ڕێبازێکی ڕۆشن و کاریگەر بە ئێمە بگەیەنێت .

کەواتە ئەو شتە چییە کە هونەرمەند وەڕو دەخات و تەنها خودی ئەو دەتوانێ ئەوە بە بیستگە و دیدەی جیهانی بگەیەنێت ؟

چاتر وایە کە هونەرمەندێکی گەورەی ڕیالیستی گـەواهی باسـەکەمان بکـەین ، بـۆ ئـەم مەبەستەش کەسێکی لەبارتر لە جان کۆنستابل– بەڕەوا نابینین .

له کتێبی" ژیانی کۆنستابل"دا بـه قه‌ڵـه‌می هـاوڕێ و هاوکـاری سـی . ئـار. لێسلی = C.R.Leslie – وتـــه‌و تێبینـــی بـــه‌ربڵاو تۆمـــاره کـــه لـــه زمـــانی خـــودی وێنه‌کێـــشه‌وه گوێستراوه‌ته‌وه‌و گه‌لێ جێگه‌ی گـرنگن ... بیره‌وه‌ریـی هونه‌رمه‌نـدان هه‌میـشه ده‌ربـاره‌ی هونه‌ر گرنگه ، به‌ڵام ئه‌مه نابێته به‌ڵگه که بیرکردنه‌وه‌کانیان هه‌میشه ڕاست و بێ خه‌وشـه " چونکه توانای به‌یانکردنی ئه‌وه‌ی له ویژداندایه لـه بـوارێکی هونه‌ریـدا هه‌میـشه وته‌بێـژی توانای به‌یان نییه له بوارێکی تردا – به‌تایبه‌تی له دژوارترین و ئاڵۆزترین بواردا واتـه وتـه‌ی نووسراوه .

به‌ڵام که‌سـێتی کۆنـستابل سـاده‌یی و ڕاسـتگۆیی پێـوه دیـاره کـه له‌داوه‌رییـه‌کانی دا پێچه‌وانه ده‌بێته‌وه " ئـه‌م داوه‌رییانـه‌ش دیـدێکی فراوانـی ده‌ربـاره‌ی هونـه‌ری ئـه‌و، واتـه وێنه‌کێشان نیشان ده‌دات .

ئه‌م پارچه‌یه‌ی ژێره‌وه له ده‌فته‌رێکییـه‌وه ده‌ربـاره‌ی ئـه‌لبومێك لـه هه‌ڵکۆڵینـه‌وه‌کانی کۆنستابڵ ده‌دوێ به‌ناوی " دیمه‌نه‌کانی ئینگلته‌ره" که له سـاڵی 1829 بلاوکراوه‌تـه‌وه : " دوو ڕێگه لـه هونـه‌ردا بـوونی هه‌یـه کـه که‌سـان به‌یاریده‌یانـه‌وه ده‌کۆشـن خۆیـانی پـێ تایبه‌ت بکه‌ن – ڕێگه‌ی یه‌که‌میان ئه‌مه‌یه که هونه‌رمه‌ند به‌کاربردنی شاره‌زایانه لاسایی ئه‌و به‌رهه‌مانه بکاته‌وه که ئه‌وانی دی به‌ریان هێناوه ... یان جوانیی هه‌مه‌چه‌شنی کاره‌کانیـان بژارده‌بکاو کۆمپۆزیشنیان دوپات بکاته‌وه .

ڕێگه‌ی دووه‌م – هونه‌رمه‌ند چۆنێتییه‌کی باڵا له‌سه‌رچـاوه‌یه‌کی سـه‌ره‌تایی دا واتـه لـه سروشتدا ده‌پشکنێ ... له ڕێگه‌ی یه‌که‌مدا وێنه‌کێش به تۆژینه‌وه‌ی تابلۆ وێنه‌کێشراوه‌کان شێوازی خۆی به‌دی دێنێ و هونه‌رێکی لاسایی که‌رانه یا وه‌رگـێراوی بـه‌دی ده‌هێنێـت " لـه ڕێگـه‌ی دووه‌میـان دا وێنـه‌کێش بـه‌بینینی پـڕ سـه‌رنجه‌وه چـۆنێتییه‌ك لـه سروشـت دا وه‌ڕوده‌خات یا ده‌دۆزێته‌وه وه که به‌رله‌و که‌سێکی دی وێنه‌ی نـه‌کردون ... بـه‌م شـێوه‌یه شێوازێکی ڕه‌سه‌ن داده‌هێنێ .

ئەنجامەکانی ڕێگەی یەکەم لەبەر ئەمەی دووپاتی شتەکانە کە چاو خووی پێوە گرتون زوو بە زوویی دەناسرێن و هەڵدەسەنگێنرێن " بۆیە پێشەوە چوونی هونەرمەند لە ڕێگەی نویٚ دا ناچارانە پێویستە ، چونکە کەم کەس دەتوانن داوەری لە شتیٚ بکەن کە لەڕەوتی سادە لایداوە یا کەمتر خەڵکان دەتوانن بەهای سەرهەڵدانی نویٚ پەی پیٚ بەرن .

## 69- جان کۆنستابڵ = 1776-1837

## Constable John

بە ڕوانگەی کۆنستابڵ دوو شت پێویستە بۆ پرهێزکردن : بیٚ هودەیی لاسایی کردنەوە و شیرینکاری " واتە هەوڵ دان لەپێناوی ئەنجام دانی کارێك کە باڵاتر بیٚ لە ڕاستەقینە .

" ئەوانەی گرنگی بنچینەییان هەیە بریتین لە " درکاندنی پاراوی نوکاتە سروشتییەکان ".

" ئێمە هیچ شتیٚ بە ڕوویەکی ڕاستەقینە نابینین، مەگەر ئەو شتانەی کە تێیان دەگەین."

بەڵام تێگەیشتنی سروشت کارێکی سادە نییە .

" وێنەکێشی دیمەن ساز پێویستە بە زەینێکی کراوەوە لە دەشتەکان دا بگەڕێت ."

پێویستە سروشت بە مەبەستێکی زانستییانە و لە ئاکامدا بە گیانێکی تایبەت بتۆژینەوە .

" هونەری سروشت بینین شتێکە کە تاڕادەیەك وەرگیراوییە = اکتسابی — وەك هونەری خۆیندنەوەی هێڵی هێرۆغلیفی میسری . "

هەڵبەتە لێچواندنی دروست ئەمەیە کە وێنەکێشی سروشت بە شاعیری سروشت پێوانە بکەین و سەرسوڕێنە کە لێکچوونی زۆری نێوان کۆنستابڵ و ۆردزۆرس بەر لەمانە جێگەی سەرنج نەبووە ، چونکە هەردوکیان هاوکاتی یەك بوون و ئەوکارەی کە یەکیٚ لەو دووە ئەنجامیان داوە کەم و زۆر هەروەکو ئەوە بووە کە ئەو ی تریان کردویەتی ، هەردوکیان هونەری خۆیان لە دەستوری لاسایی کەرانە و وەرگرتن ڕزگار کردووە و گەڕاونەتەوە سەر نوکاتی سروشتی و کارەکانی خۆیان لەسەر بناغەی چنگ خستنی دیدەیی ئەم نوکاتانە

بەیان کردووە و هەردوکیان لە بواری خۆیان دا هەڵگەڕانەوە و ڕاپەڕینیان بەرپا کردووە .
لە داوەری دا هەردوو کۆنستابڵ و وۆردزۆرس دیمەنی سروشتی ئینگلتەرەیان بە هێزێکی وەها بەیان کردووە کە بێ نمونەن ... وە من لەو باوەڕەدام کە ئەگەر کتێبێك لە شیعرەکانی وۆردزورس و تابلۆکانی کۆنستابڵ ببینین هیچ شتێ لە بەیانی جوانیی سەرزەمینی ئینگلستان هاوتای نابێت .

ڕەوتی گەشەی هونەری ئەوروپا لە سەردەمی کۆنستابل بە دواوە ، هەرچەندە بەر لەویش سرۆشی لە هونەرمەندانی دی وەرگرتووە — لەڕوویەکی گرنگەوە داکەوتوی ڕێبازی کۆنستابڵە .

کۆنستابڵ بە بناغەیەکی تایبەت زۆر گرنگیی دەدا ، ئەمیش لەسەردەمی ئەودا بە " قەبارە ناسی " ناو دەبرا کە بەواتای خودی ئەو یەعنی " گیان و زەمینەی هونەر "

لە جێگەیەکی تردا کۆنستابڵ هەمان مانا وەها ڕوون دەکاتەوە : " توانایەك کە ئاتمۆسفار بەدی دەهێنێت " ئێمە ئەوە لەهەر جێگە و لەهەر کاتێکدا لە سروشت دا دەبینین : دژایەتی — یەکبون — ڕۆشنایی — تاریکی — پێچەوانە بوون — شکانەوە ، گشت ئەمانە لەبەدیهێنانی ئەوەدا هاوبەشن " " و کۆنستابڵ هێندە بە گرنگیی ئەم باسە باوەڕی هەبوو کە نەك تەنها لەوێنەکێشێکی "ناسروشتی " وەك بۆشێ = Boucher نەفرەتی دەکرد " بەڵکو لە چینییەکایش هەم بێزار بوو کە بەواتای ئەو " دوو هەزار ساڵە وێنە دەکێشن و هێشتا تێنەگەیشتون کە شتێ بەناوی قەبارە — بوونی هەیە . "

ئێستاکە زیاتر ئاشناین بە هونەری ڕۆژهەلاَتەوە و زیاتر و زیاتر ئاڕاستەی سنورداریێتی دیدگای کۆنستابڵ دەبین .

نەبوونی قەبارە لە وێنەکێشانی چینی دا لەبەر هۆکاری ناتوانایی و دواکەوتوییەوە نییە، بەڵکو لەبەر ئەم هۆکارەیە کە هونەرمەندی چینی لەپەی بردنی خۆیدا بۆ سروشت ئەم چۆنێتییە ئاتمۆسفارییە تایبەتە تێبینی ناکات .

وێنەکێشی چینی لەبری ڕۆشنایی و سێبەر کێش = ریتم – وێنەیی دەبینێت و بە ڕوانگەی ئەو ئەم لایەنە بنچینەیی ترە لە لەمپەر دانان و گۆڕانێ کە بە پەرش بوونی ڕۆشنایی خۆر بەدی دێن .

وێنەکێشی چینی لە ڕاستی دا باوەڕی بەلایەنی بنچینەیی و نەگۆڕە ، وە لەهەمان دیدگایەوە کە پێویست دەکات ئێمە سەرنج لە هەندێ لەو گۆڕانکارییانەی دوایی هونەر بدەین کە لەسەر بناغەی کۆنستابڵ دەربارەی هونەر و سروشت تاڕادەیەك لە دژایەتی دان، خودی کۆنستابڵ گوتویەتی " زەوقی یا مەیلی ڕاستەقینە هەرگیز نیوەی مەیل نییە."

## 70 – دیلا کروا = 1798–1863

Delacroix Eugene

بە دوای کۆنستابڵ دا سەرە بەر دیلاکروا دەکەوێت ( وینەی 50)ئەمەش ڕاگوێزێکی سروشتییە بە تێپەڕینی کات ، ئەم هونەرمەندە زیاتر لەهاوچەرخانی خۆی نمایندەی سەردەمی خۆیەتی و گرنگیی دیلاکروا زیاترە لە شاتوبریان یا ڤیکتور هوگۆ .

تەنها بلیمەتی کە شایەنی هاوشانی کردنە بەم بایرون – ە کە دیلاکروا زۆر بەو کارتێکەر بوو و لەهەمان کاتیش دا لە ڕوانگەی قوڵبونەوە و تواناندا لەو تێ دەپەڕی . بلیمەتی دیلاکروا دەکرێ بەگشتی ناوبرێت و ناونیشانی " ڕۆمانتیك " پاش چاوپۆشی کردن بۆ پێناسەی ئەو سنوردار ڕەچاو دەکرێت ، مەگەر ڕێگەیەکی دی بگرینە بەر بۆ پێناسەی " ڕۆمانتیزمی " بەسەرداچونەوەیەکی تر بگرینە بەر .

ئۆژین دیلاکروا لە 1798 هاتە ژیانەوە و ئێستا ئاشکرایە کە ئەو کوڕی ناشەرعی تالیران = **Talleyrand** – بووە ، تەنانەت لە سەردەمی منداڵیدا ژیانی گەلێ سەیری ژیاندووە ، چونکە چەندین جار ڕێکەوتووە کە زۆری نەمابووبسوتێ ، بخنکێ ، زەهر خوارد بێ ، یا خۆی هەڵواسێ .

دیلاكروا پلەی خوێندنی باشی هەبوو و بڕیـار بـوو لـە وەزارەتـی دەرەوەدا بكەوێتـەوە سەركار بەڵام سروشتی هونەرمەندانەی ئەو بەزوویی ڕەنگی داكوتـا و وا ڕەچـاو دەكـرا كـە ئەو بۆ بوون بە وێنەكێش یا مۆسیقا ژەن یا بە شاعیربوون بەیەك ئەندازە " ئامادەیی تیایە و لـە كـۆی ئـەم هونەرانـە دا هەسـتیارییەكی بـەهێزی نیـشان دەدا " بـەڵام لـە زەمینـەی وێنەكێشان دا زیاتر دەیتوانی بـەیانی ئـەوەی لـە ویژدانداـیە واڵا بكـات . دیلاكـروا لـەڕووی ئەندامییەوە زۆر لاواز بوو ، دەیتوانی تەنها یەك ژەم خۆراك هەرس بكات ، سنگیـشی هـەم نەخۆش بوو ... بەڵام توانای گیـانیی بـێ پایـان بـوو و هـەمان توانـاش بـوو كـە لەشـێكی زەلیلی بۆ ماوەی شەست و پێنج ساڵ لەسەر پێ ڕاگرت .

شێوە و باری دیلاكروا زۆر سەرنج ڕاكێش بوو و پێناسـەی ناسـراو دەربـارەی بـوونی هەیە ... تیوفیل گوتێ = Theophile Gautier كە بۆ یەكەم جار لە سـاڵی 1830 دا ئـەوی بینیوە لە ڕەنگی پەڕیوی زەیتونی و پرچـی ڕەش و چـاوی گوربـە شـێوەی و ترسـناكی و ئـەبرۆی تێكـچڕاوو لێـوی ناسـكی لەسـەر دانـە بـەرزەكانی نـاودەمی كـەمێ بـەرەو دوا پاشەكشەی كردبو و دەربارەی چەناگەی بەهێزی دەدوێت " بەكورتی دەربارەی " جـوانی كێوییانە و سەرسوڕێنو نامۆو تەنانەت بێزاركەرانەی ئەو " دەدوێت .

بۆدلێر ڕەوشتی ئەو بە " تێكەڵێ لە نامۆیی و گومانكاری ، بە ئـەدەب و سـەر زارەكـی — گەرمی و زیرەكی خۆویستانە و لە دواییدا جۆری تایبەت لە میهرەبانی و هاوگونجاوی كە هەمیشە هاوەڵی كەسی بلیمەتە " پێناسە دەكات .

لەهەمان كاتدا بودلێر دەڵێت كـە دیلاكـروا پیـاوێكی ڕۆشـنبیری سـادە بـوو ، پیـاوێكی بەمانای وشە تەواو بوو كە هیچ جۆرە نیاز و ڕەگەزپەرسـتییەكی تیـا نـەبوو و لـەم ڕووەوە بە پروسپی مێرمی = Prosper Merimee شایانی لێكچواندن بوو — هـەمان شـێوەی وشـك و كەمێ ماندوو بوو ، هەمان ڕوپۆشی سارد كە هەستیاری شەرمنانە و عەشقی بەهێزی ئەوی بۆ چاكەو جوانی دادەپۆشی ... یەكێ لە ڕەفتارە بنچینەییەكانی دیلاكروا ئەمە بـوو وەكـو

زۆربەی کەسانی بلیمەت ، بلیمەتی خۆی دادەپۆشی تاوەکو کاتێکی کەم بۆ خۆی بەدی بهێنێ .

دیلاکروا زۆر سەفەری دەکرد ، هەرچەندە زیاتر لە ئیتالیا دەمایەوە . هەستی دەکرد کە بلیمەتی خۆی هێندە جیاوازە بە ئوستاندانی ئیتالی کە ئەگەر بێت و ڕووبەڕوویان بێتەوە ئەوا خۆی دەدۆڕێنێ .

بلیمەتی ئەو لەبنچینەدا باکوری ( نوردی ) بوو ، لەساڵی 1825 دا سەفەری کرد بۆ ئینگلتەرا و زۆر بەمەیلەوە لایەنگری ئینگلتەرە بوو . لە ڕاستی دا چوار کەسی ئینگلیزی کاریگەرییان لەسەر دیلاکروا بەهێزە ، واتە شکسپیر و بایرۆن و کۆنستابڵ و بونینگتن = Bonington — ئەمانە کاریان کردۆتە سەر یەکەی ژیانی .

دیلاکروا لای شکسپیر و بایرۆن جۆرە خەیاڵێکی ئافەریدەی دەدی کە بەهرەدەری ڕاستەقینەی ئەو بوون ... لە ڕوانگەیدا کۆنستابڵ و بونینگتن وێنەکێشانی بوون کە پیشەکەیانی لەپێناوی بەیانکردنی خەیاڵەکانی دا پێویست بوو.

دیلاکروا بەڕوویەکی گشتی مەکتەبی ئینگلیزی پایەدار دەکرد و نەیدەتوانی بێ گرنگی بێت دەرهەق هونەرمەندانی فەڕەنسی وەك ڕینۆلدز — گینزبارۆ — هوگارت — و تەنانەت وێنەکێشانی بچکۆلەی وەك ڤیلکی = Wilkie و ئێتیٚ Etty و هایدۆن = Haydon .

خودی دیلاکروا لە بەرهەمەکانی ئەم وێنەکێشانەدا نوکاتێکی دەبینی کە بەلایەوە شایەنی دوبارەکردنەوە و ستایش بوون .

دوو سەفەریتر زۆر کاریان کردۆتە سەر دیلاکروا ، لە ساڵی 1832 بۆ مەغریب و پاشان ئیسپانیا و لە ساڵی 1838 بۆ بەلجیکا و هۆڵەندە چوو . لەسەفەری دا بۆ باشور هەستێکی تایبەتی بۆ ڕەنگەکان خستە گەڕ و لە باکور ڕووبەڕوی بلیمەتی ڕۆبنس بووەوە و لە ئەنجامدا ئەوی بە مامۆستای ڕاستەقینەی خۆی ناسی" چونکە تەنها لە بەهێزی و چڕی هەستەکانی ئەم هۆڵندییەدا بوو کە دیلاکروا نمونەی توانامەندی گیانیی بەفراوانی لە خۆیدا دەبینی .

له بیست و سیٚ ساڵی دا دیلاکروا وێنەی خۆی له شێوەی هاملێت دا کێشا ، له بیستو چوار ساڵی دا دەستی کرد به یاداشت نووسینی یادەکانی و دەفتەری یاداشتەکانی بەڵگە نامەیەکی گەلیٚ بەسودن .

نەك تەنها دان پیادانانەکانی که لەرووی راستگۆیی و دوپات کردنەوەی کەسێتییەوە بەرامبەرن به دان پیادانەکانی رۆسۆ، بەڵکو وتەکانی چاوگێکن کە بەشێك لە قوڵترین تیۆری رەخنەگرانەن له بواری وێنەکێشان و ئەدەبیاتدا که تاوەکو ئێستا بڵاوکراوەتەوە .

بۆدلێر بەربڵاویی ئاوێزان بوونی دیلاکروا به یەکەم خاسییەتی ئەو دەزانێت و دەڵێت:— دیلاکروا نەك تەنها وێنەکێشیٚ بوو کە عەشقی دەدا به هونەری خۆی ، بەڵکو پیاویٚ بوو خاوەن پلەی زانستی و زانیاری گشتی — پێچەوانەی کۆی وێنەکێشان که زۆربەیان بێجگە له وێنەکێش شتێکی دی نەبوون ، واته لەوەزیاتر نەبوون که چەند لەشێکی تایبەتمەندی پیر و لاوی بیٚ چاره بوون ، یان کارکەری ساده بوون که هەندێکیان شێوەی یا پۆرترێتی خەڵکیان دەکێشا و هەندێکی تریان وێنەی میوەکان و هەندێکی دییان لەشی گیانەوەران .

دیلاکروا هەموو شتێکی خۆش دەویست و دەیتوانی وێنەی هەموو شتیٚ بکێشیٚ و هزری خۆی له بەرامبەری هەر جۆره کارتێکەرێکدا بەکار دەبرد ... بەڵام لە فەلسەفەو رەخنەگەری دا که له دەفتەری یاداشتەکانی دا دیاره دولایەنی خۆی روون دەکاتەوە ، چونکه لەم یاداشتانەیدا ستایشەکانی خۆی پەخشان و نەزم و هزری رۆشنی خۆی دەردەبڕی — لەیەك واتا ویست بەکلاسیزم دەسپێریٚ . بودلێر ئەمە بەخاسیەتی کۆی هونەرمەندانی مەزن دەزانێت ... دەڵێت که ئەم جۆره هونەرمەندانه بەناونیشانی رەخنەگر خۆیان ناچار دەبینن راسته و راست هەمان چۆنێتی شیبکەنەوە و ستایشی بکەن کە بۆ داهێنانەکانیان زۆر پێویستیان پێیەتی و زۆر دژی ئەو شتەیشه کە لەخودا بەرادەیەکی بەربڵاو بوونی هەیە.

ئەم تێبینیانە نیشانی دەدەن کە ئاوێزان بوون و پیادا چەسپان بەرێبازی وەك رۆمانتیك و کلاسیك دا بە ئامادەیی کەسێکی وەك دیلاکروا تاچی رادەیەك دژواره ...

چونکە بلیمەتی بەهەر ئەندازەیەك پـشت بەسـتوبێ بـە تایبەتمەنـدێتی ئەنـدامی و سـۆزیی یەکی لەم مەکتەبانەوە " پێویستە تەقەلای بێت کە لایەنـە عەقلآنییـەکانی ئـەو مەکتەبـەی دی لەتەك خۆیدا بەدی بهێنێ .

دیلاکروا یەکێ بـوو لـە چـالاکترین وێنەکێشەکان ، بـەلآم لەگۆشـەگیری دا و تەنانـەت بەدزییەوە کاری دەکرد ، توانایەکی بەربلآوی بۆ کارکردن هەبوو ، پاش ئەوەی کە تەواوی ڕۆژی لە کارگەکەیدا بەسەر دەبرد – یا لەسەر وێنەی دیواری کـاری دەکـرد کـە ڕادەیـەکی زیاتری لە کاتی دەگرت – جارێکی تر لەشەودا دەکەوتەوە وێنەکێشان .

بۆدلێر دەڵێت :– ئەگـەر دیلاکـراو شـەوانە بـەدیار وەجاخـەوە دانەنیـشتایە و لـە ژێـر تیشکی چرادا سەرگەرمی نەخش و ڕەشکردنەوەی کاغەز نەبوایە و نەخـشە وخەیاڵـەکان و بوارەکانی ژیانی خۆی یاداشت نەکردایە " ئەوا سەرگەرمی کارەکانی کۆی هونەرمەندان بوو تەنانـەت ئەوانـەیش کـە بـە میـزاج و خـوی ئـەو گـەلێ نـامۆ بـوون و ئـەو ڕۆژە خـۆی بەکەمتەرخەم دەزانی ... کاتێکیش دەچووە دیـدەنی هاوڕێکـانی سـەرگەرمی وێنەکێـشان دەبوو .

بۆدلێر دان بەوەدا دەنێت کـە " ڕاسـتی ئەمەیـە کـە لـە دوادوای سـاڵەکانی تەمـەنی دا دیلاکـروا ئـەوەی نـاوی لـەززەت بـردن بـێ لـە ژیـان دا لێـی ڕووت بـووەوە و لـە جێگەیـدا عەشقێکی بەهێز و کوشندە ترسێنەر دابین بوو ، وە ئەو کارە بوو کە چیی دی نەدەکرا بە عەشق ناو ببرێت ، چونکە بە واتایەکی چـاتر تـەنها زەجـر بـوو . " دیلاکـروا بەخرۆشـەوە وێنەی دەکێشا ، لەسەرنجی هزربینانـەی داڤیـدو ئانگـەر نـەفرەتی دەهـات ... یـەکێ لـە وتـەکانی ئەمـە بـوو کـە دەیگـوت " ڕۆمـایی ڕاسـتەقینە لـە ڕۆمـادا نـەماوە . " کـاتێ کـە دەیویـست بابـەتێ وێنەبکێـشێ کـۆی ئامادەکـاری پێویـستی بـە وریـایی بـەدی دەهێنـا و لەوانەبوو کۆمەڵێ مەشقی زۆری ئەنجام بدایـە بـەر لـە دەسـت پـێ کـردن ... بـەلآم کـاتێ سەرەی دەگەیی یە سەر تابلۆ سەرەکییەکە کۆی مەشـق و پێـشکردەکانی وەلاوە دەنـا و بە واتای خۆی بە خەیاڵەکانی وێنەی دەکێشا ...

له دەفتەری یاداشتەکانی دا خاڵی گەلێ بەسود هەن کە دەربارەی شێوەی کاری دەدوێت ، هەرچەندە کە ئەم پارچەیە کەمێ درێژە ، بەڵام خۆم ناچار دەبینم و بە پێویستی دەزانم بیخەمە بەر چاو .

" کاتێ کە بابەتێك لەسەر خەیاڵی خۆم دوبارە وێنە دەکێشمەوە، ئەم بەسەرهاتە ئایدیالییەی دروست کردنی بابەتەکان کەم و زۆر لە ڕوانگەمدا شاراوە دەمێنێتەوە ... ئەم بەسەر هاتەی دووەم هەمیشە بە ئایدیایەکی پێویست پێوانە دەکرێ و چاك دەکرێت " بەم شێوەیە شتێ دێتە پێش کە بەڕوکەش دژوار و ناجۆر وەڕو دەکەوێت ، بەڵام لە ڕاستی دا ڕوونی دەکاتەوە کە چی جۆرە بەدی هێنانێ لەگەڵ هەندەکییە بەربڵاوەکان دا وەك بەدیهێنانەکانی ڕۆبنس بۆ نمونە ، ناتوانن لەکاری خەیاڵ ئامێزدا بەشداری بکەن . ئەم بەدی هێنانە لەسەر بنچینەی مایەیەکی تەواو ئایدیالی بوو پایەدارە " کۆی هەندەکییەکانی کە بە یاریدەی کەم و کوڕی یاد هێنانەوە وە هاوبەشی کارەکە دەبێت یان تێکەڵ بەکار دەبێت ناتوانێ ون کەری ئەو سادەیی یە بێت کە بەهایەکی تەواو جیاوازی هەیە و لەهەمان سەرەتادا لە بەیانی بیرکردنەوەوە بەدەست هاتووە " هەروەك دەربارەی ڕۆبنس بینیمان " ئازادانە لە بەدی هێنانی کاری بەزۆردا دژواری یەکی بەدی هاتوو لەزۆریی هەندەکی یەکان دەکات . " = ( واتە زۆر بەسەرنجەوە بەوردەکاری یەوە خەریك دەبوو . وەك )

لای دیلاکروا ڕەنگ ڕەگەزێکی ژیانەکی بوو و لە وانەیە بەر لەو تەنها ڕۆبنس و دوای ئەو تەنها مایتس رەنگیان بەهەمان ڕێگەی ڕاست بەکاربردبێت — واتە نەك بەشێوەی زەمینەیی کە بیرەکان ڕاستەوخۆ و ناچار دەگوێزرێنەوە سەری ، بەڵکو بەشێوەی چالاکییەکی غەریزانە کە هاوڕای ڕەوتی بیرکردنەوەیە . ئەم جیاوازییە دەشێت کەمێ تەسك بیرانە بەرچاو بکەوێت ، بەڵام لەوانەیە شایەنی پێوانە کردن بێت بە جیاوازیی نێوان پێکهێنەکانی وێنەیی ئاوازەکان و داهێنانی خەیاڵی ئاوازەکان لە مۆسیقادا ... بەم گریمانەیەی کە ئەو مۆسیقا ژەنەی بەتوانای خەیاڵ ئاواز دەژەنێت سەرەتا بە مەشقی

وێنەیی سەخت و داڕێژراو دەكاتە ڕابەری خۆی ... لێكچواندنی مۆسیقا دەربارەی دیلاكروا دەشێت ، چونكەدیلاكروا زۆر مەیلداری مۆسیقا بوو و هەمیشە دەربارەی ڕەنگەكانی خۆی جۆرێك دەدوا گوایە نیاز مەندبێ لەسەر بناغەی ڕەنگەكان مۆسیقای یا ئاوازی دادەنا .

دیلاكروا لە ڕەنگكاری دا بارێكی گەورەتری لە كۆنستابل لە ئەستۆدا بوو ، هـەمان ئـەو ڕێبازانەی كە كۆنستابڵ بۆ شیكردنەوەی سروشت بەكاری دەبردن ، دیلاكـروا لـە پێكهـاتی بەدیهێنانە خەیاڵیەكانی دا بەكاری دەبرد — ئەو حەزی دەكرد بڵێت كە سروشت هەروەكو فەرهەنگێ وایە " ئێمە بـۆ چـنگ خـستنی فلأنـە " تـۆن" ی ڕاسـت و بـۆ هـەمان شـێوەی تایبەت پەنا دەبەینە بەر سروشت هەروەك چۆن بۆ پەیداكردنی مانای وشەیەكی ڕاست یـا ئیملای وشەیەك یا رەگی وشەیەك بۆ فەرهەنگ — پەنا دەبەین " بەلأم فەرهەنگ لای ئێمـە بەرهەمێكی ئەدەبیی بالاَ نییە تا پێویست بكات بیكەینە جێ مەشقی خۆمـان ... هـەروەها سروشت بەهەمان پێوانە نابێت نمونەی جێ مەشقی وێنەكێش بێت .وێنەكێش بۆ سرۆشـی وەرگـرتن وە دوی سروشـت دەكـەوێ و سـۆراغی دەكـات و بەتایبـەتی بـۆ پەیـداكردنی " نۆتەی ڕەسەن" بەلأم ئاوازێ كە لەپای ئەو تۆنەدا بەدی دێ دروست كراوی خودی ئـەوە و بەس .

لە پێوانەدا بە كۆنستابڵ كە ڕەنگەكانی ڕەنگـی دەمـەو بـەیانیانین وێنـەكانی دیلاكـروا تێرو تاریكن ، تێپەڕینی سەردەمیش سەری خۆشەویستیی لەگەڵ تابلۆكانی ئـەودا نییـە و مـرۆڤ لـە تابلۆكـانی دا جـۆرە تێرییـەك دەبینـێ كـە دەشـێ لـە بنـچینەدا جـێ مەبەسـتی هونەرمەند نەبووبێت ، بەلأم لەهەمان ئامێزی تێـر و تاریكـدا ڕەنگـە ڕۆشـنەكان بەتایبـەتی سور و شین وێنەی گەوهەر دەدرەوشێنەوە . نابێ ڕەنگەكانی دیلاكروا بە هیچ پێودانگێكی پێشینە پێوانە بكرێن ئەگەرچی پێودانگ سروشتی یاجۆرێكی دی ، بەڵكو ڕەنگـەكانی ئـەو پێویست دەكات بە ناونیشانی ڕەنگدانەوەیەكی دیدەیی خودی پەسەند بكـرێن ... چـونكە ڕەنگەكانی هارمۆنییەكی تایبەت شك دەبـەن كـە توانـا و چـرپی خـەیاڵی بـەدی هێنـەریان ئاراستەی كردون .

بەرهەمەکانی دیلاکروا بۆ سێ یا چوار دەستەی دیاری کراو دابەش دەبێت یەکێ لەو بەشانە پۆرترێتەکانێتی کە لەڕوانگەی درکاندنی دەروونزانی دا سەر سوڕێنن و زۆر جار لە کاریکاتۆرەوە نزیك دەبنەوە... ( وێنەی پۆرترێتی پاگانینی = Paganini وجۆرج ساند = Georges Sand ) "ئەوانەی تر تابلۆ مێژوویی یەکانن ، جۆرە بەرهەمێکن بە دەربڕینی مەزنو نیشان دەری شکۆن ، کە دیلاکروا ئەو بەرهەمانەی لەسەر نووسراوە ڕۆمانسییەکان — کە زۆر پێوەیان دڵبەند بوو — وێنەکێشاوە ، سێ یەم چەند بەرهەمێکی دیمەن سازین کە ناوەرۆکیان زیاتر هۆنراوەییە و غەلیاتی پەتین " لەئەنجامدا دەستەی چوارەم کە زیاتر لەوانیتر نمایندەی کاری دیلاکروان — لەم تابلۆیانەدا زۆرجار دووگیاندار کێشەدا دەبینین ، یان ئەگەر دوو گیاندار نەبن ئەوا گیاندار و مرۆڤە یا مرۆڤ و فریشتە یان مرۆڤ لەکێشەیدا لەگەڵ مرۆڤ دا دەبینرێت .

گومانی تیادا نییە کە دیلاکروا ( هۆشیارانە — یان ناهۆشیارانە جیاوازی ناکات ) بەم شێوەیە دژایەتییەکی دەروونی پێچەوانەی جیهانی دەرەوە دەکات — دژایەتییەك کە بەواتایەکی سادە دەشێ بە قارەمانێتی هەزرو خەیاڵ ڕەچاو بکرێت یان دەربڕدرێت کە دیلاکروا بناغەی بەدیهێنانە هونەرییەکانی لەوێوە بەکار دەردەبڕی .

## 71 – ئیمپریسیونیستەکان –

کارتێکەری کۆنستابڵ لە گۆڕانی گشتیی وێنەکێشانی ئەوروپادا بە دیلاکروا کۆتایی نایەت ، چونکە ڕاستەوخۆ بەدوای ئەمدا ئێدوارد مانێ = Edouard Manet سەری هەڵدا " ئەو ڕاپەڕینەی کە لەپێناوی ئاسانکاری کردنی چۆنێتی وێنەکێشان بەرپا بوو پەیوەندە بەناوی مانێ — وە و یەکێکە لە پڕهێزترین و تەواو ترین ڕاپەڕین لە مێژووی هونەردا ، نەك تەنها لەوێنەکێشان دا بەڵکو لە کۆی چالاکییەکانی مرۆڤایەتی دا ، مانێ تەنها خاڵێکە لەڕاستی دا کە تیایدا بەسەر هاتێ ڕوو ئەدا و لەپڕ دەگاتە ئەوپەڕی باڵایی لەخۆیدا .

ئەگەر بمانەوێ مرۆڤێك زیاتر لەوانی تر بناسین كە گۆڕانكاری گەورەیان لە ژیانی خۆیان دا بەدیهێناوە " ئەو كەسە هەمان كەسی ئینگلیزی شێتخوازە كە لەناكاو لە ستودیۆی كار دەرپەڕی و بە نێو بە فر و باران دا ملی نا ( وێنە 49) ... ( ئەم گۆڕانكارییە لە ژیانی خودی مانێ دا پەیوەندە بە ژیانی ئێمەوە ، چونكە لەو ئاستەوە جیهانی بە پرتەوی ڕۆشنایی یەكی دی بۆ ئێمە نواند ) ... بەلأم كۆنستابڵ كەسێكی ڕاپەڕین خوازی بەئاگا نەبوو ، بەڵكو كەسێ بوو لەجۆری كەسانی خۆگریمان كەر و سەرسەخت كە هەستیارییە تازەكانی لە خۆی دا سۆراغ دەكرد و بەبێ ئەوەی خۆی پێ بزانێت جیهانی دەگۆڕی .

كۆنستابڵ لە دڵ سادەیی دا لە هنری ڕۆسۆ = Henri Rousseau — دەچوو هەرچەندە لە شارەزاییدا گەلێ زیاتر لەو بە تواناتر بوو .

مانێ بەهیچ شێوەیەك دڵ سادە نەبوو لە خودێتی و ئاگایی پیشەكەیدا لە كۆنستابڵ كەمتر نەبوو ، بەلأم ئەو ڕیالیزمەی كە كۆنستابڵ بە یاریدەی تۆژینەوەی دیدەیی سروشتی بینراوە وە پێی گەیی لای مانێ بووە ئایدیایەكی زەینی .

مانێ لە هەمان سەردەمی لاوییدا ڕایگەیاند كە نیازمەندە ئەوە وێنە بكێشێ كە دەیبینێ نەك ئەوەی كە ئەوانی تر دەیبینن یا حەز دەكەن بیبینن .

بەزوویی ئاڕاستەی ئەم مەسەلەیە بوو كە مەسەلەكە هونەرییە و دەست و برد دەستی دایە تۆژینەوەی چڕو بە كۆسپ دەربارەی شێوەی كاری ئوستادان و ئەو نیشانانەی كە بەدوایدا دەگەڕا و لە خۆیدا مەبەستی بوو بەكاریان بەرێت بەر لەهەر جێگەیەكی تر لە ئیسپانیا چنگی خست — لەبەرهەمەكانی گۆیا و ڤلاسكۆس.

دەشێ كورتەی نیازی شێوازی ئیمپریسیونیست ئەمەبێت كە بڵێین ئیمپریسیونیستەكان مەنشورێكیان لە بەرامبەری سروشت دا دانا .

لەسەردەمی لێوناردۆ وە شێوازێك لە ئەوروپادا پێی گرتبوو لەسەر ئەم بنامەیەی كە تەنی یا لەشی شتێ یان قوڵییەك یا چۆنێتی سێ دووری ئەو تەنە بەپلەی جیاوازی سێبەر

و ڕوناكی نیشان بدەن — یا بە واتای ڕەش بەیاریدەی ڕێژە جیاوازەكانی ڕەنگی ڕەش ...
بەم شێوەیەش وێنەكێشان چیی دی كۆپی كردنەوەی سروشت نەبوو ، بەڵكو فێڵێ بوو كە بەیاریدەیەوە شێوەی گشتیی سروشتیان وەڕو خست .

بەدیهێنانەكانی وێنەكێشێكی باڕۆك — ی وەك كاراڤاجیو = Caravaggio — لەڕاستی دا لە هەر ڕوویەكەوە لە بەدی هێنانەكانی — وێنەكێشێكی كۆبیستی دەچێت كە هەمان كۆیلەیی ئاسا بوو " تەنها ڕووی جیاوازی مەسەلەكە لەمەدایە كە كاراڤاجیو دەیەوێ كارێكی دینامیكی تر لە ڕاستەقینە نیشان بدات و وێنەكێشی كۆبیست دەیەوێت ئیستاتیكی تر لە ڕاستەقینەمان نیشان بدات " یەكەمیان توندوتیژی دەكا و دووەمیان ئەبستراكت دەنوێنێ .

ئیمپریسیونیزم لە ئاڕاستەیەكی ئێستایی دا دەبزوا ، هەرچەندە كە مانێ مەیلی نەبوو وەها بیر بكاتەوە ، دەیگوت " توێكاری كردن تاوانە " و مرۆڤ ناتوانێ بەبێ ڕاوەستاندنی شتەكان بكەوێتە یا بپرژێتە سەر توێكاری و ورد كردنەوە.

هەستیاری خودی مانێ بەڕادەیەك مرۆڤانە بوو كە هەرگیز ئامادە نەبوو مرۆڤ خوازی بابەتەكانی خۆی فیدای ڕیالیزمی ڕوكەش بكات — كەچی گەیی یە ئەمەی هەستیارییەكانی فیدای دابێكی زانستی بكات ... بەلأم ئەم ویست و مەیلدارێتییە لە بەرهەمی هەندێ لە پەیڕەوانی ئەودا هێندە ئاشكرا نییە .

لە شێوازی خاڵ چنین = Pointillism — ی جۆرج پێرسورا = George Pierre Seurat پۆل سیناك = Poul Signac — دا پەیڕەوی زانستی گەیی یە ڕادەی زیاڕۆیی كردن ... ئەم دوو هونەرمەندە مەسەلەی ڕەنگ و ڕۆشناییان بەڕوویەكی تەواو زانستی تۆژییەوە .

ڕەنگەكانی خۆیان بەهەمان ڕەنگە هەووەڵییەكانی مەنشور سنوردار كرد و شوێنەواری سێبەر و روناكی و رەنگە ناوەندی یەكان ( ئەو ڕەنگانەی لە تێكەڵی ڕەنگە سەرەكییەكان بەدی دێن "وەك " ) لە ڕێگەی لەتەك یەك چنینیان بەخاڵ یا نوكتە لە ڕەنگی سەرەتایی یەكانەوە چنگ خست .

مانێ نیشانی دابوو کە بە بەکاربردنی ڕەنگی پاراو چی ئـەنجامێ دەشـێ بـەدی بێـت "
بەلاّم سورا و هاوقۆناغەکانی پاش ئیمپریسیونیـست — ی ئـەو بـوون کـە ڕەنگـەکانیان بـۆ
پێناسەکردین و مانا و گرنگیی تـەواوی ڕەنگـەکانیان نیـشانی ئێمـەدا و وێنەکێـشانی سـێ
سەدەی ڕابردومانیان لە پێش چاومان دا تاریك و تالّ خستە ڕوو .

بەلاّم سورا و سیناك لەبەر ئەو مەیل و خرۆشەی هەیان بوو گەیین بە زیـادە ڕۆیـی یـان
پێوەنان " هێندە لە ڕەوتی زانستی خۆیان دا قالّ بوونەوە کە لەیادیان چوو بەهەر حـالّ
هونەر مەسەلەیەکی هونەرییە — مەبەستم لە مەسەلەی هونـەری ئەمەیـە کـە هـەر زنجـیرە
یاسایەك کە هونەرمەند لەپێناوی گواستنەوەی کاریگەری تاکانەی خۆیدا لە ناوەڕۆکەوە بۆ
دەرەوەی خۆی بەدی دەهێنێ ( واتە بۆ بەیانی دیدەیی هەستیارییە تایبەتییەکانی خۆی )
بەهەرحالّ ئەنجامی کۆتایی کارەکەی پێویستە کێشێکی سـەر بـەخودی هونەرمەنـدی تیـا
بێت بەڕوویەکی ڕاستەوخۆ .

هونەرمەند نابێت چاوەڕوان بێت کە بینەری کارەکانی وەهـا داوەری بکـەن کـە لەسـەر
بناغەی ڕادەو جۆری ئەرکێ بێ کە ئەو لەو بەرهەمەدا خستویە کار .

گەلێ لە تابلۆکانی دوای ئیمپریسیونیـستی لـە شـوژنکاری یـان عـاجی چـینی دەچـن و
نـاتوانین بـەبێ دلگیری یـا زویـری سـەرنجیان لێ بـدەین ، چـونکە نـاتوانین لـە بیرمـان دا
ناتوانین ئازاری شوژن چن ( واتە ئازاری چاوی) یان تاقەتی نا مرۆڤانـەی عـاج هـەلّکۆلّ —
بێ شوێنەوار بکەین .

پاولّ ڤالیری = Paul Valery — لە یەکێ لە وتە کورتەکانی دا لە چییەتی نادیاری وێنـە
کێشان دەدوێت و دەلّێت : ئەگەر نیازی وێنەکێشان ئەمە بوایە کـە وێنـەی جیهـانی بینـراو
بخاتە ڕوو یان لە دابەشکردنی هارمۆنیی ڕەنگەکان وشـکلّەکان دا کاربکـات کـە چـاو و بـیر
خۆشان بکات ، کارەکە تاڕادەیەك ئاسـان دەبـوو . بـەلاّم ئـەنجامی کـاری وێنەکێـشان لـە
ڕاستی دا گەلێ لەمە ئالۆزترە ... چونکە لەهەر تابلۆیەکی گەورەدا ڕووبـەڕووی دەزگایـەکی
تەواو لە بەهاکان دەبینەوە ، کە هەندێکیان زانستی و هەندێکیان وێنەیی و هەندێکی دییان

مانەوییــە . " وێنــەکێش کۆمــەڵێك لــە مــەیل و نیازەکــان و مەرجایەتییــەکان ، کــە لــە چوارچێوەی هزری خۆیدا بەدی و پەی پێ بردووە ، لە زەمینەیەکی ماددی دا ڕێك دەخـاو پێکیان دەهێنێت .

ساتێك دەربارەی مۆدێلەکەی تێ دەفکرێ ، سـاتێك دەربـارەی ڕەنگـەکان و مەڵحەمـە ڕۆنییــەکانی و تۆنــەکانی " سـاتێك دەربـارەی گۆشـت و لەشـی مۆدێـل تـێ دەفکرێـت " ساتێکیش دەربارەی ئـەو تابلۆیـەی کـە پێویـستە ڕەنگـەکان و شـکڵ و تۆنـەکانی لەسـەر دابنێت .

بەڵام کۆی ئەم ئاڕاسـتانە سـەربەخۆ لـە یـەکتری لـە دابـی وێنەکێـشان دا ناچـارانە بـە یەکترییەوە پەیوەست دەبن و یەك دەگرن، وە کۆی ئەو ساتە جیاوازانە – کە هەندێ جـار پەرەوازەو گاهـ ڕێکخستو و گاهـ تێکەڵاو – گشتیان لە ژێر دەستی وێنەکێش دا دەگـۆڕێن و دەبن بە تابلۆیەکی هونەری ."

لـە ڕێکخـستنی لایەنــەکانی هــەڵاتن لــەژیان و سروشــت ، هــیچ شــتێ وێنــەی تــابلۆ ئیمپریسیونستییەکان یا پاش ئیمپریسیونستەکان ناسك تر لـەبار تـر نییـە ، چـونکە ئـەم وێنانەی ئەوان ڕەنگدانـەوەی تـەواوی لایـەنی غـەزەلی و ڕوخـساری سروشـتە – واتـە ئـەو لایەنەی جوانیی سروشت کە بە گۆڕانی پرتەوی ڕۆشـنایی بـەدی دێـت و نادیـار دەبێـت – وێنەکارییەکانیان شیعرێکی کورتن – بەڵام هێندە بـە پیـت و شـیرین و تـەڕن کـە ناشـێت ڕەچاو کرێت مرۆڤ دەست بەرداریان بێت .

پێشەوایانی وەك سیورا و سینیاك هەمیشە ڕێزیـان پایـەدار دەبێـت " هونەرمەنـد انـی وەك مـانێ و مـۆنێ = Monet – و کامیـل پیـسارۆ = Camille Pissarro – و پێـر بۆنـار= Pierre Bonnard – ( کە تەنها چەند ناوێکی ئیمپریسیونستی ناسـراون ) لەگـەڵ تێپـەڕینی ساڵەکان دا جێگە و ڕێزیان ئاشکراترو پایەدارتر دەبێت .

ئێـستاکە لەمــەش تێگەیـشتوین کـە ئـەم هونەرمەندانـە لەسـنوری غـەزەل و جـوانیی ڕوکەش زیاتر لانادەن و بەسادەیی سەرسوڕاندنی هونەری مەزن ناگات .

## 72– ئەوگست ڕێنوار = Augest Renoir –

بەلأم ڕێنوار بە پایەی ئەم سادەیی یە گەیشت ، هیچ یەکێ لـە هونەرمەنـدانی سـەدەی ڕابـردوو بـە ئەنـدازەی ڕێنـوار لـە بیرکردنـەوەی هۆشـیارانە دا دەربـارەی کـاری خۆیـان دەربەست نەهاتون — تەنانەت لە وشەی هونەرمەند قینـی دەهاتـەوە و حـەزی دەکـرد بـە وێنەکێش ناوی بەرن .

وتەکانی ڕاستگۆیی و شارەزایی ئەو نیـشان دەدەن دەرهـەق پیـشەکەی و دەڵێـت : " ژیـانی خـۆم بەسـەرگەرم کردنـی ڕەنگـدانان لەسـەر تـابلۆ بەسـەردەبەم و لەبـەر ئـەوەی بەسەختی لەو بوارەدا کاردەکەم ژیانم بەزایە نەداوە . "

ئەوگـست ڕێنـوار لـە سـاڵی 1841 لەشـاری لیمـۆژ =Limoges لـە فەڕەنـسا هاتۆتـە ژیانەوە و لە ساڵی 1919 لە کانی = Cagnes کۆچی دوایی کردووە .

ڕێنوار لە خێزانێکی هەژار کەوتوبوەوە و خوێندنی کەمتر فێر بوبوو ، لە دوانزە سـاڵی دا دەستی کرد بە وێنەکێـشان لەسـەر کـەل و پـەلی چـینی " بـە ڕوانگـەی مـن بەشـێ لـەو شێوازەی کە ئەو لەو هەنگاوەدا فێری بوو لـە کـۆی قۆناغـەکانی ڕەوتـی پێـشکەوتنیدا لـە گەڵیدا گۆش بوو ، ئەم شـێوازەش ڕاسـتەوخۆ شـێوازێکی خـودی بـوو " هـیچ وێنەکێـشێك وێنەی ڕێنوار بەبێ ئیمزا بەم تەو ویپە شایەنی ناسینەوە نییە .

بەم حاڵەشەوە ڕێنوار زیاتر لە کـۆی هونەرمەنـدانی مـەزنی سـەردەمی خـۆی پابەنـدی دەستوری دێرین بوو .

دەشێ بە شاگردبوونی لای هونەرمەندانی پیـشەی وێنەکێـشانی چـینی لـە سـەردەمی لاوییدا ئەم بەها هونەرییە پرسەرنجەی دەربارەی کاربردی هونەر فێری ئەو کردبێت .

هەر هونەرێك بە کەمتەرخەمیی توانای مرۆڤ دەگۆڕێت بە ئـەرکێکی دژوار ، ڕاسـتەوخۆ هەمان پیشەی وێنەکێشانی شێوازی چینی لـەپێکهاتی کۆمەڵـەی ڕەنگـەکانی ڕێنـواردا بـێ کاریگـەر نـەبوو " چـونکە کـارکردن بـە ڕەنـگ لەسـەر ڕوویـەکی سـپیی تـەواو چـینی

چۆنێتییەکی بژێو یا زیندو بە ڕەنگەکان دەبەخشێت کە ڕێنوار توانیی هاوشێوەی ئەوە لەسەر ڕووی تابلۆکانی خۆی بەدی بهێنێت .

لەوانەیە بیرەوەری قۆناغی وێنەکێشان لەسەر ڕووی چینی ( و لەسەر باوەشێن — کە ڕێنوار وێنەی لەسەر دەکێشان ماوەیەك ) و تابلۆ دێهاتییەکانی بوشێ و واتۆ قەریحەی ئەویان بەرەو بەدیهێنانی تایبەت لە هونەری سەدەی هەژدەیەمی فەڕەنسادا ڕابەری کردبێت .

ڕێنوار دواهەمین نمایندەی شێوازێکە کە لە ڕۆبنس — ەوە تا واتۆ ڕاستەوخۆ بەردەوام بوو .

بەم شێوەیە ڕێنوار یەکێکە لە ڕابەرانی جیهانی وێنەکێشان " واتە ئەو لەپۆلی سیزان و مانێ و هونەرمەندانی پاش ئیمپریسیونیست دادەنرێت نەك لە ڕیزەی پۆڤی دۆشافان = Puvis de Chavannes و پەیڕەوانی ڕێبازی پێش ڕافائیل و وێنەکێشانی "هونەرگای دەوڵەتی" .

لە ڕوانگەی بازرگانییەوە زیاتر لەهەر هونەرمەندێکی سەدەی نۆزدەیەم نرخی ڕێنوار ناسراوە و دەڵێن لە ساڵی 1878 دا هەندێ لە تابلۆکانی بەنرخی چل تا پەنجا فرانك کڕدراون ... لەساڵی 1928 یەکێ لەم تابلۆیانە بەنرخی سەرسوڕێن 125000 هەزار دۆلار بۆ ئەمەریکا نێردرا...

بەڵام ئەم ژمارانە نابێت ترسمان بهێنێتە ڕێ ، چونکە لە نێوان ئەم ژمارانەدا و بەهای هونەری تابلۆدا پەیوەندیەکی ئەو تۆ لەکایەدا نییە.

لە ڕاستی دا هەندێ لایەنی لەمپەرداری بەرهەمەکانی ڕێنوار — وەك ئەمەی کە زیاتر وێنەی ژنانی دەکێشا یان ڕەنگی نازەنینی بەکار دەبرد یان بابەتی سادەی هەڵدەبژارد بەر لەلایەنی وێنەیی و سۆزەکی ، ئاڕاستەی هێزی ڕاستەقینەی هونەری ئەویان بەدی هێنا —

بەڵام دەربارەی ڕێنوار ئەگەر پشت بەڕەگەزی وێنەیی ببەستین ئەوا بە هەڵەدا دەچین ، بێ گومان هەندێ لە تابلۆکانی لەوانە تابلۆی " چەترەکان" کە لە مۆزەی تیت Tate لە

لەندەن پارێزگاری دەکرێت لەرووی کۆمپۆزیشنەوە گەلێ نمونەیەکی بالآیە " بەلآم زۆربەی تابلۆکانی تری لەڕاستی دا کۆمپۆزیشنیان — نییە .

ڕێنوار لە ئەژماردی وێنەکێشانی " بینا شێوە " ی وەك ویلێنیسکی دانانرێت، بە روویەکی گشتی مرۆڤ لە بەرهەمەکانی ڕێنواردا ئاڕاستەی بینای تابلۆکان نابێت ، بەلْکو زیاتر ئاڕاستەی رووی تابلۆکان دەبێت .

ڕێنوار هەستیارییەکی فراوانی دەربارەی رووی شتەکان هەبوو بەتایبەتی رەنگی پێستی لەش ( وێنە 52) گەلآی گولْ و لەشی ئافرەت و منداڵان و هتد ... ئەم بابەتانە بابەتی سەرەکیی کارەکانی ڕێنوارن و بێجگە لەم شتانە وێنەی شتی تری نەدەکێشا " وە دەلْێن لە کاتی وێنەکێشانی مۆدێلی رووتی ئافرەتان دا تابلۆکانی نیوە ناچڵ بەجێ دەهێشت و دەستی دەکرد بە وێناندنی گولْ ... گولێکی زۆری وێنە دەکێشا ، تا ئەو ڕادەیەی لە پای بەردەوامی دا لە وێناندنی گولەکانەوە فێر بوو کە گوایە چۆن تیشکی ناسکی پەڕەی گولْ لەسەر رووی پێستی لەشی مۆدێلەکانی بنەخشێنێ .

ڕێنوار ژیانێکی گۆشەگیر و ئارامی هەبوو ، لە بێ دەنگی دا لە باخچەی مالْەوەیدا هاوشانی خێزانەکەی ڕەزامەند بوو " لەگەلْ ئەمەدا لە نێوان وێنەکێشانی سەدەی ڕابردودا کەمتر کەسێ دەشێ هەبێ کە ژیان و گیانی قۆناغەکەی خۆی بەم چاکییە لە بەرهەمەکانی دا پێچەوانە کردبێتەوە . کاتێك لێکۆلْەرێکی وریا لە ئایندەدا بۆ تۆژینەوەی لایەنە عەینییەکانی ئەم قۆناغە سەرنج لە بەرهەمەکانی وێنەکێشان بدات — لە بەرهەمەکانی سیزان — ڤان کوخ یا گوگان = Gauguin دا لەم لایەنەوە دەشێ شتێکی ئەو تۆی دەست نەکەوێ ، کەچی لە بەرهەمەکانی مۆنێ و دیگا = Degas و ( وێنە 51) تولوزلوتریك دا گۆشەی سەرسوڕێن لە ژیان دا بەدی دەکات " بەلآم تەنها لە بەرهەمەکانی ڕێنواردایە کە ڕەنگ بە خۆشی وشادی و تایبەتمەندێتی ژیانی ڕۆژانە بەدی دەکرێت ، بەم مانایەش ڕێنوار لە وێنەکێشان دا لەبارترین نمایندەی ڕۆژگاری خۆیەتی .

## 73 – سیزان = Paul Sezanne

لەگەڵ گشت ئەمانەدا ، بەمانای ڕاستەقینەی وشە ، ڕێنوار بە ئەندازەی سیزان (وێنەکانی 54 – 53) نمایندەی سەردەمی خۆی نییە ، نەژادی من ڕۆژێکیان لەخەونی منداڵی بێداربووەوە و کتوپڕ بینی کە دەنگ و باڵۆرەی زۆر بەرپا بووە " کاتێ پرسیم چی ڕوویداوە " لە وەڵامدا بیستم کە " خەتای سیزانە " .

ئاشکرابوو کە خودی وێنەکێش بەر لە چوار ساڵ مردووە ، بەڵام نمونەکانی بەرهەمی ئەو بۆ یەکەمین جار لە پێشانگای وێنەکێشانی پاش ئیمپریسیونیستەکان نیشان دراوە .

زۆربەی خەڵکی بەرهەمەکانی سیزانیان بەتوندی جیاواز لەتێگەیشتنی جوانناسانەی خۆیان دەبینی و هونەرمەندانی هەڵمەتبەریش کەمێ گەشەیان کردبوو ، بەڵام جەنگی نێوان کۆنینەو نوێخواز لە هەرەس دا بوو کاتێ جەنگێکی سەخت تر سەرنجی ڕاکێشاین .

هەستی خودی من ئەمەیە کە هەندێ لە ئێمە کەم تەمەن بوین و لەبەرئەم هۆیە نەمانتوانی لە کێشە و جەنگی هونەریی ساڵەکانی (1910) دا لایەنێکی دیاری کراو بگرین و لە لە ساڵی 1919 دا کاتێ لە جەنگ گەڕاینەوە سیزانمان لە نێوان ئوستادان دا بینی و بە ڕوانگەی ئێمە ئەو پلەیە دەرهەق بەو سروشتی وە ڕودەکەوت . دەشێ لەو کاتەوە بێ کە توانیمان بە دووربینی مەسەلەکە تێ ڕوانین ...

سیزان شتێ نەبوو بێجگە لە ئەنجامێکی لوژیکی شێوازێك کە بەر لەو کاتە لە بەرهەمەکانی کۆنستابڵ و دیلاکروا دا تۆمار کرابوو.

کتێبی " پۆڵ سیزان " بەرهەمی ئامبروازڤۆلار = Ambroise Vollard — لە ساڵی 1919 چاپ کرا ، ئەم کتێبە لای ئێمە سیمایەکی ئەفسانەیی وێناند وێنەی سیمایەك کە بازوڵ = Baswell — وێنەی دکتۆر جانسۆنی — پێ نواندبوو . هەڵبەتە گلەیی و ڕەخنە لە ڤۆلار گیراوە بەمەی کە سیزانی بەجۆرە شێتێکی لادێیی لە قەڵەم داوە ، ئەم گلەیی یە لەسەر ئەم بناغەیە یە کە شێتی لادێیی ناتوانێ لەهەمان کاتدا هونەرمەندێکی گەورە بێت .

هەرچەندە " شێتی لادێیی " وێناندنێکی " شیاو نییە کە ڤۆلار دەربارەی سیزان بەکاری دەباو پێناسێکی ناشایەنی سیزانە...

لە ڕاستی دا ئەوەی لە کتێبی " پۆل سیزان " دا وەڕو خراوە ، بریتییە لە لادێیی یەکی زبرو توندگیر کە بەئاگا نییە لە لادێیی بوونی خۆی و بۆیە لەو بارەیەشەوە هیچ جۆرە شەرمێك هەست پێ ناکات " کەسێکە کە لە نوکتەکردن خۆشی نایەت ، بەلأم خۆی خویەکی هەزەلی شێوە گێلی هەیە " لە هەموو بابەتەکانی ژیانیدا ڕەفتاری ڕوکەشانەی منداڵانەیە ، بەلأم لەوێدا کە سەروکاری بە هونەرەوە هەبێ هۆشمەندە ... ئەو سیزانەی کە لە چیرۆکەکانی ڤۆلاردا وەڕو دەکەوێت بە کۆی شێوەکانییەوە وێنەیەکی دڵنیاکەرانەیە دەربارەی ئەم هونەرمەندە .

ئاشکرایە کە لەم سروشتە سادەیەدا ڕەگەزی گەلێ ئالۆز بوونیان هەیە : سیزان پێکهاتێکی ئالۆزبوو لە سادەیی خۆ بەزلگرتن ، سادە و ناواخن پڕ ، لەم دژایەتییانەدا دەتوانین ڕازی تەواویی ئەو وەك وێنەکێش تێبینی بکەین .

کاتێ کە لاو و خۆ پەسەندکەرە دەیەوێت جۆش و خرۆشی کەم تازۆر بارۆکانەی خۆی بخاتە سەر رووی تابلۆ " لێرەدا شێوازەکەی شایەنی تێگەیشتنە " بەلأم بارۆك بوون لەکاتێکدا کە کەشی شێوازی بارۆك بەسەر چوبێت ، کارێکی دژوارە .

دیلاکروا ئەو کارەی کرد و گەلێ باڵاش ئەنجامی دا " بەلأم پێویستە بزانین کە دیلاکروا زاڵبونێکی ئیلهام دەرانەی بەسەر زەمینەی کارەکانی خۆیدا هەبوو کە سیزان هەرگیز خاوەنی نەبوو .

هەمان دیالاکروا بوو دەربارەی خۆی ووتی : " ماری ئەفسون خوردە لە دەستی مارگردا " هەمیشە وێنە دەکێشێ ... سیزان شیعر یا غەزەلیات دیدەی ئەفسوناوی کردبوو بەلأم لە سەرەتا دا لە لێدانی فڵچەکانی دا هیچ ئەفسونێ پەیدا نەبوو .

تابلۆ دێرینەکانی سیزان کە لە کتێبی — روجەر فرای — دا دەربارەی سیزان هەندێکیان چاپ کراون ( " سیزان : لێکۆڵینەوەیەك لە ڕەوتی گەشـەی ئـەو " ) = Cezanne astudy of His Development : — لە ئاستی کارەکانی دوایی دا شایەنی سەرنجن .

بـەلأم ئەگـەر باوەڕبکـەین کـە ئەگـەر ویـستی سـەیری ئـەم لاوە لـەبزوتن دا نەبوایـە " هەرگیز سۆراغی ئەم تابلۆیانەمان نەدەکرد .

سیزان پەی بەمە برد کە دژوارترین کـار لـەم جیهانـەدا ئەمەیـە کـە بمانـەوێت بۆچـونە دیدەیی یەکانمان بەڕوویەکی ڕاستەوخۆ بەیان بکەین .

ئەگەر بابەتی (مۆدیـل ) ێکـی دیـدەیی ڕێگـەی بیـنین سـنوردار نـەکات ، زەینـی مـرۆڤ لەسەر پانتایی تابلۆدا دەکەوێتە لەرزین — تابلۆ دەشێت ڕادەیەکی زۆر یا بە ڕادەیەك ژیـان لەخۆی بگرێت ، بەلأم نەك تەنها ناتوانێ لە شتە دەرەکییەکـە بـچێت کـە هێنـدەش گـرنگ نییە " بەڵکو بێبەری دەبێت لە داڕشـتنی ڕوخـسار و ڕەنـگ و بـەدی هێنـانی هـارمۆنی کـە خواستی وێنەکێشی ڕەسەنن .

سیزان خستییە ڕوو کە هونەرمەند لە پێنـاوی گەیـشتن دا بـەم هارمۆنییەتـە پێویـستە نەك پشت بە دیدە بەڵکو پشت بەهەستەکانی خۆی ببەستێ .ئەم وشـەیەی — هەسـتەکان — بووە بەیداغی سیزان .

ئەنجام بریتییە لە گۆڕانی بارێك کە سیزان بەدەستی خـۆی بەسـەر خۆیـدا هێنـاوە ، سیزان گیانی خۆی گۆڕی " دیدەی بێ سرەوتی گیـانی ڕۆمانتیـك گـۆڕا بـە دیـدەی ئـارامی گیانی کلاسیك .

سیزان ڕۆژێکیان بە ڤولار دەڵێـت : " بڕوانـە ڤـولار ، وێنەکێـشان لـە بناغـەدا کـارێکی گرنگە بۆ ئێمە ، من لەو باوەڕەدام کە لەبەرامبەر سروشت دا ڕوناکتر دەبمەوە ، بەداخەوە دەربارەی خودی خۆم لە بەئاگا بـوون بـە هەسـتەکانم کـارێکی زۆر دەرد بەخـشە ... مـن ناتوانم ئەو بەهێزییەی لە هەستەکانمدا دەیدرکێنم بیخەمە سـەر ڕووی تابلۆکـانم " نـاتوانم ئەو بەرەکەتە پڕ شکۆیەی کە لە سروشت دا بوونی هەیە چنگی بخـەم ... لەگـەڵ ئەمـەش

دا لە ڕووی هەست کردن بە ڕەنگەکان ، جێگەی داخە کە تەمەنم بەسەر چووە ، حەیف کە ناتوانم نمونەیەکی زۆر لە هەستەکان و بیرەکانم دەربڕم ... بڕوانە ئەو هەورانە ، زۆر حەزم دەکرد بتوانم ئەو هەورانە وێنە بکێشم ... مۆنێ ئەم کارەی پێ دەکرا ، چونکە هێز و با زووی هەبوو. "

بە باوەڕی من تەواوی بوونی سیزان لەم وتەیەیدا کورت دەبێتەوە : ڕاستگۆیی و سادەیی ( سیزان تەنها بەرامبەر بەخەڵکی خۆی بەزل دەگرت نەك بەرامبەر بەسروشت ) " مەیلدارێتی ( سیزان تەنها بۆ وێناندنی یەك ڕوخسار لە ڕاستی دا سەدان جار کاری دەکرد ) " نەخشەکێشانی دودڵانەی باڵاترین ئەرکی هونەرمەند بوو ( " من لەو باوەڕەدام کە لەبەرامبەر سروشت دا ڕوناك دەبمەوە.")

لە جێگە یەکی دی دا ، لە گفتوگۆیەکدا لەگەڵ ژۆشیم گاسکوێ = Joachim Gasquet

سیزان دەڵێت : " هەرشتێ کە دەیبینین پەرت و بڵاوە و نادیار دەبێت ... سروشت هەمیشە یەکسانە " بەڵام شتێ لەو لە جێگەی خۆیدا نامێنێتەوە ، شتێ لەوەی کە دەیبینین لە جێگەی خۆیدا نامێنێتەوە ، هونەری ئێمە پێویستە جۆش و خرۆشی بەردەوام بە سروشت بدات، بە وەڕوخستنی کۆی گۆڕانکارییەکانییەوە ... پێویستە هونەر ئەم توانایە بە ئێمە بدات کە سروشت هەمیشەیی هەست پێ بکەین . "

ئەم باوەڕە کە تەنها لە پشتەوەی دیاردە هەمەجۆرەکان دایە ، ڕاستییەکی چەسپاوی تیادا پەنهانە و ئەرکی وێنەکێش ئەمەیە کە ئەو ڕاستییە واڵا بکات ... بۆچونێکی سەرو سروشتی لە بواری وێنەکێشان دا هەیە ، بەڵام وێناندنێکە کە هونەرمەندی وێنەکێش بەرەو باڵاترین بواری شیعر و فەلسەفە دەبات .

## 74 – ڤان کوخ = Van Gogh

سیزان لە هەمان سەرەتادا جێگەی تەسك بوو ، هەمان شێوە کە لەسەدەی نۆزدەیەم دورتر دەکەوینەوە ، سیمای ڤان کوخ ( وێنەکانی 13 –55 ) ڕاستەوخۆ لە ناوبەنگی ناپایەداری سەردەم جیا دەبێتەوە و ڕاستەخۆ لە تەك سیزان دا دابین دەبێت .

تـا ئـەو ڕادە زۆرەی بەزانـستێکی گەشـەکردوتر دەربـارەی ئـەو چـنگمان خـستووە هێندەی گەشەی تایبەتی ئەو لە شارەزایی هونەردا دەربارەی هونەر نازانین . سێ بەند لـە نامەکانی ڤان کوخ بۆ براکەی — شاکاری پڕ ئازاری ژیانی پر تراژیدیای کەڵە هونەرمەندێکـە کە چاوەڕوان ناکرێت خەڵکی سادە توانای خوێندنەوەی بەسەرهاتی ژیانی ئـەویان هـەبێت ... چـونکە ئـەم بەسـەرهاتانەی ئـەو هـەڵگری هەندەکییـەتێکی ئـەوتۆن کـە تـەنها لای هاوکارانی دەشێ شایەنی گرنگی بن .

بەڵام هەڵبژاردەیەك لە نامەکانی ڤان کوخ یەکێکە لە بـەنرخترین و شـیرین تـرین کتێـب ... ئەم نامانە لە بارودۆخی میوانێك یا گەڕۆکێك دەچێت کە بەرەو کەعبـە هـەنگاو دەنێـت ... بەکورتی ماڵگە و مەبەستێ کە ئەو پێی دەگات بێجگە لە پەرێشانی و بێبەشی شـتێکی ترنییە ... واتە شێتی و پاشان خۆکوژیی مرۆڤێکی بلیمەت لەم جیهانە بـێ مـروەت و نـرخ نەناسـەدا . ئـەم نامانـەی ڤـان کـوخ شـەرحی غـەمگین و بـێ ئومێـدیی ئـەون "بـەڵام لـە دێرەکانیدا پیت و فەڕی تەقەلایەکی گیـانیی مـەزن " پیرۆزیـی سـەبرێکی لـەبن نـەهاتوو ، جوانییەکی ڕەسەن و هەمیشەیی دەدرەوشێتەوە .

لـە ڕسـواکردنی ڤـان کـوخ دا وتویانـە کـە ئـەو تـەواوی تەمـەنی بـە وێنـە کێـشانەوە بردەسەر! 0000 واتە تابلۆکانی وەهـا وێنـە دەکێـشا کـە ئـەوانی تـر لـە قـوتی ژیـان دا عەودالْ بوون ... بیرەکانیشی تەنها بیری ڕەش وسپی بوون ... ئەمـەش بـە بۆچـونی مـن پەنابردنە بەر هونەرە . وەك ئەمەیە کەبڵێین شکسپیر — یـش تـەواوی تەمـەنی بـۆ سـرود نواندنی شانۆیی یە شیعری یە بێ قافییەکانییەوە بەسەر برد و هەرگیز نەگەیی بە مەزنی و شکۆی حەماسیی ئۆسین = Ossin ، هۆکاری بەیان کردن کە هونەرمەند هـەڵی دەبـژێرێت ، دەشێت لە دامێنی بەیانەکانی ئەودا کاریگەریی هەبێت ، بـەڵام کاریگـەری نەکاتـە سـەر چۆنێتی ئەو .

کەسێکی بلیمەت دەتوانێ بە گسکێك کارێك ئـەنجام بـدات کـە کەسـێکی ناشـی وگێـل بەچاترین ئامرازی کارگەیی نەتوانێ شتێ بکات .

ئەم ڕەگەزەی کە ئێمە هەندێ جار بەبلیمەتی و هەندێ جاری تر بەکەسێتی ناوی دەبەین ، هەمیشە بەسەر هەر کێشە و ڕاستی و ناجۆرییەك دا لە ڕەخنە و ڕەخنەگەریدا زاڵ دەبێت ... دەربارەی ڤان کوخ — یش بەچاکی هەر بوارێکی تر شایەنی تۆژینەوەیە ، بەلاّم تۆژینەوەی ئەو بە مانای ڕون کردنەوەی ئەو نییە .

ڤان کوخ بەشێوەیەکی سادە دەستی بەکارکردن کرد — واتە بەشێوەی شاگردی فرۆشگایەکی وێنەکێشان دەستی بەکارکرد ... تەنانەت کلاّوێکی سیلندەریشی کڕی ... بەلاّم لە دوایی دا زۆر بەتوندی نغرۆی عەشقی کچی خاوەن ماڵەکەی بوو و نەیتوانی دڵی ئەو کچە بەلای خۆیدا بەرێت ... لەوێ بەدواوە کەسێتی ڤان کوخ گۆڕانکاری بەسەرداهات ... پەرێشان و پەرۆش دەبێ و پەنا دەباتە بەر وێنەکێشان ... پاشان هێڵکاری دەخاتە لاوە و دەکەوێتە خوێندنەوە " بەتایبەتی کتێبی پیرۆز ... بەم جۆرە بەجۆرە بالاّچونێکی گیانی دەگات و لە بیست و دوو ساڵی دا ئەم ڕێبازەی — ڕێنان = Renan بۆ خۆی هەڵدەبژێرێت : " لە پێناوی ئەوەدا لەم دونیایەدا بەڕاستی بکەوینە کار ، پێویست دەکات کۆی مەبەستە خود خوازەکانمان واز لێ بهێنین ... مرۆڤ نەهاتۆتە دونیاوە تەنها بۆ ڕەزامەندی بوون " مرۆڤ بۆ ئەوە بەدی هاتووە کە تائەوپەڕی توانای ڕاستگۆبێت " بەدی هاتووە تاوەکو کاری مەزن بۆ مرۆڤایەتی ئەنجام بدات " لە پێناوی شەرافەندانەی ویستێکدا هاتووە مرۆڤ تا بەهۆیەوە لە ناهەمواری و ئەشکەنجەی ژیان کە کۆی کەسان لە دەستی دەناڵن ڕزگاربکات . "

ژیان و وێنەکێشانی ڤان کوخ ناشایەنی تێگەیشتنن ، مەگەر تەنها ئەوە بزانین کە تەقەلای ئەو تا کۆتایی هاوشانی بوو . " ئەوپەڕی ڕاستگۆیی " — ئەم وشەیە تەواوی کارەکانی ئەو پێناسە دەکات .

بەلاّم چی کارێکی دژوار " چەند نامەیەکی ڤان کوخ هەن کە لەساڵی 1880 دا بۆ تیۆی برای نوسیون تیایدا لەچەپ بوونی بێ چارەی گیانیی دەدوێت : " بۆت نییە وای ڕەچاو بکەیت کە من باوەڕ سستم ، من لەهەمان بێ باوەڕیمدا باوەڕدارم ، وەلەگەڵ

ئەوەش دا کە زۆر گۆڕاوم ، بەلاّم من هەمانم کە بووم ، تـەنها نیگـەرانیم ئەمەیـە کـە چـۆن لەم دونیا بەسودە دا قازانجیێ بم ... یا بەسودێ بگەڕێم ... ئایـا نابێـت کـە مـن بەکـەلّکی شتێ بێم و سودێ لە بوونمـدا پـەنهان بێـت " چـۆن دەتـوانم شـتێ فێـرە بم و لـە هەنـدێ بابەتدا بەقولّی بتۆژمەوە ؟

ئەمەیە بیر و خەیالّی هەمیشەیی من و لە دواییش دا دەبینم دەست و پـێم بەسـتراوە و بۆم ناکرێ هاوبەشی کارێ بم ... هەندێ شتیش کە پێویـستە لـە دەسـتی مـن دا نییـە ... ئەمەیە یەکێ لە هۆکارەکانی پەرێشانیی من .

سەرەڕای ئەمەش مرۆڤ لەبری دۆسـتی و خۆشەویـستی و میهرەبـانی دا بەهەڵـە رووبـە روو دەبێتەوە ، سەر لێشێوان و هـەراس ڕیـشەی گیـانی پیـاو دەسـوتێنێ ، ئەمـەش وەك ئەوەیە کە چارەنووس پێش عەریزە و سۆز و خۆشەویستیی لە مـرۆڤ گرتبێـت و لێـشاوی قێزی پیاو خەفە دەکات ... پیاو هاوار دەکات : خوای گەورە تاکەی ؟ "

ئەوپەڕی ڕاسگۆیی و ژیـانی ئاسـودە بـوون — ی ڤـان کـوخ — ئـەم دوو شـتەی نـاجۆر دەست کەوت ... ڤان کوخ تەنها چەتری سەری پێویست بوو لەگەڵ جێگەیەکی نووسـتن و قوتی لایەموت ( ژەمەخۆراکی کەم )...

ڤان کوخ دەڵێت : " پێویستە وەکو ڕاهیبەکان یا کەنار گیرەکان بژیین مەیلی زۆرمـان پێویستە کار بێت و پـشومان تەسـلیم بـوون . " بـەلاّم بێجگـە لـە شکـست شـتێکی دیـی بەشی نەبوو و ژیانی پڕ بوو لە زریکە و هاواری دوپات بۆ پارە و پول — پـارەی تـەواو بـۆ کڕینی ڕەنگ لە پـێش داو پاشـان خـواردن . ئـەنجامی غـەمگینی ڤـان کـوخ لای گـشتمان ئاشکرایە ، بەلاّم لەبارێکدا کە هەوڵی دەدا هەمیشە تا ئەو پەڕی توانای ڕاستگۆ بێت .

ئەم پەرێشان حالّییە و مەبەسـت و هـۆ بـە چـۆنێتی ژیـان و بەرهەمـەکانی ڤـان کـوخ دەبەخشێت کە هاوتای لای هونەرمەندانی هاوچەرخی وەك مانێ و سیزان ، کوگان ، ڕێنوار — دەبینرێت ... هاوشێوازی ڕاستیانەی ئەو بریتین لـە ڕامبرانـدت و میلـێ = Millet — کـە هەردویان پێکەوە ویستێکی بەربلاّو بەو دەبەخشن ... ڤان کوخ زۆر بەتەنگ ژیانی خەلّکی

زەحمەت کێشەوە دەهات ... لە جێگەیەکدا دان بەوەدا دەنێت کە : " هەم لە ژیان و هەم لە وێنەکێشان دا ناتوانم بەبێ خواوەند هەڵبکەم ، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا کە نەخۆش و نارازیم ناتوانم بەبێ شتێ کە لەخودی خۆم بالآتر و گەورەتر بژیم ، واتە ژیانم ، ژیانی داهێنانم ... وە من لە تابلۆکانمدا دەمەوێ دەربارەی شتێکی خۆشی بەخش بدوێم ، هەمان شێوە کە مۆسیقا خۆش بەخشە ، من دەمەوێت پیاوان و ژنان لە ئاستێکی هەمیشەیی دا وێنە بکێشم کە پێشتر بەیاریدەی بازنەی تیشك نیشانیان دەدا ( مەبەستی لەو هالە رۆشنەیە کە لە تابلۆ کلاسیکییەکان دا لەسەر سەری پیرۆزەکان دەکێشران ) وە ئێستا تەقەلای ئەوەمانە لە درەو شانەوە و لەرزی خۆمان دا رەنگەکان نیشان بدەین . "

ئەگەر ئەم وتەیە بە " بەیاریدەی بازنەی تیشك نیشانیان دەدا " تەواو بوایە " ئەوا بێجگە لە پڕوپاگەندەیەکی لوس شتێکی تر نەدەبوو لەڕووی ماناوە... بەڵام مرۆڤ ناتوانێت لە هەمان کاتدا لوس و " ئەوپەڕی ڕاسگۆ" ش بێت ... لە پێناوی ئەوەدا کە تا ئەوپەڕی توانا ڕاستگۆ بێت ڤان کوخ پەی برد بەوەی کە پێویستە هۆکارێك بۆ بەیانەکانی خۆی ئاشکرا بکات ... هەرچی سورتر و ڕاستگۆیانە تر لە دوای ئەم هۆکارەی بەیان کردن دا بگەڕێ ، زیاتر بەرەو توانای وێنەیی و پاراویی ڕەنگ و پەیوەندیی پەیتایدا لەگەڵ سروشت دا دەچێت — بەکورتی بەلای کۆی چۆنێتییەکان دا خۆی تاودا کە سەرسوڕێنی و گەرمای هونەری ئەویان بەدی دەهێنا .

## 75 – کوگان

ئەنجامی کوگان هێندە ئاشکرا نییە ( وێنە 56) ، چونکە ئەو هێندەی ڤان کوخ لەگەڵ خۆیدا ڕاستگۆ نەبوو ، پاش نامەکانی ڤان کوخ ، یاداشتەکانی ڕۆژانەی کوگان مرۆڤ هەراسان دەکەن .

کوگان لە خۆڕازی بوونی خۆیدا نغرۆ بوو ، پێویستە یادمان بێت کە کوگان وێنەکێشێکی خودفێرکەر بوو .

کوگان لە ساڵی 1848 لە پاریس هاتۆتە دنیاوە و بەمنداڵی بۆ ماوەی چەند ساڵێك لە لیما و شیلی ژیاوە و لە خۆرەتاوی گەرمەسێر دا بە دابی مەسیحی پاپ کراوەتەوە ( غسل التعمید) .

لە هەرزەکاریدا سەفەری زۆری کردووە ، بەڵام لەبیست و سێ ساڵی دا بووە بە دەلاڵ —ی کارگوزاری ... هەروەها بەگەرمییەوە دەستی داوەتە وێنەکێشان و بووەتە ئاشنای پیسارۆ .

کارە ئاوییە سەرەتایی یەکانی بەهایەکی ئەوتۆیان نییە ، ناسکییان پێوە دیار نییە ، هەر لەوکاتەوە پەیوەندی ئەو و گرنگی دانی بە ڕەنگە پاراوەکان والا دەبێت " بەڵام بەشێوەیەکن کە هەر هونەرکارێکی رۆشنبیر کە سەروکاری لەگەڵ ئیمپرێسیونیستەکان دا هەیە لێی چاوەڕوان دەکرێ وەها کار بکات .

بەڵام لە دواییدا پەیوەندی کوگان بە وێنەکێشانەوە لە سنوری سادە تێ پەڕی ، لە ساڵی 1881 وازی لەکار هێنا و لە ساڵی 1882 لەگەڵ پیسارۆدا چوو بۆ نورماندی و برتانی تا سەرگەرمی وێنەکێشان بێت " سەر پەرشتی خێزانەکەی خستە ئەستۆی هاوسەرەکەی.

پیسارۆ بە منداڵی سەردانی دورگەکانی ئانتێل — ی کردبوو ، ئەمە بوو کە لەگەڵ کوگان دا دەیانتوانی یادگاری خۆیان دەربارەی سەرزەمینە گەرمەسێرەکان ڕەنگە بەهێزەکان بۆ یەکتری باس بکەن .

پەیوەندیی کوگان بە ژیانی سەرەتایی یەوە هێندە گەشەی کرد کە شوێنەواری بەسەر کارو ژیانی دا زاڵ بوو... سەرەتا لەهەندێ ناوچەی دوری برتانی بە دوای ژیان دا دەگەڕا و لەوێ دا بوو کە بووە ئاشنای ڤان کوخ . پاشان لە ساڵی 1887 کت و پڕ بەرەو مارتینیك — چوو سەری لە دوورگەکانی ئانتێل داو میواندارییەکی پیسارۆی کرد ... ساڵی پاش ئەوە گەڕایەوە فەڕەنسا و لە هەمان ساڵ دا بوو کە هاوژیانی بەد ئاکامی لە شاری ئارل = Arles لەگەڵ ڤان کوخ دا سەریهەڵداو بە خۆکوژیی ڤان کوخ کۆتایی هات .

کوگان گەڕایەوە بۆ برتانی ، بەلآم لە سـالّی 1891 بـەرەو تـاهیتی چـوو ، ئەگەرچـی ساڵانە یەك دووجـار دەگەڕایـەوە بـۆ فەرەنـسا ، بـەلآم چـیی دی هەسـتی بـە ڕەزامەنـدی نەدەکرد لە ژینگەو شارستانیەتی ئەورووپا دا .

لە سالّی 1891 بەرەو دورگەکانی باشور بەڕێ کەوت و لەوێدا ژیـانی بـرەو پـێ دا تـا لەسالّی 1903 لە مارکزاس کۆچی دوایی کرد .

ناتوانین دەربارەی کوگان بەڕوویەکی سادە بدوێین ، هیچ کەسێك لە قولّی هەسـتیاریی ئەو نەهی ناکات " هەستیاریی ئەو بەتایبەتی بۆ ڕەنگەکان بەهێز بوو .

هەروەها دەیزانی لە وێنەکارییەکانی دا بەدوای چیدا عەودالّـە و ویـستێکی مەتینیـشی هەبوو .

ئامادەیی ئاسان و سادە نەبوو ... لە یاداشـتەکانی دا دان بـەوەدا دەنێـت کـە : " بـۆ هەر جێگەیەك دەچم پێویـستم بـەقۆناغێکی مانـەوە هەیـە بـۆ ئاشـنا بـوون بـە نـاوەڕۆکی گیاکـان و درەختــەکان – بــەکورتی بــە تــەواوی سروشــت ... کــە هــەرگیز مــەیلی نییــە تێگەیشتو بێت یا خۆی بەدەستەوە بدات . "

تەرزی ڕووبەڕووبونەوەی کەسێکی وێنـەکێش لەگـەلّ سروشـتدا پێویـستە وەهـا بێـت ، ئەگەر چی تەماشـاکردنی ئـەم فریودانـە لای کوگـان کـەمێ زویرکەرانەیـە ، کوگـان سـادە نەبوو، هەمان شێوە کە چۆنێتی ژیـانی ئاشـکرای دەکـەن و هـەمان کـە هەرخوێنـەرێك لـە یاداشتەکانی دا تێی دەگەن .

بەلآم هەمان شێوە کە خۆی پەنجەی بۆ درێژ دەکات " سادەیی بایی بوون جیاوازە لـە سادەیی ... بایی بوونی کوگان بەهۆی سادەیی یەوە نەبوو ... بۆیـە ئاسـان نییـە ئـەو بـە هونەرمەندێکی یان کەسێکی – ڕۆمانتیکی – پێناسە بکرێت .

بەشێوەیەکی ڕوکەش وا دەردەکەوێت کـە ئـەم عەشـقەی بـۆ ژیـانی سـەرەتایی ، ئـەو مـەیلی کێـوی بوونـە ، هـەلآتن لـە کۆمەلّگـە و شارسـتانی شـێوەی زیـارۆیی گیـانێکی ڕۆمانسییە .

بەڵام یاداشتەکانی زبرو گاڵتە ئامێزن و لە تەرزی ڕاستیین دایە .

هـەلآتنی کوگـان بـەرەو ناوچـەکانی باشـور زیـاتر هۆکـارێکی ئەنـدامی ی هـەبوو وەك ئایدیالی ، چونکە هەستی دەکرد سروشت و رەنگ شـادی و درەوشـانەوەیەکی سروشـتیان هەیە و لەودا دەژین و بەهۆیانەوە دەتوانێ هونەرێ بەدی بهێنێ کە پایەدارتر بێ لە ڕەنگی پەڕیوی ئیمپریسیونیستەکان و بەهێزتریش لە کلاسیکییەکان .

دەربارەی ئەمەی کە کوگـان نـەیتوانی شـێوازێکی کلاسـیکی بـەدی بهێنێـت ، شـتێکە هەموو لامان پەسەندە ، ئەو بەڵگانەی دەربارەی ناتوانایی ئەو یادی دەکەنەوە " وشـەی " جوانکــاری = ئارایــشت " لەبەرامبــەریان دا والآیــە ... بەهــەمان بەڵگــە کــاتێ کــاری هونەرمەندێك بە ئارایشتکاری ناو دەبەین " لـە ڕاسـتی دا غەدرتاشـیمان کـردووە دەرهـەق کارەکانی ... خودی کوگان بنەماو دەستوری هەبوو کە ئێمەیش دەتوانین بەکاری بەرین :

هونەر بۆ هونەربێت ؟

هونەر بۆ ژیان بێت ؟

هونەر بۆ چێژ — بێت ؟

لەبەرئەوەی کە هونەر ، لەخۆیدا هونەرە ، کەواتە کۆسپ لە چیدایە ؟

کەواتە هونـەریش لـەپێناوی ئارایـشت دا کـاتێ کـە هونـەر هونـەربێت چـی کۆسـپێکی هەیە ؟ ئارایشت ناولێنانی تابلۆیەکی هونەری بەم مانایەیە کە دەکرێ بەهایـەکی مرۆڤانـەی بەسەردا ببڕێت ( چونکە بەهای خواوەندی جێگەی باس نییە ) .

کاتێ کوگان بـە ڤـان کـوخ پێوانـە دەکـەین ، ڕاسـتەوخۆ ئـەم جیاوازییـە سـەرنجمان ڕادەکێشێ " وێنەکێشی هۆڵەنـدی سـەر ڕێـژە — لـە خۆشەویـستی بـۆ هاوڕەگـەزەکانی و هەوڵ دەدات ئەم خۆشەویستی یەی لە هونەرەکەیدا ڕەنگ پێبداتەوە .

ڕاست بەهەمان شێوە کە خودی ئەو پـەی پـێ بردبـوو کـە هونەرمەنـدانی مـەزنی وەك شکسپیر و ڕامبراندت وەهایان کردووە .

دەشــێ بوترێـت کـە کـارێکی وەهـا مەبەسـتێکی ئەدەبییـە و پەیوەنـدیی بـە کـاری وێنەکێشەوە نییە ، لەبەر ئەمەی کە هونەر هونەرە کۆسپ ئەبێ چی بێت ؟

بەڵام هونـەر فـەرمانێکی ئەبـستراکتی نییـە ... هونـەر چـالاکییەکی مرۆڤایەتیانەیـە و تەنها لە ڕێگەی یەك کەسێتیی مرۆڤییەوە بەدی هێنانی ئاڕاسـتە دەبێـت ... چـۆنێتی ئـەو کەسێتییەش لەگەڵ چۆنێتی ئەبستراکتیکی هونەردا تێکەڵ دەبێت .

بەهای هونەریش پەیوەستە بە قوڵایی هەستە مرۆڤایەتییەکانەوە ... ئەم پایەدارێتییـە کە بەم شێوەیە بەدی دێت شتێکە لە بەرهەمەکانی ڤان کوخ دا بە ڕادەیەکی بەربڵاو بـەدی دێت . لە کاتێکدا کە بەرهەمەکانی کوگان بە کۆی جوانیی واڵاو ڕوکەشیانەوە بە ئاشـکرایی لەم شتانە بێ بەرین .

## 76 – هنری ڕۆسۆ

لە دوای سیزان و ڤان کوخ و کوگان – هنری ڕۆسۆ ( وێنـەی 57 ) گـرنگترین میـوانی هونەری نوێیە کە لەساڵی 1844 لە لاڤان = Laval هاتۆتە ژیانەوە ، باوکی ئاسن فرۆش بوو ، لە پانزە ساڵی دا چووە نێو خزمەتی نیزامییـەوە و بەشـێ بـوو لـە گروپـی مۆسـیقا، پێنج ساڵ (1862–67) لە نەبەردی مەکسیك دا هاوبەشی کرد .

لە جەنگی 1870 گەیی بە پلەی سەرپەلی گەیشت و لـەکاتی بڕیـاردانی ئاشـتی دا بـە ناونیشانی لێپرسراوی گومرگ کارێکیان لە پاریس پێی دا .

ڕۆسۆ لەکاتی بەتاڵ دا دەسـتی دەکـردە وێنەکێـشان لەسـاڵی 1880 دا بـێ کـار بـوو کۆی کاتەکانی تەرخان دەکرد بۆ وێنەکێشان ... ئەم خاڵـەش بـەم مانایـە نایـەت کـە ئـەو درەنـگ بـواری وێنەکێـشانی ڕێبـاز کردبێـت ، بـەڵکو ئـەو لەسـەردەمی لاویـش دا مـەیلی وێنەکێشانی هەبوو – بەڵام چاوەڕوانی کاتێ بوو کە تەواوی ژیانی لە هەژارییەکی بـەهێزدا ، لە جەزبەی داهێنان دا بەسەر برد .

بەلأم ڕۆسۆ نا ڕەزامەند نەبوو چونکە بـە زوویـی گروپێکـی لـە هاوڕێکـانی هۆشمەنـدی خـۆی لـەدەوری خـۆی کـۆکردەوە — ئـالّفرد ژاری = Alferd Jarry نووسـەری شـانۆنامەی "شای ئوبۆ =Ubo Rio و گیوم ئاپولینێر = Guillaum Apollinaire کە شاعیرێکی مـەزن بـوو " ئەمانە هاوڕێی کۆن و وەفاداری ئەو بوون .

بەچاو قوچاندن لە بەهای کارەکـانی ، ڕۆسـۆ کەسـێکی سـەرنج ڕاکـێش بـوو ، وێنـەی کرێکاری سادە کاری دەکرد و دەژیـا ، ژیـانی هێنـدە خاڵییـە لـە بەسـەرهات و هـەواڵ کـە نووسەران ناچارن بـۆ پڕکردنـەوەی لاپـەڕەکانیان بـەدوای گاڵتـە وگـەپ دا کـە دەربـارەی دروستیان کردووە بگـەڕێن تـا بابـەتیان دەربـارەی چـنگ بکـەوێت ... کـۆی ئـەم گاڵتانـە دەربارەی ڕۆسۆ تەنها خاڵێك وەرو دەخەن ، ئـەویش سـادە دڵیـی تـەواوی مرۆڤێکـە . بـە تایبەتی دەڵێم تەواو " کامل" و گومانم نییە لەوەی " تەواو بوو " ڕاستر نـەبێت " چـونکە گومانی تیادا نییە کە ڕۆسۆ لـە چـییەتی ئـەم خاسـیەتەی خـۆی بـەئاگا بـوو و بەتایبـەتی لەخۆیدا گۆشی دەکرد .

ئەگەر سادەیی ئەو کەمتر ڕەسەنایەتی هەبوایـە ، ئـەوا بـەزوویی کـاری بـەزیادە ڕۆیـی خۆنواندنەوە دەبوو " بەلأم ڕۆسۆ خاوەنی هەستیارییەکی بەهێز بوو.

لە مەکسیك بیرەکانی خـۆی بـە وێنانـدنی باڵنـدە و گیانـداران و گـوڵی سەرسـوڕێنەوە خەریك کردبوو ، بیست ساڵ دوای ئەوە کاتێ دەستی بـە وێنەکێـشان کـرد دیمـەنی بێـشە گەرمەسـێرەکانی لـەیادی خۆیـدا دوپـات وێنـە دەکێـشایەوە ، ئـەم ڕەگـەزەیش لـەیاد هێنانەوەی ئەو پیاوەدا هێنـدە جـوان ئاڕاسـتە بـوون کـە گوایـە بـە درێـژایی ئـەو ماوەیـە ویـژدانی نائاگـای وێنـەکێش سـەرگەرمی بـاش و خـراپ کـردن و ڕێکخـستن و لـەبارکردنی کارتێکەرەکانی خۆی بووە .

شێوازێك کە ئەزمون و غەریزەکان بەم شێوەیە فێرە ئەوی دەکرد ، لە کۆی تابلۆکـانی دا بەکاری دەبردن ... دەیگوت کە سروشت تاقانە مامۆستای ئەوە " ئەم وتەیە ڕاست بـوو بەم مانایەی کە ڕۆسۆ لای هیچ مامۆستایەك فێر نـەبووە ، بـەلأم هەمیـشە مـاددەی خـامی

لەسروشتەوە وەردەگرت " هێڵکاری تابلۆکانی ئاتـاجی خەیاڵـەکانی خـودی خـۆی بـوون و بەس .

لە هونەری هنری ڕۆسۆدا تەنها شتێکی منداڵانە بوونی هەیـە ، ئـەم شـتـەیش لـەخودی ئەو هونەرەدایە ، هەروەها لەو هونـەرەش دا کـەماڵێك بـوونی هەیـە کـە لـەڕادەی منداڵانـە زیاترە ... ڕۆسۆ کەسێکی سادە بوو ، بەڵام لەهەمان کاتدا قـوڵ بـوو و لـە ژیانـدا زۆر فێـر بووبوو کە بەری هەستیاری و ئەزمونەکانی بوو و هیچ پەیوەندییەکی بـە زانـست و بـیرەوە نەبوو .

## 77- پاپلۆ پیکاسۆ

پیکاسۆ ( وێنەی 59 ) زۆر جار بە – گرنگترین – هونەرمەنـدی هاوچـەرخ ناودەبـەن . بەڵام کۆسپ بتوانین بزانین کە مەبەست لەم وشەیەی – گرنگترینە – چییە .

ئایا هونەرمەندێکی " گرنگ " بەپێی پێویست وێنەکێشێکی چاکە ، واتـە کەسـێکە کـە هەسـتی جـوانیی لـەو وێنانـەدا بـەیان دەبێـت کـە دەمێننـەوە . چـونکە خـاوەنی بـەهای گشتییە ؟

یان وێنەکێشی گرنگ کەسێکە کە جێگەی پەسەندی کۆمەڵێك سود فرۆشانە ، ئەوانەی هەمیـشە لەزۆربـەی قۆناغـەکان دا لـەپێناوی هـەرجۆرە هـەڵاتنێکی سـەیر و نـامۆدا ، لەکۆسپی بەدوای یەکدا بەهایەك لەپێش چاو دەگرن ؟

وەڵامدانەوەی ئاسان نییـە و دەربـارەی پیکاسـۆ بـە تایبـەتی هەمـە جـۆریی نرخێکـی هەبوبێت، خۆی بە پەیڕەوکردنی شکڵی تایبەتەوە پـڕ هێـز کـردووە ... توانیـوێتی وێنـەی تولوز لەو تریك مرۆڤانە و گاڵتە چی بێت ، وێنەی ئینگـەر = Ingers تەسـك بـین و وێنـەی مایکل ئـەنجلۆ مـەزن و وێنـەی گـروز هەسـتی بێـت " لەهـەمان کـاتیش دا دەتـوانێ تـەواو ئەبـستراکتی بێـت و بـەتاڵ بـێ لەهـەر پەرچـە کردارێکـی ئەنـدامی سـەبارەت بـە وێنـە و نرخاندنی .

لەگەڵ ئەمـەش دا خـودی پیکاسـۆ ڕایگەیانـدووە کـە هـەرگیز شـایەنی گـۆڕان نییـە و پێویستە لە کۆی تابلۆکانی دا بەدوای ڕێبازی وێنەیی و نواندنی لێکـچودا و بـەدوای بـەهای لێکچوو دیدەی لێکچودا بگەڕێین .

پیکاسۆ لەساڵی 1881 لە مالاگا ، ئیسپانیا هاتۆتە ژیانەوە .

بەم پێیە نەژادی بیکاسۆ لە نەژادی ماتیس – کە لە 1869 دا هاتۆتە ژیانەوە لاوتـرە ...ماتیس لەو ڕووەوە ناو دەبەم کە هەندێ هێشتا لەو بڕوایەدان کەو وێنەکێشێکی گرنگترە ... ئاشـکرایە کـە مـاتیس مـرۆڤ دوچـاری هەسـت کـردن بـە دودڵـی و سەرپێـچی ناکـات ، ناوبانگیشی جێگەی باوەڕە .

هەرچەندە گرنگیی هونەری ئەو هێشتا تـەواو تێنەگەیـشتون ، بـەڵام هونـەری مـاتیس هاوڕێ بەجۆرێك لە حەق سەرکەوتووە .

هونەری ماتیس ڕێبازییە ، واتە هەمان ڕێبازی سیزانە – کـە تـاهێزێکی قـوڵتر بـرەوی بەخۆی داوە و بۆچونی وێنەکێشی تیایدا بـە ئاڕاسـتەیەکی تـەواوتر ڕەنگـی داوەتـەوە ... لەگەڵ ئەمەش دا کە پیکاسۆ سەرەتای شێوازێکی نوێیە نیوەی کاریگەری ئەو لەسەر ئێمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەم ئاڕاستەیەی کە دەتوانێ هەستی سەر سوڕماندنمان بخرۆشێنێ .

لەگەڵ ئەوەدا کە فەرەنسا پیکاسۆی بەلای خۆیدا کێش کردووە ( لە سـاڵی 1903 دا پیکاسۆ لە فەرەنسا نیشتەجێ بوو ) بەڵام هەرگیز پیکاسۆی هەرس نەکردووە .

چونکە پیکاسۆ میللییەتی خۆی پاراستووە ، ئەم خاڵـەش هـەمان شـێوە کـە ئوهـد = Uhed – لە کتێبەکەیدا ( " پیکاسۆ و دابی فەرەنسا = Picasso et la Tradition Frencaise" ) ڕوونی دەکاتەوە پیکاسۆ زیاتر ئەڵمانییە تـا فەرەنـسی ... جەرمـەنی ( ئـەڵمانی ) دەشـێ وشـەیەکی نـامۆ بێـت بـەڵام ئوهـد لـەگیانی یۆنـانی و ئیـسپانی و ئـەڵمانی دا لێکـچونێکی بنچینەیی دیاری دەکات کە ئەویش بریتییە لە مەیلدارێتییان بۆ بەیانکردنی مەیلی ناکۆتایی و باڵاتر لە هەست .

دەتــوانین هــاورا بــین کــە شــێوازی پیکاســۆ بــەلای کەمــەوە لــەرووی لایەنــە روکەشیەکانییەوە " لە رەنگکاری دا عەبوسە ( بـێ هودەیـە ) و لـە سرۆشـی دا تـەواو بـە ئازارو لە مەیلدارێتی دا ئەستونی و لە ئاوازیدا رۆمانسی و بە روویەکی گشتی کـردن گیـانی گـۆتی یـا ئـەڵمانی رەنـگ پـێ دەداتـەوە . " دەشـێ بەکۆسـپ بێـت خـودی پیکاسـۆ ئەنجامگەرییەکی لەمجۆرە پەسەند بکات ... ئەویش وەکو کۆی وێنەکێشانی نوێ مرۆڤێکە تاك ... یەکێ لە وتەکانی ئەمەیە کە : " من ئەوە وێنە دەکێشم کە دەیبینم — " ... بـەلام دەشێ ئوهد لە وەلامدا بڵێت کە مرۆڤی تاك = تاکانە — بوونی نییە " گشتمان بەیانکـەری رێکخراوێکی بەهێزی هەستیین کە لەوێدا هاتوینەتە ژیانەوەو بەو پاڵپشتین .

تێبینی دەربارەی هونەر بوونی هەیە کە قەبارەیەك بە خودی پیکاسـۆ دەبەخـشێ ... ئەم خواستانە سەرەتا لە گۆڤارێکی رووسـی دا چـاپ کـراوە پاشـان بـە زمـانی فەرەنـسی بلاوبووەوە و لە ژمارەی دووەمی گۆڤارێکدا بەناوی " فۆرم = Formes — بلاوکرایەوە .

هەندێ لە ئاخاوتنەکانی پیکاسۆ لە وەلامی رەخنەگرانی دایە ...بۆ نمونە :" هونەر نـە رابردووی هەیە نە ئاینـدە " هونـەرێ کـە نـەتوانێ لـە سـەردەمی ئێـستایدا جێگـەی خـۆی بکاتەوە هـەرگیز بەجێگەیـەك یـا ئاسـتێك ناگـات ... هونـەری یۆنـانی و میـسری پابەنـدی رابردوو نین " ئەم هونەرانە لەمرۆدا زیندوترن لەوەی کە دوێنـێ بـوون ... گۆرانکـاری کامـڵ بوون نییە ... ئەگەر هونەرمەند هۆکار و ئامرازی کارەکانی یا بەیان کردنی بگۆرێت " ئەمـە بەو مانایە نییە کە لـە روانگـەی خـۆی گۆریـوە . " هـەروەها دەڵێـت : " کـۆبیزم لـە هـیچ روویەکەوە لەگەڵ کۆی مەکتەبەکانی وێنەکێشان دا جیاواز نییە ... لە کـۆی مەکتەبـەکان دا رەگەز و رێبازی یەکانە بەرێوەبەرە . " ... هەروەها لە رونکردنەوەی زیاتردا دەربـارەی کۆبیزم دەڵێت : " سروشت و هونەر دوو دیاردەی تەواو جیاوازن . " — " کۆبیزم نە تۆوی هونەرێکی نوێیە نە چرۆی ئەو ، بەڵکو بریتییە لە قۆناغێك لەگەشەی وێنەی رەسەن . ئـەم وێنانـە بـەدی هـاتوون بـۆ خۆیـان " تەنانـەت بوویـەکی ئازادیـشیان هەیـە . " " هەنـدێ

وێنەکێش هەن کە خودی خۆر دەگۆڕن بەیەك خاڵی زەرد ، بەلأم هونەرمەندانی تریش هەن کە بە چڕیی هۆش و هونەریان یەك خاڵی زەرد دەگۆڕن بە خودی خۆر . "

دەشێ هەمان شێوە کە پیکاسۆ دەڵێت نیازەکان لە هونەردا بەهایان نەبێت ... تەنها کاری وێنەکێش ئەمەیە کە وێنە بکێشێت و بەرهەمی هونەری بێ گومان لەبەرامبەریدا وە ڕوو دەکەوێت یا والأ دەبێت . " من بەدوایدا ناگەڕێم ، من پەیدای دەکەم . "بەلأم ئەگەر بمانەوێت نەك لەلایەن وێنەکێش و هونەرمەندەوە ، بەڵکو لەلایەن بینەرەوە بدوێین کە دەیەوێت بەرهەمی هونەری دان پیادا بنێت " پێویستە ئەم مەرجایەتییەمان بوێت کە لە کارتێکەری کەسێتیی وێنە کێش پارێزراو بین .

پیکاسۆ هەندێ تابلۆی هەیە کە زیاتر سەر بەقۆناغی شین – ە ( 1903 – 1905 ) کە بە هەستیاری فێلّ کاری سەرزەنشتمان دەکات ... تابلۆی تریشی هەیە کە سەر بەقۆناغی دوایی ترن کە هیچ بینایەکی شایەن وەڕوخستن تیایان دا نابینرێت .

هەندێ جار دەکرێت ڕەچاوی بکەین کە لایەنی هزریی بەهێزی هەندێ لە ئەبستراکتە ئەندازەیی یەکانی ئەو بێجگە لە پەرچە کرداری دۆخە هەستییەکانی شتێکی زیاتر نین .

بەلأم ئەگەر لەم بابەتانەی نەفرەت و زیادەڕۆیی لابدەین ، ئەوا پیکاسۆ کۆمەڵە بەرهەمێکی تری هەیە کە هەمەڕەنگیان تا ڕادەیەك ناکۆتاییە ... چڕیی توانامەندییەك کە لەم کارانەیدا وەڕو دەکەوێت بەتەنها نیشانەو نماینەدەی بلیمەتی ی پیکاسۆن " چونکە بەواتای ولیام بلیك تەنها یەك پیاوی ژیر دەتوانێت تا ئەم ڕادەیە لە کەرێتی خۆیدا پێ داگرێت .

## 78 – شاگاڵ – Marc Chagall

لەتەك پیکاسۆ دا پێویست دەکات ئاگاداری وێنەکێشێکی تریش ببین کە مارك شاگاڵ– ە ( وێنەی 61) .

ڕێنێ شوب = Rene Schwob – لەکتێبی " مارك شاگاڵ و گیانی یەهودی = Marc Chagall et Lame juive – تا ئەو ڕادەیە پێ دادەگرێت کە شاگاڵ ڕاستەوخۆ بە گرنگترین وێنەکێشی هاوچەرخ ڕادەگەیەنێت .

شاگاڵ لە ساڵی 1887 دا لە ڤیتبسك = Vitebsk – روسیا لە خێزانێکی یـەهودی لـە دایك بووە ، ماوەیەك لە سان پترسبورگ – شاگردی باکست = Bakst بوو کـە وێنەکێـشی جل و بەرگ بوو و بەهۆی کارەکەیەوە لە بالێتی ڕوسی دا ناوبانگی هـەبوو " بـەلاّم لەسـاڵی 1910 دا شاگاڵ بەرەو پاریس کەوتە ڕێ و ڕایگەیاند کە قوتابخانەی ڕاسـتەقینە و ژیـانی هونەریی شاری پاریسە .

لە ساڵی 1914 دا گەڕایەوە بۆ روسیا و قۆناغی شەڕ و هەڵگەڕانەوەی = کودەتا – ی لەوێ بەسەربرد و تاوەکو ساڵی 1922 لە ڕوسیا مایەوە ... لـەم ماوەیـەدا هونەرگایـەکی بچکۆلەی لە ڤیتبسك بەڕێوە دەبرد ، پاشان گەڕایەوە بۆ پـاریس و لـەوێ بـرەوی بـەکاری خۆی دا .

شاگاڵ هەرچەندە دەشێت کەسانێك بێزار بکات کە هەر شتێکی نەناسراو ( بـە مـەیلی خراپەکاری ) دەبینن ... پێویستە لە کارەکانی ماتیس و پیکاسۆ تـەواو جیـا بکرێتـەوە " وە بابەتی سەرەکی کتێبی شوب – یش هەمان خاڵ ڕوون دەکاتەوە لە ڕاسـتی دا و شـوب – بە ئازادییەکی خرۆشێنەرەوە لە بەکاربردنی وشەیەکی دژواردا دژی خۆی وتویەتی ، دوو دڵ نییە لەمەی کە ڕووی ئەم جیاوازییە " بەخۆشەویستی " ناو بەرێت ...

دەڵێت کە ماتیس و پیکاسۆ وەها لە پیشەکەی خۆیان دا توش بوون کە ناچـار بـوون بە پێی پێویست جۆرە حاڵەتێکی نامرۆڤانە یان لەخۆ گرتبێت ، هونەرەکـەیان هونـەرێکی هزرییە... بەلاّم شاگاڵ بە دەرون و پایەدارێتییەك یـا ئامادەییـەك کـە تایبەتـە بـە نـەژادی خۆیەوە" بـە تـەواوی خـودی خۆیـەوە وێنـە دەکێـشێت ... لـە ڕاسـتی دا شـاگاڵ ڕەنگـی دەهۆنییەوە و تابلۆکانی زۆر لە هۆنراوە دەچن و ڕوی لێکچونیان هەیە ، شـاگاڵ بـێ تـرس بوو لەوەی کە بە وێنەکێشێکی " ئەدەبی " ناو بەرن .

## 79 – هۆکاری نەژادی

لێرەدا دووخاڵ شایەنی باسن ، یەکەمیان بابەتی نەژاد " شیاوی باوەڕکردن بە هۆکاری نەژادی لە هونەردا ، یان لە هەر بوارێکی دیکەی بێجگە لە ڕامیاری " کە دەشێ باوەڕێکی دێرینەو بەسەرچووبێت " بەڵام هونەر لە گەڵ ئەوەدا کە بە مانایەکی گەلێ ڕاستەقینە شتێکە جیهانی و چارەنوسێکی گەلێ ئاڵۆزی هەیە و لە پەیوەندی و کارتێکەری بەرامبەری دا کە قۆناغو نەژادی هەمەڕەنگ لە خۆی دەگرێت ، دیسانەوە جۆری تایبەت لە هونەری خێڵە تایبەتەکانی خەڵکی یا میللەتان دیاری دەکات .

ئەگەریش یەك جیاوازیی زەق بۆ نمونە ئەگەر جیاوازیی نێوان خێڵە سامییەکان و ئارییەکان لەپێش چاو بگرین " ئەوا دەبینین کە لە گۆشەکانی بەیانی هونەرییان دا جیاوازییەکی ئاشکراو ڕوون بوونی هەیە .

لە ڕاستی دا خێڵە سامییەکان بەیانی بەرجەستەییان نییە — واتە لەم بوارە ڕەسەن یا " داهێنەر" نین ... بەڕادەیەکی ڕێژەیی دەتوانین بلێین کە هونەری وێنەکێشان و پەیکەرسازی یەهودی بوونی نییە .

چونکە یەهودییەکان خەڵکانێکن لە وەچەیەکی بیابانی کە لەبەرامبەر ئەزمونی لەشی دا پەرچەکرداری ڕاستەوخۆ یا کت و پڕ نیشان دەدەن " لەو حاڵەدا کە زۆربەی هونەرەکان سەر بەخێڵە شار نشینەکانن کە لە ناوچەیەکدا نیشتەجێ دەبن و شارستانیەتێکی دابین کراو و دەوروبەرێکی لەبار بۆ خۆیان بەدی دەهێنن .

خێڵە بیابانگەڕەکان تەنها دەتوانن هونەری هەندێ کەس — یا کەمایەتی بەدی بهێنن کە ڕەنگدانەوەیان لە شتی یا بابەتی گوێزراوەیی دان ... ئەم جۆری هونەرەی کەمایەتییە ڕادەیەکی لە هونەری شاگاڵ دا هەیە ... بەڵام شاگاڵ ڕایگەیاندووە کە ئەم جۆرە هونەرە ئەو ڕەزامەند ناکات " ڕاستەوخۆ بەم هۆیەی کە ئەم هونەرە گەلێ سنوردارە و لە باریی شارستانیەت لە سنورەکانی دا هاتوچۆ ناکات .

خێڵە یەهودییەکان لەگەڵ ئەوەش دا کە هێشتا پەرەوازەن و دەکرێت بوترێ کە هێشتا نیشتەجێ نەبوون و ئێستاکە سەر زەمینی فەلەستین ( ئیسرائیل) یان بۆ خۆیان کردۆتە دەوڵەت ... بەڵام خووی یەهودی هێشتاکە خووی مرۆڤی سەرگەردانە " ئەو بێ قەرارییەی کە بەڕوویەکی والا باشە خوازی بوو هێشتا لەودا ماوە ، گریمان کەمێك سەرکوت بوبێت ... لەبەر ئەمە کەمێ درەنگ گەیی یە بەدی هێنانی هونەرە بەرجەستەیی یەکان " ئەو هونەرەش کە یەهودی بەدیی دەهێنێت هونەرێکی تایبەتە .

ئەو ڕێژەی کە فۆرم = شکڵ — لە هونەری ئاریایی دا هەیەتی لەم هونەرەی یەهودی دا بەدی ناکرێت " ئەم هونەرە لەو شتانە خۆی پرهێز دەکات کە جیاواز و ئێستایین . لە بنچینەدا ڕۆمانتیکییە و لە ڕۆمانسی بوونی خۆی شەرمەزار نییە . لای ئەم هونەرە ، وێنەکێشان هۆکاریێ نییە بۆ دەربڕین — ی جیهانی دەرەکی ، بەڵکو هۆکارێکە بۆ رەنگپێدانەوەی ناوەڕۆکی ویژدان — وە بەم هۆیەیە کە جۆرە ڕەسەنەکانی هونەری تاکەکەس — واتە هۆنراوەیی و سیمبولیزم — بەکار دەبات .

## 80 – هۆنراوە = هۆنینەوەی و سیمبولیزم =

## Lyricism and Symbolism

سمبولیزم شتێ نییە مەگەر هونەری هەڵبژاردنی لێکچواندنی بیرە ئەبستراکتییەکان وەك ( کۆتر نیشان دان بەمانای ئاشتی ) " وە لە شیعر دا بە ڕادەیەکی تەواو ئاشکرایە . بەڵام کاتێ دەربارەی غەزەلیات لە وێنەکێشان دا دەدوێین ، وەك ئەمەیە کە وتووێژێکی ترسناکمان تێکەڵ بەیەك کردبێت .

لەڕاستی دا کاتێ کە وشەی = هۆنینەوە = تغزل " لە تۆژینەوەی وێنەکێشان دا بەکار دەبەین ، لێکچواندنێ بەکار دەبەین ... هۆنینەوە لە شیعردا ڕوویەکی ڕاستەو خۆیە بۆ بەیان کردنی حاڵەتێکی سۆز بەخش " واتە ئێمە ناتوانین ئەم جیاوازییە بەشێوەیەکی

ماقوڵ و بەڵگەدار ئاشکرا بکەین " تەنها بە هاوڕێژەی سۆز بەخشی وشەکانەوە پاپەندین "
مانای ڕاستی ( لە بەرامبەر هێمایی ) وشەکان دەکرێ پشت گوێش بخرێت .

ووتی کە بە باڵ و پەڕێ من پەرو باڵت نادەم
لە داوای باڵ و پەڕت لەهەر شت پەڕوباڵ بووم

لەسەر ئەم بابەتە ئەگەر بمانەوێت نمونەی ئەم شێوەیە لە وێنەکێشان دا بەکار بەرین ، شتێکی هاوشێوەی بەرهەمی شاگاڵ چنگ دەخەین — واتە ئەو تابلۆیانەی کە تیایان دا هارمۆنی لە لەرینەوەی ڕەنگەکانی کەوان = ئاوێزە — بەدیدێت . وە ڕەنگەکانی تابلۆ لە سۆزەکانمان دا بەهەمان شێوەی ڕوون نەکراوە کاریگەری دەخاتەوە کە بیستنی وشەکانی غەزەلێك هەمان ڕۆڵ دەبینێ .

ئەم ڕەنگانە ڕەنگەکانی هیچ دیمەنێکی سروشتی نییە ، بەڵکو زادەی جیهانێکی خەیاڵی ناخود ئاگایە ، جیهانی گوڵ و بولبول و پیرەمێردە ترسێنەرەکان و بورجی ئیڤڵ جیهانی تیشکی خۆر و گیانداراني باربەر — جیهانی ئەو وێنانەی کە دەتوانن بینگەی هونەرمەند والاّ بکەن و چالاکیی ئافەریدەکانی بەیان بکەن .

## 80 – یەکەم ئیکسپریسیونیزم و ئایدیالیزم –

دەربڕین = Expression = بەیان کردن لە هونەری نوێ دا وشەیەکی گرنگە ... ماناکەی زیاتر لەوە نادات بەدەستەوە کە پێشتر دەربارەی شاگاڵ بەکارمان برد ... واتە یانی دەربڕینی هەستیاری دەرونی ... بەلاّم لە دەربڕینی یان نواندنی وەهادا هەموو شتێك بەمەوە پەیوەستە ، ئایا ئێمە ڕێز لە هەستیاری دەگرین و پەیوەند نین بە جیهانی دەرەکی یەوە کە بانگەواز کەرمانە " یان ڕێز لە جیهانی دەرەکی دەگرین ( لە دەستورو بڕیاردراوەکان ) و شێوەی بەیانکردنمان بەپێی ئەو دەستورانە جێ گۆڕکێ پێ دەکەین .

لەسەر بنچینەی گریمانەی پێشو قوتابخانەیەکی تەواو لەهونەری نوێ بەدی هاتووە کە نازناوی قوتابخانە ی " ئیکسپریسیونیزم " یان پـێ داوە واتـە دەربـڕین کـاری یـان بـەیان کاری .

ئیکسپریسیونیزم وشـەیەکە وەك ئایـدیالیزم و ریـالیزم گرنگـی بنـچینویی خـۆی هەیـە سودی ناوەندی نییە ... ئەم وشەیە سودبەخشە لە بوارێکی بنچینەیی پەی بردن و دوپات کردنەوەی جیهانی دەوروبەرمان .

مـن لـەو بـاوەڕەدام کـە تـەنها ئـەم سـێ ڕەوتــە هــەبێت — ریـالیزم و ئایـدیالیزم و ئیکسپریسیونیزم ... هەڵبەتە ڕەوتی ڕیالیستی نیـازی بـە ڕونکردنـەوە نییـە " لـە هونـەرە بەرجەستەییەکان دا ئەم ڕەوتە بریتییە لە کۆشش لە پێناوی دوپاتکردنەوەی جیهـان وەك خۆی ، لەهەمان شێوەیدا کە لەبەر چـاومان دا دەردەکـەوێت ، بـەبێ کـەمی و زۆری ، بـێ پێوەنان و ڕاستکردنەوە .

ئەم هەوڵەش بەو شێوەیەی کە ڕەچاو دەکرێت سادە نییە ، ئەم خاڵە لە شێوازی وەك ئیمپریسیونیـستەکان دا بـەدی دێـت کـە بنــچینەی زانـستیی دیـدەگای سـادەی مرۆڤــی گومڕاکردو هەوڵی دا کە لە نەخشاندنی سروشت دا بەسەرنج تر و پڕسەرنج تر بێت .

ئایدیالیزم کە لەوانەیە لە هونەرەکانی وڵاتانی تردا پەیڕەوی کـراوە ، لەسـەر بنـچینەی دیدێکی ڕیالیستی دەست پێ دەکات ، بەڵام خۆویـست و مەبەسـتدارانە ڕاسـتییەکان ڕەت دەکاتەوە و پەسەندیان ناکات .

لەسەر ئەمە پێناسەی کلاسیکی ڕینۆڵدز " لە هونەری وێنەکێشان دا لەپای ئەوەدا کـە بەگشتی بەلاسایی کردنەوەی سروشت ناودەنرێـت ، شـێوازی بـاڵا بـوونی هەیـە ... گـشت هونەرەکان کەماڵی خۆیان لە جوانییەکی باوەڕییەوە وەردەگرن ، کە باڵاترە لەوەی کە لـە سروشت دا تاکانە چنگ دەکەوێت . "

ڕینۆڵدز لەهەمان وتاریدا ( وتاری سێ یـەم ) دەڵێـت : " کـاتێ کـە هونەرمەنـد تـوانیی خەوش و لەمپەری زیادە و کەم کورپییـەکانی شـتەکان لـە شـێوە و شـکڵی گـشتی خۆیـان

جیابکاتەوە، لە شکڵەکانیان بۆچونێکی ئەبستراکتی بەدی دەهێنێت کە لە کۆی یەکـەکانی شتە بنچینەییەکان کاملترە . "

تێبینی دەکەین کە ئایدیالیزم بناغەیـەکی هـزری هەیـە " بـە ڕوانگـەی ڕینۆلـدز هـەمان شکۆمەندی هزرییە کـە هونەرمەنـد لـە پیـشەگەر جیـا دەکاتـەوە ... دەتـوانین بڵـێین کـە ریالیزم زادەی هەستەکانە " ڕیالیزم ئـەو بابەتانـەی کـە حەواسـەکان دەرکـی پـێ دەکـەن بەڕاستگۆترین شێوەی شیاو ڕێك دەخات ... بەڵام دەرونی مرۆڤ لایەنی دیکەشی هەیە کە ئێمە بە سۆزەکانیان ناو دەبەین و ئەو داناییە بنـچینەییەی تـری هونـەر هاوتایـە بەهـەمان سۆزەکانەوە .

ئیکسپریسیونیزم هونەرێکە کە هەوڵ نـادات ڕاسـتییە بینراوەکـان وێنـە بکێـشێت یـان ڕەنگیان پێ بداتەوە و هەوڵی وێناندنی ئەبستراکتی ئەو ڕاستییە سروشـتیانەش نـادات ... بەڵکو کۆششێکە بۆ وێنەکێشانی هەستە زەینی یەکانی هونەرمەند .

بەناونیشانی شێواز " ئەم شێوازەی ئیکسپریسیونیزم هێندەی هەردوو شێوازەکەی تر گرنگیی هەیە و لـە سـەردەم و سـەرزەمینی جیـاوازدا ئـەم شـێوەیەی دەربـڕین بـاوترین و شیاوترین شێواز بووە .

گــەورەترین نمونــەی هونــەری ئایدیالیــستی ئەوانــەی کــە پەیوەنــدن بــە شــێوازی کلاسیـسیزمی یۆنانییـەوە : پراکـسیتلیس ، فـدیاس = Pheidias ، دۆنـاتیلۆ =Donatello ، ڕافائیل پوسین ، ڕینۆڵدز ، سیزان گشتیان لە کۆمەڵـەی هونـەری لـەو تـەرزەن . بـۆ ئـەو کەسانەی کە خۆیان زیاتر پەیوەستە بە هۆگربوونەوە " ئەمـە بـاڵاترین نمونـەی هونـەرە ، ئەوەی ئەم جۆرە کەسانە ئامادە نین پەسەندی بکـەن ئەمەیـە کـە هەنـدێ لـە بەشـەکانی هونەری نوێ دا " وەك کـۆبیزم و هونـەری ئەبـستراکت" بـەواتای ڕینۆڵـدز بـیری ڕووتـن یـا ڕوتکراوەن لەو شتانەی کە لەهەر شتێکی تری تایبەت تەواوترو کامڵ ترن .

هونەری یۆنانی قۆناغێکی ریالیستیشی هەیە " بەلاّم ئەم جۆرە هونەرە لە هونەری میسری و رۆمی بەتواناترە ... یەکێ لە قۆناغەکانی رێنیسانسی ئیتالیا ، هونەری ریالیزمی پەیرەو کردووە ، بەلاّم لە هونەری ئەلّمانیا و هۆلّەندی دا زیاتر بەدی دەکرێت .

لەلایەکی ترەوە مرۆڤێکی تەواو میدیتیرانە، وێنەی ئالگریکۆ " ئیکسپریسیونیستییە " و هیچ هونەرێکیش بە ئەندازەی هونەری رەشپێستەکانی ناوچەگەرمە سێرەکانی ئەفریقیا ئیکسپریسیونیستی نییە .

لە ئیسپانیا ش هونەرێکی ئیکسپریسیونیستی بلاّوە ( بۆ نمونە بەرهەمەکانی موراليس = Morales — ی پەیکەرساز ) و لە ئیتالیا دا دەست خستنی ئەم جۆرە هونەرە دژوار نییە .

بەلاّم بەرجەستەترین بەشەکانی هونەری ئیکسپریسیونیستی لە باکوردا دەشێ پەیدا بێت — و بالاّترین نمونەی ئەم تەرزەی هونەر — میحرابی ئایزنهایم = Isenheim — کە کاری — گرونوالد = Grunewald — ە کە ئێستاکە لە کولّمار = Colmar — دەپارێزرێت .

هونەرمەندی وەك بروگل لە نێوان ئیکسپریسیونیستەکان و ریالیزمدا تۆمار دەکات ، بەلاّم بوش و پەیرەوانی ئەو لە بنچینەدا ئیکسپریسیونیستن .

## 80 — دووەم — رێبازی ئیکسپریسیونیست —

شێوازی ئەلّمانیی هونەر ، وەك شێوازی ئینگلیزیی هونەر کە ریشەی هاوبەشی پێوەی هەیە " لەبنچینەدا هونەرێکە رۆمانتیکی .

بەلاّم شێوازی رۆمانتیك لە سەرانسەری جیهان دا بلاّوبۆتەوە و لە هەر ژینگەیەکدا رەنگوبۆیەکی دیی هەیە .

لە ئەلّمانیادا ئەم رەنگەی دی دەشێت چاتر لەهەر شتێکی تر بە وشەی " زیاترو بەر بلاّوتر transcendental " دەتوانین پێناسە بکەین .

تاوەکو ریالیزم — یش لە وێنەکێشانەکانی ماکس بێکمان = Max Beckmann – 1884 – 1950 — دا بوارێکی " بەربلاّوتری " لەخۆگرت " .

پێناسەی ڕوکەشی بەربلاو بوونیان هەیە کە شێوازی هونەری ئەڵمانی یا باکوری لە شێوازی میدیتیرانەیی یا فەڕەنسەیی جیا دەکاتەوە ... بەلاّم قەریحەی باکوری لە بەرامبەری خودی شێوازدا پەرچەکردار نیشان دەدات و دەگەڕێتەوە ناو دەرونی خۆی و دەبێتە وەلاّمدەرەوەی پەیامەکانی ویژدانی تاکەکەس ئەم خاڵەش لە هونەردا بەئەندازەی ئایین و فەلسەفە ڕاستە ...وەك كونرادر فیدلەر = Conard Fiedler گوتویەتی لەشێوازی باکوری دا خودی هونەر بەشێوەی تەرزێکی دیدەیی ناسراو ، هەوڵێکی نواندنی بۆ بەیانەکانی مرۆڤ لەگەڵ جیهان دا بەدی دەهێنێت ... لەم شێوازەدا لە ڕاستی دا هەر جۆرە هۆیەکی وێناندن شیاوە و ڕێگەی پێ دەدرێت — لە ڕیالیزم دا ئادۆڵف فۆن مێنزڵ = ) 1905 -1815 ) = Adolf van Menzel) و هانس تۆما ( 1924 -1839– Hans Thoma) — و سیمبولیزم : ئارنۆڵد بوکلین = Arnold )Boclin 1827-1901) و هانس فۆن ماریٚ = ) Hans van Marrees – (1837-1887) — وە ئیمپریسیونیزم : لویس کورینت = )-(1858– Lovis Corinth 1925) و ماکس سلفوکت = Max Slevogt (1868-1932) و ماکس لیبرمان = Max Liebermann- (1847-1936) تاوەکو ئیکسپریسیونیزمی ئەبستراکتی ڤاسیلی کاندینسکی = Wassily Kandinsky — ( کە ڕوسی بوو بەلاّم زوربەی ژیانی لە ئەڵمانیا کاری کرد ) و وێنەکێشانە ئەبستراکتییەکانی دوایی فریتز وینتەر Fritz Winter ( لەدایکبوی 1905) و تیودور وێرنەر = Theodor Werner ( لەدایکبووی 1886 ) و ئەرنست ویلهەلم نی = Ernst Wilhelm Nay = ( لەدایکبوی 1902) ... لە کۆی ئەم ڕەوتانە دا لەگەڵ ئەوەدا کە شێوەی کاریان جیاوازە ، لە پێناوی نیشان دانی چۆنێتی بنچینەیی هونەری باکوری دا مرۆڤ ناچارە بۆ وشەی " ئیکسپریسیونیزم: بگەڕێتەوە.

ئیکسپریسیونیزم وەك زوربەی ئەو وشانەی بۆ پێناسەی قۆناغەکانی هونەر بەکار دەبرێت ،وشەیەکی ئاڵۆزە ... بەلاّم لە بوارە تایبەتەدا مانای ڕاستەقینەی ووشەکە لەبارترین مانایەتی .

هونەری ئیکسپریسیونیستی هونەرێکە کە فشارێکی یا پێداویستییەکی دەرونی ئازاد دەکات ...ئەم فشارەیش لەپای هۆکارێکی سۆزی یا هەستییەوە بەدی دێت و بەرهەمی هونەریش لەشێوەی دەربازبوون دا بەدی دێت یان دەرچەیەکە بۆ هاوسەنگی بەدی هێنان کاتێ لەژێر کاریگەری دەرونیی بەرگە نەگردا مرۆڤ بەیانی خۆی دەکات.

ئازاد کردنی توانای دەرونی بەم شێوەیە شیاوە کە دیاردە و بابەتە سروشتییە یەکان بە جۆرێك بگۆڕێت کە دزێو وەڕو بکەوێت ... کاریکاتۆر جۆرە ئیکسپریسیونیست — ێکە ، جۆرە دەربڕینێکە کە کەمتر مرۆڤ دادەمێنێ لە تێگەیشتن و هەرسکردنی ماناکانی .

بەڵام هەمان کاریکاتۆر کە لە کۆمپۆزیشن و ڕێکخستن دا لەسەر تابلۆیەك بەڕەنگی ڕۆن بەدی دێت ، بینەرێ کە خووی گرتووە بەشێوازی کلاسیك و ئایدیالیزم دوچاری تووڕەیی دەکات.

ئیکسپریسیونیزم — یێ کە هاوپەیوەست بێت بەم شێوازەی ڕۆمانتیکەوە ، وای ڕاناگەیەنێت یا پروپاگەندەی ئەوە ناکات کە هەر جۆرە بەیان و بارێکی دەرونی ( یان هەر ئیکسپریسیون — ێك ) هوونەرە .

هەرچەندە بندیتۆکرۆتشە لە داوەریدا هونەری بەهەمان مانا پێناسە کردووە . مەبەست لە " بەیان = دەربرینی حاڵەت " بەو مانایەی کە لەم باسەدا بەکار دەبرێت ڕەنگدانەوەی خۆ بەخۆی هەستەکان نییە ، بەڵکو زیاتر مەبەست لە ناساندنی یا پێناسەی وێنەیی یان ئەو شتانەیە کە بەرجەستە کەری هەستەکان بن .

ئەم جیاوازییە کە لەڕوانگەی جوانناسی کرۆتشەوە گرنگییەکی بنچینەیی هەیە ، لەوانەیە لە تۆژینەوەی ئامادەمان دا کۆسپمان ئاسان بکات .

یەکێ لە ڕۆشنترین شاکاری ئەم تیۆرییە لە کتێبی " جوانی چییە " دا باس کراوە کە ا ی . ئێف کاریت = E.F.Carrit — نوسیو یێتی .

" لەوانەیە پێویست بێت کە بەیان ( "ئیکسپریسیون" ) لە هەنگاوی یەکەمدا لەشتەکانی دی کە ئاسلیی تێکەڵی دەبن جیابکەینەوە ... یەکەمیان بەیان نیشانە نییە

... دەشێت هەستەکانی مرۆڤ نیشانە یا تەگەرەیەکیان هەبێت کە تایبەت بن بەخودی شوێن باس... یان دەشێت دکتۆر یاخود بینەر بتوانن پەنجەی بۆ درێژ بکەن ، بەڵام ئەوانە بەیان (ئیکسپریسیون )نین.

زریکە یاخود هاوار بەخودی خۆی بەیانی دەرد و ئازار نییە ، هەرچەندە نیشانەی ئازارە ... ئەم نیشانەیە دەشێت لەبەیانی ئازایش دا بەکار ببرێت ... ئارەق کردنەوە یان گۆڕانی لێدانی تەپەی دڵ بەیان نییە ... چونکە بەیان بریتییە لە بارێکی هەست پێکراو یا خەیاڵی کە ئێمە تیایدا دەرك بکەین ( نەك قولّبببینەوە ) . دووەمیان بەیان لە تۆمارو گواستنەوە جیایە ، بەیان دەشێت دەربڕینی کەم و کوڕی خۆمان بێت ... نیشانەی پاراو ، وەك هاوار ، دەشێت ترسمان بەوانی تر بگەیەنێت ( بگوێزێتەوە ) : یا بەشێوەیەك بیستەر کوێرانە بتوقێنێ و بەم شێوەیە بە بیستەری ڕابگەیەنێت کە ئێمە دوچاری ترسان هاتووین : لەهەر دۆخێکدا زریکەمان بەپێی پێویست بەیانکەر نابێت . چونکە ئەمە کە بەیانە – بەمانای تەواوی وشە – سمبل – یس نییە ( هێما ) ... چونکە سیمبول نیشانەیەکی دروستکراوییە ، کە مانای شتێکی بڕیاردراو دەدات کە ئێمە نامانەوێت بیزانین مەگەر ئەوەی کە بزانین بڕیار لەسەر ئەوە دراوە کە ئەو مانایەی هەبێت . "

ئەو بەیانەی کە ڕوویەکی هونەری هەیە ، بەو مانایەی کە کرۆتشە دەیڵێت : یانی خوردبوونەوە لە هەستەکان دا ( یاد هێنانەوەی هەستەکان لە کاتی بەتاڵ دا ) نەك ئەو چالاکییە دەرونییەی کە سەر بە خودی هەستەکانە –

بۆچونێك هەیە بەربلاّوتر لەو بۆچونەی کە ئێستاکە خستمە ڕوو . بەیان بەم مانا بەربلاّوترە بناغەی ئایدیالیزم و ڕیالیزم و ئیکسپریسیونیزمە ... بەلاّم بەڕوانگەی من دەشێت بوترێت لەو جۆرەی هونەردا کە بەگشتی بە ئیکسپریسیونیزم – ناو دەبرێت – شێوەی بەیان بە چاوگی هەستەکان نزیکترە ... لەم بارەیەش دا هەستەکان شایەنی خوردبوونەوەی دەبن ، بەلاّم نەك لەزەمینەیەکی فەلسەفی دا کە ڕوونی دەکاتەوە جیهان چییە ، یان دەبێ چی بێت .

# 80 – سێ یەم – کاندینسکی

ئیکسپریسیونیزم بەناوی تەوەرێکی ناسراوەوە لە هونەری نوێ دا ، بەشـێوەیەکی خـۆ بەخۆ لەلایەن جۆرەها هونەرمەندانی جیاواز و دەستە و تاقمەوە لە دەیەمی بەر لە جەنگی جیهانی یەکەمدا لە سەرتاسەری ئەڵمانیادا وەڕوکەوت .

بەمەی کـە دەڵێم بەشـێوەیەکی خۆبـەخۆ " مەبەسـت لەمەنییـە کـە ئـەم تـەرزە هـیچ پەیوەندی یەکی بەشێوازەکانی پێشوترەوە نییە ... ئەم ڕەوتە بەری شێوازێك بوو کە بەر لەوە لە هونەرە بەکاربراوەکان دا سەری هەڵدابوو و لە ئەڵمانیا بەناوی " یوگنداشـتیل " = Jugendastil – و لـە فەڕەنـسا و بـەلجیکا دا بـەناوی " هونـەری نـوێ = Art Nouveau " دەناسرا .

ئەم شێوازەش بەشبەخۆی زادەی شێوازێك بـوو کـە بەیاریـدەی راسـکین و مـوریس = Morris لە ئینگلتەرە و بەیاریدەی میکینتوش =Mackintosh – ی بیناکار لە سکوتلەندە لە هونەر و پیشەسازی دا بەدی هاتبوو .

کـارە سـەرەتایی یـەکانی کاندینـسکی پەیوەندییـەکی نزیکیـان لەگـەڵ شـێوازی " یوگنداشتیل " دا هەبوو و پاشان کاندینسکی بووە کارگێڕی بنچینەیی ئیکسپریسیونیزمی ئەڵمانیا .

کاندینسکی 1866–1944 هەمان شێوە کە پێشتر پەنجەمان بۆ ڕاکێشا ڕووسی بوو ، بەلاّم لە 1896 بەدواوە لە میونیخ ژیاو بووە قوتابیی فرانتس ڤان شتوك = Frantz Von Stuck . کە پێشەوای ڕەوتی " یوگندا شتیل " ی سەردەمی خۆی بوو .

کاندینسکی و هونەرمەندێکی تری ڕووسی کە لە میونخ دەژیا بەناوی – ئەلێکسی ڤان یاولێنـسکی = ( Alexei Van Jawlensky 1864- 1921) دەسـتوبرد کارتێکـەریی هونەرمەنـدانی فەرەنسایی وەك سیزان و ماتیس – یان قۆستەوە .

لـە سـاڵی 1910 – دا بەرهەمـەکانی پیکاسـۆ و بـراك = Braque و رییـو Rouault لـە میونخ پێشان درابوون " بەڵام لەو کاتەدا کاندینسکی ئایندەی چارەنوسی هونـەریی خـۆی پەی رێژ کردبوو و باوەڕەکانیشی لە کتێبێکدا بەناوی " هونەری هارمۆنیی گیانی " = The Art of spiritual Harmony – نوسیبوو ، ئەم کتێبە لە ساڵی 1910 دا نوسـرابوو بـەڵام لـە ساڵی 1912 کەوتە ژێرچاپ .

لەوانەیە کاندینسکی بە بەهرە وەرگرتن لە هەندێك لە جوانکارییەکانی " یوگنداشتیل " بە بۆچونێکی نوێ وە بە وێنەکێشانی نا دیدەیی گەیشت کە لەساڵەکانی 1910– 1913 پـەروەردە بـوو ... لـەو کاتـەدا شـێوازی کوبیـست لـە پـاریس ڕەواجـی هـەبوو ، بـەڵام کاندینسکی لە کارتێکـەری ئـەودا واتـە کوبیزمـدا کـەم و زۆر کـەنارگیریی کـرد و گـەیی یـە شێوازێکی خوودی کە ناوی " هونەری پێداویستییە ناوەڕۆکییـەکان " کـە تیایـدا ڕەنـگ و هێڵ بۆ نیشان دانی بارودۆخی " گیانی " بەکاردەبران ...

کاندینسکی لە بۆتـەی ئـەم ئەزمونانەیـدا ، کـۆی پلـە ئەبستراکتییەکانی کـە هونـەری وێنەکێشان لە توێی چل سـاڵی دوایـی دا لـە پێـشی دا بـوو " پێـشبینی کـرد ... لەوانـە " تاشـیزم " = tachism = وێنـەی جوڵـەیی = action painting – ئـەمڕۆ لـە نێـوان ئـەو ڕێگـە فراوانانەی کە بەم شێوەیە لە بەردەمی وێنەکێشان دا کرایـەوە " کاندینـسکی ڕێگەیـەکی هەڵبژارد کە بە کۆمپۆزیشنی هارمۆنی گەلێ بەسەرنج و پێوانە کـراو دەگـەیی ,,, لـە نێـوان کۆی بەشەکانی هونەری نوێ دا ، وێنەکانی کاندینسکی زیاتر نزیك بوون لـە هاوڕێژەیـەکی بەرجەستەیی هونەری مۆسیقا – وە .

## 80 – چوارەم – گروپی پرد و گروپی سواری شین –

لەم بارودۆخەدا ، لەبەشەکانی دیکەی سەرزەمینی ئەڵمانیا دا بەسەرهاتی دی لە ڕودان دا بوون لـە ژێـر کارتێکـەری هاوبەشـی ئێـدوارد مونـك = Edvard Munch کـە هونەرمەنـدی نەرویجی بوو ، پاشان کوگان و ڤان کوخ " وێنەکێشانی وەك پاولا مودرزون بێکـر = Paula

Emil Nolde = (1876 – 1954 =) و ئـەمیل نۆڵـدە (Modersohn Becker = (1876- 1907)و کریـــستیان ڕۆلفـــس = Christian Rohlfs . ســـەرگەرمی بـــەدی هێنـــانی جـــۆرە ئیکسپریسیونیزمێکی پەیکەری = figurative exprisionism — بوون .

ئەم سێ ئەندامە وێنەکێشی تەنها بوون کـە زوربـەی تەمـەنیان بـە گۆشـەگیری کاریـان دەکرد ، بەڵام لە ڕووی مەیلدارێتییـەوە کـە لـە هونـەری خۆیـان دا بـەیانیان دەکـرد تـەنها نەبوون .

لە ساڵی 1905 لە شاری دورسدن گروپێك پێك هات کە پاشان بە گروپـی پـرد = Die Brucke ناوی لێ نرا ... ڕابەرانی ئەم گروپە بریتـی بـوون لـە ئەرنـست لودڤیـك کریـشنەر = Ernst Ludwig Kirchner = 1880- 1938 — و ئێـریش هیکـل = Erich Heckel = لـە دایکبـووی 1883– و کارل ئیشمیت ڕوتلۆف = Karl Schmidt –Rottluff= لـە دایکبـووی 1884 – و پاشان ماکس پکشتاین = —Max Pechstein =1881- 1955— و ئوتو مولەر = — =Otto Mueller= 1874- 1930— پەیوەندییان بە هەمان گروپەوە کرد .

گروپـی پـرد تـەنها هەشـت سـاڵ بـەردەوام بـوو ... بـەڵام لەهـەمان مـاوەی کـورت دا شێوازێکی نوێیان بەدی هێنا ... لە ڕوانگەی مێژووییەوە ئەم شێوازە دەشێت بـە شـێوازی فوبیزم لێکچوێنرێت ... بەڵام وێنەکێشانی ئەڵمانی شێوازی بەیانکەری خۆیان تـا ئەوپـەڕی ڕادە و تا ڕادەی توندوتیژی بەرەو پێش برد ... ئەمەش لە گەڵ بارودۆخی بـەیان کارانـەی لەبارو گونجاوی ماتیس و دۆرن تەواو جیا بوو .

لە نێوان فەرەنسییەکان دا تەنها ڕیئۆ و لە نێـوان بەلجیکییـەکان دا کۆنـستان پرمـك = Constant Permeke و جوستاف دو سمیت = Gustave de smet — و فریتس ڤـان دان بـەرگ = Frits vanden Bereghe — و فلوریس یەسـپەر = Floris Jespers — بەجموجۆڵییـەکی پـڕ تواناوە لە گروپی پرد نزیك بوونەوە .

بەڵام ئەو گروپەی کە لە دیسەمبەری ساڵی 1911 دا لە میونخ لەدەوری کاندینسکی و یولینسکی کۆبوونەوە ، ناوی خۆیان نا گروپی سواری شین = Blaue Reiter – ... لەم ڕووەوە تەواو جیاواز بوون .

شێوازی یولینسکی دەشێت لەگەڵ شێوازی پرد دا پەیوەندی هەبێت ، بەڵام گرنگترین کەسانی ئەم گروپە نوێیە واتە فرانتس مارک = Frantz Marc(1880- 1914) و ئەوگست ماکیّ= ( August Macke = 1887- 1914) و پۆڵ کلەی = Paul Klee(1879- 1940) زۆر بەتوندی لەژێر کاریگەریی ڕۆبرت دیلونە = Robert Delaunay – دا بوون ( کە ماکیّ و کلەی –یش لەگەڵ ئەودا پەیوەندی ڕاستەوخۆیان هەبوو ) و هەروەها لەژێر کاریگەری غەزەلیاتی وێنەکانی ماتیس دا بوون .

لە ساڵی 1914 ماکیّ وپۆڵ کلەی سەفەریان کرد بۆ تونس ، ئەم سەفەرە بۆ ئەوان ئەزمونێك بوو کە لە وان دا مەیلدارێتی ڕۆژهەلاّتیی پڕ هێزتر کرد . مارك هەستێکی بەهێزی هەبوو بۆ تۆماری وێنەی زیندووی پەیکەری گیانداران .ئەم و کلەی هەردوکیان سرۆشیان لە جوانیی سروشتییەوە وەردەگرت و لە یاری خۆرەتاو و لەسەر گڵ و گیاکان شاگەشکە دەبوون و دەیانویست کۆی ئەم جوانییانە لەسەر تابلۆکانیان ڕێك بخەن .

بەڵام بەداخەوە کە ئەم دوو هونەرمەندە لە جەنگی جیهانی یەکەمدا کوژران .*

وە لە زەخیرەی گەنجی پڕ جۆش و خرۆشی ئەم دوو هونەرمەندە کە توانیویانە بە شارستانیەتی ئێمەی ببەخشن تەنها چەند نمونەیەکیان بەجیّ ماوە کە بەش بەخۆیان بونەتە جیّ مقۆ مقۆی خەڵکی .

* دەشیّ نووسەر مەبەستی لەوەبێت کە کلەی لە جەنگی دووەمی جیهانی دا کوژرا بێت ، چونکە ساڵی کۆچی دەکەوێتە 1940 –ڕونکردنەوەی وەرگێڕ–ك .

## 81- پۆڵ کلەی

پۆڵ کلەی لە 1879 لە لادێیەکی نزیك سوێس – سویسرا – هاتۆتە دونیاوە باوکی مامۆستای مۆسیقا بوو، لە میونخ دەستی بەخوێندن کردووە و چووە بۆ ئیتالیا و تونس .

بەر لەشەڕی یەکەمی جیهانی زیاتر لە میونخ وپاریس ژیانی بەسەر دەبرد ، لە ساڵی 1921 لە باوهاوس = Bauhaus بووە مامۆستا... باوهاوس جۆرە " تاقیگەیەکی " دەستوری هونەری ئەزمونی بوو کە لە بناغەدا لە ڤایمار= Weimarپێکهێنرابو، بەلأم لەساڵی 1925 گوێزرایەوە بۆ دیساو = Dessou.

من چەند هێڵکارییەکی بیناکاریی پۆڵ کلەی – م بینیوە کە لە ڕوانگەی سەرنجی بەهێز و جوانییەوە بە دژوارترین تاقی کردنەوەی زانکۆیی دەژمێردرێت . کلەی وێنەکێشێکی زبر دەست بوو " دەشێ پێویست بکات کە بەر لە گەیشتن بە چییەتی بەرهەمەکانی ئەم خاڵە ڕوون بکەمەوە .

پێویستە کلەی لە کۆی ئاڕاستەکانی هونەری نوێ ، بەتایبەتی لە ڕەوتەکانی وەك کوبیزمو ئیکسپریسیونیزم و فوتوریزم = فیوچەریزم = داهاتوو گەری – جیا بکەینەوە ... هەندێ جاریش گروپێ لە فەڕەنسییەکان کلەی بە " سوریالیزم " و بەشێ لەخۆیان دەژمێرن " بەلأم ئەگەر مەسەلەیەکی گونجاو لە کایەدا بێت " ئەوا دەشێ بڵێین کە سوریالییەکان بوون لە کلەی – یەوە سرۆشیان وەرگرتووە ... نەك کلەی لە سوریالییەکان.

کلەی تاکانە ترین کەسی هونەری نوێیە ، ئەویش وەك شاگاڵ جیهانی تایبەتی خۆی ئافەریدە کردووە – کە جیهانێکە لەگەڵ گیا و گیاندارانە سەیرەکانی خۆی و یاسای پریسپێکتیڤ و لۆژیکی تایبەت بەخۆی – لەم جیهانەدایە کە پۆل کلەی دەژیا و هەستی دەکرد ... لە هونەری کلەی دا هیچ شتێ کە لە مەبەستی پێکەنین هێنەر یا مەلول دار بێت

بـوونی نییـه و جێگـەی نابێتـەوە " هونـەری کلـەی هونەرێکـە غـەریزی و خـەیاڵ ئـامێز بەڕوویەکی دڵ سادە و دیدەیی .

هەندێ جار منداڵانە بەرچاو دەکـەوێت ، هەنـدێ جـار سـەرەتایی و هەنـدێ جـاری دی شێتانە " بەڵام لە ڕاستی دا هیچ یەکێ لەم پێناسانە نییە ، و چاترین ڕێگەی نزیکبونەوە لە هونەری کلەی ئەمەیە کە ئەو لەم بەشە دیاری کراو ناسراوانە جیابکەینەوە .

هەندێ لە وێنەکارییەکانی کلەی زۆر بەئاسانی دەشێت بە وێنەی منداڵانـە لێکـچوێنرێت لـە ڕووی سـادەیی و ناسـکیی هێڵـەکان و هەسـتیاری و تێبینیـی ناگـەهان و هەندەکییـە گرنگەکان و خـەیاڵی ئەفسون کەرانـەی کارەکـانی ( وێنـە 63 ) زیـاتر لـە کـاری منداڵانـە دەچن . بەڵام کارەکانی کلەی جیاوازییەکی گەلێ گرنگیشی لـە گـەڵ کارەکـانی منـداڵان دا هەیە " ئەویش ئەمەیە کە کارەکانی کلەی ژیرانەن و بۆ بینەری ڕۆشنبیر وێنەکێشراون و بۆ ئێمە کێشراون .

هێڵکاری منداڵێك ( بەلای کەمەوە کە منداڵ ئـەو هێڵکارییـە بەباشـی وێنـە دەکێـشێ ) تەنها بۆ خودی منداڵە کە کێشراوە و دەکێشرێت ... دەشێ منداڵ لـە جـوانی و سـەیری و دەربڕینی دوچاری سەرسوڕمانمان بکات ، بەڵام خودی منداڵەکە باوەڕی وایە کە وێنـەکانی سادەو سروشتین .

نمونەی هەمان جیاوازی لە نێوان هونـەری کلـەی و هونـەری مرۆڤـی سـەرەتایی — بـۆ نمونە هونەری بوشمان — دا بوونی هەیە .

لە ڕاستی دا دەربڕینی هونەرمەنـدی بوشمـان پەیوەنـدە بەسـیحر و جـادووەوە و ئـەو کەسە گروپێکی هـاوڕازەر ، واتـە خێڵەکـەی خـۆی لـە پـێش چـاودایە ... تـا ئـەم ڕادەیـە هونەرمەنـدی سـەرەتایی جیـاوازە لـە گـەڵ منـداڵ دا ، بـەڵام جیـاوازی ئـەو بـە کلـەی لـە پەروەردە نەبوونی دایە 000هاوڕازەکانیشی هـەمان هاوڕازەکـانی کلـەی نـین — تەنانـەت هاوڕازی ئاییینیش نین — چـونکە هـاوڕازان و بـانگراهێڵانی کلـەی کۆمـەڵێ لـە ڕۆشـنبیرانی تایبەتن . بەهەر ئەندازەیەك کە خـودی کلـەی لـەم بارەیـەوە دڵـی لێـی داوە ، بـەڵام ئـەم

فرمانە دەشێت کاریگەرییەکی ئاگایانەی لەسەر وێنەکێشانەکانی کلەی نەبێت ، چونکە ئەو کەسێکی ڕۆشنبیر بوو و هونەری هەر کەسێك ناچارانە کە چۆنێتی هزری ئەو تێراو دەبێت.

ئەم خاڵەیش جیاوازی هونەری کلەی و هونەری شێت — مان بۆ ڕوون دەکاتەوە . چونکە هزری کەسێکی شێت دەشێت پڕبێت لە وێناندنی هزری " شێتی کەسەکە دەشێت هاوتا بێت بەخەیاڵاتێکی گەلێ شیرین " بەلاّم چۆنێتییەکی پەروەردەیی نابێت ...خەیاڵەکانی کەسێکی شێت شتێکە نەگۆڕ ، یان بەلای کەمەوە لە دەوری خاڵێکی یا بابەتێکی دیاریکراو سوڕ دەخوات" خەیاڵەکانی پۆل کلەی تۆمارێکی بێ کۆتایی یە و لە ئەفسانەی فریشتەکان دەدوێت .

من سوور نیم ، بەلاّم باوەڕم وایە کە کلەی — یش وەکو کۆمەڵەی سوریالییەکان لە دەرونزانیەکی نوێ و پڕ بێ ئاگا نەبووە ، چونکە هونەرەکەی زۆر بە پڕی هاوتایە بە دەرونزانی نوێ .

دەرونزانی وەك فرۆید ئاگایی دابەش دەکات بۆ سێ بەشی : بە ئاگا و نیوە ئاگا و نا ئاگا.

نیوەئاگایی ئەو بەشەیە لە ئاگایی = زەین — هۆشیاریان بە ئاگا نییە بەلاّم بەڕێگەی دەرمانی کە هۆکاری پەرێشانی لا دەبات دەکرێ هۆشیار یان بە ئاگا بکرێتەوە .

بەلاّم لێرەدا لەگەڵ هەمین زەینی نیوە ئاگادا سەرو کارمان هەیە " چونکە ئەم بەشە لە زەین وەك گەنجینەیەکی گەورە وەهایە کە پڕە لە وێناندنی واتایی و کۆبۆوەی یادەکان ... کە هونەرمەندی وەك کلەی خەیاڵەکانی خۆی لەو بەشە یا ناوچەیەی نا ئاگایی یەوە وەدەردێنێت .

هەموومان دەزانین کە زەینی مرۆڤ پڕە لە یادگاریی بێ شومار لە درك کردنی ڕابردوو کە ئەگەر پێکداهاتن ( تەداعی ) لەڕووی دادوەرییەوە لەوان دا بەدی بێت ، دەکرێ دووبارە یاد بکرێنەوە ( کە هەندێ جار شاراوە ماونەتەوە و ڕۆشناییان بەرنەکەوتووە و ڕەنگو بۆیان لە ڕابردوودا زیندووە ... ئەوەی لەسەرمانە لەکاتی بیرکردنەوەدا هۆشیارانە و

بەرێکـەوت دەریـان بـڕین ... هونەرمەنـدیش دەشـێت لـەکاتی وێنـە کێشان دا سـود لـەو نیوەگایی یە ببینێت .

بەڵام کلەی مەیلی نەبوو کە ئەم جیهانەی نیوە ئاگایی یە تێکەڵی ئاگایی بکات " بـەڵکو دەیویست پەنجە بۆ چییەتی تایبەتی ئەو جیهانە شاراوەیە ڕابکێشێت ... ( دەیویست ) لەو جیهانەدا بەسەر بەرێ و جیهانی ئاگایی بخاتە لاوە و لە یادی بکـات ... دەیویـست لـە جیهانی پـڕی یادەکـان و وێنـە ناپەیوەسـتەکان هـەڵبێت... چـونکە ئـەم جیهانـە جیهـانی خەیاڵ و ئەفسانەو داستانە ... هونەری کلەی هونەرێکی سەر و سروشتییە ، پێویستی بـە فەلسەفەیەك بوو نیشان دەرانە ... ڕاستەقینە تەواویی درکانـدنی سـادە نکۆڵی دەکـات ، بینینی چـاوی مـرۆڤ سـنوردار و بڕیـار دراوییـە – یـانی ئاڕاسـتەی جیهـانی دەرەکییـە ... جیهانی ناوەوە جیهانێکی دییە و سەرسوڕێنترە " پێویستە بیپشکنیت ، چـاوی وێنـەکێش ئاڕاستەی فلچەکەیەتی ، فلچە دەسوڕێ و هێڵەکان لە جیهانی خەون دا ڕەوت دەکەن .

## 81– یەکەم – ماکس ئەرنست

سوریالیزم بەناوی ڕەوتێکی هونەری ئەژماردی لە ژمارەی کۆی مەکتەبەکانی هاوچەرخ جیایە ... بـەڵکو لـە ڕاسـتی دا سـوریالیزم لەگـەڵ کـۆی داب و شـێوازە باوەکـانی بـەیانی هونەری دا پەیوەندی دادەبڕێت ... بەم ئاراستەیەی ناچارانە سەخت ترین سەرپێـچی کـەر ڕادەپەڕێنێت ... نەك تەنها هاوکـارانی مەکتـەبی ( ئاکادیمیـك) کـە بەگـشتی دەگەنـە ئـەم بڕیارەی کە ئەم شێوازە بەناوی شتێکی پوچەڵەوە وەدەرنێن ... بەڵکو تەنانەت لـە نێـوان ئـەو هونەرمەنـدان و ڕەخنەگرانـەیش دا کـە نـوێ خـواز دەناسـران دژایـەتییان لەگـەڵ سوریالیزمدا پتەوبوو .

بەڵام ئەو سەرپێچییە کوێرانە لە ڕابردودا هێندە هەڵە کەوتنە ڕوو کە پێویـست دەکـات بەلای کەمەوە بۆ تێگەیشتن لە مەبەست و نیازەکانی ئەم هونەرمەندانە سـوربین لـە هـەوڵ دان ... بۆ ئەم مەبەستەش دەکرێت ماکس ئەرنست و سـلڤادۆر دالی = Salvador Dali وەك نمایندەی شێوازی سوریالیزم لەبەر چاو بگرین .

ماكس ئەرنست ( وێنە 64 ) نزيك لە كۆلۆنی لە ساڵی 1891 لە دایك بووە . لەهەمان سەرەتاوە وێنەكێشانەكانی مەیلدارێتی سیمبولیزمیان نیشان دەدا ... هەروەها لە ڕووی جۆرە هەندەك كردن و وونكردنی هزری یا لۆژیكییەوە كە سەربەخۆی تەوەرێكی سیمبولیزمە ، هونەرمەند گاھ شاعیر بێت یا وێنەكێش یان زانا " سیمبول بۆ بەیان كردنی ئەو شتانە هەڵدەبژێرێت كە لای تێگەیشتنی مرۆڤ شایانی تێگەیین و بەڵگەدارێتین.

هونەرمەند تێ دەگات كە ژیان بەتایبەتی ژیانی دەرونی ، لە دوو ڕوودا بەڕێوە دەچێ " یەكەمیان ئاشكراو بینراوە لە هێڵ و بەشەكانی دا ، دووەمیان كە دەشێ بەشێكی گەورەتری ژیان بێت — پەنهان و ئاڵۆز و نادیارە ... مرۆڤ وەك یەك كێوی بەفرین لەباوەشی شوێن دا دەبزوێت ... تەنها بەشێك لەو لە ناوەڕۆكی هۆشیاری دا جمەی دێت .

مەبەست و نیازی هونەرمەندی سوریالیست " چ شاعیر و چ وێنەكێش ئەمەیە كە هەوڵ بدات بەشێ لە دووری و خاسیەتەكانی ئەو بەشە شاراوانەی بوونی خۆی ئاشكرا بكات ، بۆ ئەم كارەیش پەنا دەباتە بەر جۆرەكانی سیمبولیزم .

چونكە سیمبولیزم هەمان شێوە كە تێی دەگەن بەڕووكەش ، سادەو ساكار نییە ... لە بیركاری دا دەڵێین x یەكسانە بە چەندێتییەكی نەزانراوەوە ، وە لێرەدا ئێكس (x) بە سیمبول دەناسرێت ... لەوانەیە بتوانین بڵێین كە سوریالیزم ئێكسی وێنەكێشانە چونكە نمایندەی چەندێتییەكی نەزانراوە .

بەڵام ڕونكردنەوەی لەمجۆرە لای كەسانێكی زۆر ڕازی كەرانە نییە ، ئەم خەڵكە زۆرە دەیانەوێت بزانن كە بۆچی لە وێنەكێشان دا ( x) سیمبولێكی بەمانایە .

یەكەم سیمبولیزم یا ئەبستراكتییە یا مەلموس ... لە حاڵەتێكدا ئەبستراكتییە كە وێنە ویستراوو هەڵبژاردە بێتە بەكاربردن كە هیچ پەیوەندییەكی بە شتە بینراوەكانەوە یا دیاردە سروشتییەكانەوە نەبێت ... بەڵكو تەواو موتڵەق بێت " بە جۆرێك كە پیتی ئێكسس موتڵەق و هەڵبژێردراوییە ( اختیاری) .

بۆ نمونە بازنەیەك ( ئەگەر بمانەوێ نمونەیەكی سادە بهێنینـەوە ) دەتـوانێ سـیمبولی كەمالّ و تەواوی یا بە سیمبولی بنچینە بوونەكان بزانرێت ... هەرەم سـیمبولی پایەدارییـە ، هێڵی شەپۆل دار سیمبولی مەیلدارێتییە ... و لەم جۆرە .

ڕێژەیەكی زۆر لەبەرهەمە ئەبستراكتییەكانی مەكتەبی كۆبیزم لەسەر بناغەی ئەم جۆرە سیمبولیزمی وێنەیی یە كێشراون ... وەدەكرێت بڵێین كە هارمۆنیی هونەری یۆنانی — یش تا ئەو جێگەیەی كە لەسەر بناغەیـەكی یاسـای ژمـارەیی داڕێـژراوە ... لەهـەمان چەشـنی سیمبولیزمی وێنەیی یە ... بەلاّم سیمبولیزم بەمانای باوی بریتییە لـە بـەكاربردنی وێنـەی شـتە بینراوەكـان و بینـاكردنی خەیالاّتـە ناماقوڵـەكان لـە ڕەگـەزی بـەربلاّو و هەنـدەكی ماقوڵەوە ... بەلاّم ئەم ڕەگەزانە دەكرێت یان بە ڕوویەكی ئاگایانـە پێكـەوە ببەسـترێن یـا نائاگایانە.

هەنـدێ لـە شـتەكان دەشـێت لـە بناغـەدا بـەناوی سـیمبولەوە لـەزەین دا نائاگایانـە وەدەركـەون ، بـەلاّم ماوەیەكـە هێماكـان وەهـا ناسـێنراون كـە بەشـێوەیەكی ناسـراو لـە پشتێكەوە بۆ پشتێكی تر دەگوێزرێنەوە و گوزارەیان لێ دەكرێت ، ئەگەر بۆ نمونـە چـەند نمونەیەك بخەینە ڕوو دەتوانین مار و بزن و ئاگر و خواردنەوە و نان ناوبەرین .

دەرونزانی نوێ مانای سەرەكیی سـیمبولەكانی ئاشـكرا كـردووە " لەسـەر و ئەمانـەوە دەرونزانی نوێ مانای ئەو سـیمبولانەی كـە لـە وێنانـدنی خەونەكانمانـدا و لـە شـوێنەواری خەیاڵدا دەیبینین ئاشكراكردووە ... سـوریالیزم تاڕادەیـەك لـەم لقـەی دەرونزانـی نـوێ دا سەرچاوەی وەرگرتووە — یان بەلای كەمەوە ئاڕاستەی بوونی خۆی لەوێدا دەبینێتەوە ... سـوریالیزم مەبەسـتدارانە هـەوڵ دەدات كـە سـیمبولە گرنگـەكان ئافەریـدە بكـات ، و لای وێنەكێشی سوریالی وەك ماكس ئەرنست هەم سیمبولی ئەبستراكتی و هەم سیمبولی هەست پێكراو " ملموس" بەكاردەبرێت .

گەلێ لـە ڕەخنـەگران بـەجۆرێك سـەرگەرمی نـاوەڕۆكی سـیمبولیی بەرهەمـەكانی وەك بەرهەمی ماكس ئەرنست دەبوون كە بواریان بۆ لێكۆڵینەوەی بەهای جـوانیی بەرهەمـەكان

نەدەڕەخساند و ئەم بەرهەمانەیان بە ناونیشانی دەروونزانی یا ئەدەبیات یا هەر شتێکی بێجگە لە وێنەکێشان بڕیاردەدا .

بەلاّم ئەم ڕەخنەگرانە بەم شێوەیە سنورداریّتی خۆیان ئاشکرا دەکرد ، چونکە ئەگەر بۆ تەنها ساتیّ سیمبولێتی بابەتەکەیان بخستایە پشت گویّ ( ئەگەر هەستیارییەکی ڕووت لە مەبەستدارییان نیاز بوایە )لە خودی تابلۆ کێشراوەکان دا ، لە ڕووی ڕەنگ و چنینەوە جوانییکی بیّ پایانیان پەی پیّ دەبرد .

چونکە ماکس ئەرنست لەسەرو هەر شتێکەوە بەمانای ڕاستەقینەی وشە هونەرمەند بوو — واتە کەسیّ بوو کە لە ڕووی چەشەو سەلیقەوە وێنەی دەکێشا ...

ئەم بەهرانەی بۆ گوێزانەوەی ڕوانگەی خۆی — ڕوانگەی سیمبولیکی خۆی — بەکار دەبرد ... هەمان شێوە کە ولیام بلیك سەلیقەی شاعیری خۆی بۆ گواستنەوەی بینینی سیمبولی خۆی بەکار دەبرد ...

لەپاش سەدەو سالآنێك هێدی هێدی بە جێگەیەك گەیشتوین کە بلیمەتیی بلیك دان پیادا بنێین " لەسەر هەمان پێوانە پێویستە بلیمەتی وەك ماکس ئەرنست — یش دەستوبرد دان پیادا بنێین .

## 81 — دووەم — سلڤادۆر دالی

لەسەدەی ناوەڕاست دا بۆچوونێکی ڕاست و ڕۆشن دەربارەی جیهانی سەرو هەستپێکراوەکان باو بوو ، بەلاّم زۆربەی وێنەکارییەکانی ئەم ڕەچاوکردنە لە سنوری بابەتی نەویست و تۆقێنەر زیاتر لای نەدەدا .

هێرینیمۆس بوش لەم سنورە زیاتر هەنگاوی هەڵهێنا و ڕووە و گۆرەپانی بابەتە نا هزرییەکان چوو.

ئەم جۆرە بەرهەمانەی ئەو زۆرجار هێندە بە وردەکاری کێشراون کە چاپکردنیان ئاسان نییە ،بەلاّم یاد کردنەوەی هەندیّ لەم وردەکارییانە بەسە بۆ نیشان دانی چییەتی نامۆی خەیاڵەکانی ئەو .

چاکترین نمونه که دەشێ لەبەر چاو بگیرێت تابلۆی سێ پارچەی گەورەی میحرابی کەنیسەی ئیسکوریاڵە = Escorial کە لە لای چەپەوە دۆزەخ و لای ڕاستەوە بەهەشت نیشان دەدات و لە ناوەندیان دا " باخچەی سەرسوڕێن " ە ... لە پارچەی ناوەندا بۆ نمونە لەیەکلاوە دیمەنێك دەبینین لێوی یا کەناری چەمێکە ، لە ژێر ئاوەکەدا هێلکەیەکی مریشك بەدی دەکرێت کە تیایدا پەنجەرەیەك کراوەتەوە " پەنجەرەکە وێنەی لولەیەکی شوشەیی بەرەو دەرەوە درێژ بۆتەوە ، وە لەم لولەیەدا پیاوێك دەبینرێت کە سەرنج لە مشکێ دەدات کە دەیەوێ بچێتە ناو لولەکەوە ... لەسەرەکەی تری هێلکەی مریشکەکەدا گیایەکی سەیر ڕواوە کە گوڵەکانی ڕۆ دەچێتە تەختێکی ریشەدار کە جوتێ عاشقەو ماشقەی ڕووت لەسەری دانیشتون — لەلای گوڵەکەوە کەسێکی تر خەریکی ئارام کردنەوەی پەپویەکی دێو شێوەیە ، لەسەرەوەدا مرۆڤی ڕووتی تر لەسەر سینی و داری کۆپە شێوە و باڵندەی گەورە لە حاڵەتی نائارامی و پەرێشانی دا دانیشتوون ... لە دۆزەخدا مرۆڤی ڕووت دەبینین کە لەسەر چەنگێکی مۆسیقا ڕاکشاون ، چەنگ لەسەر عودێکی ڕوواوە کە مارێك دەورەی داوە و پیاوێکی لە دەوری خۆی گرفتار کردووە ... لەسەر ڕووی مینبەرێکی دەنگدان گیانەوەرێك بەسەرێکی مریشك شێوە دانیشتووە کە پێیەکانی لە جوتێ پارچە دروستکراوە و دەیەوێ بوویەکی ڕووت بخوات کە چەند تەرەقەیەکی پێوەیە و لەوێدا دەفرێت .

پێیەکانی بووەکە شتێکی گرتووە کە لە باروت دان دەچێت ... لەژێر مینبەری کەدا شتێ هەڵواسراوە کە لە دەرچەی دەمییەوە کەسێك دەیەوێت وەدەر بکەوێت ... پیاوێك سەرگەرمی ورچێکە و مێرویەکی نامۆش کە پێی مرۆڤانەی هەیە و بە پشتیدا پێیەکی بڕدراوی مرۆڤانە هەڵواسراوە ، جێگە بەو مرۆڤە هەڵدەچنێ . ئەمە چەند نمونەیەکی بڕیاردراوبوون کە لە سەدان خاڵی سەیردا لەو تابلۆیەدا دیارن ... خەیاڵەکانی سلڤادۆر دالی " وێنە 65" لە پێوانەیان دا بەبۆشی لاوازن ، یان چاترە بڵێین ڕەحم بەحاڵی بینەر دەکەن.

کەسـانێك کـە ئامـادەنین دالـی ڕاسـت ڕەچـاو بکـەن بـێ گومـان لـە نێـوان چـییەتی سرۆشەکانی ئەم دوو هونەرمەندەدا جیاوازی بەدی دەکـەن ... بـەڵام گومـانی تیادایـە کـە لەم جیاوازییە یان دا بەهایەکی زۆر بوونی هـەبێت ...بـۆ نمونـە دالی پێڵاوێکـی ژنانـە وێنـە دەکێشێ کە بوتڵێکی شیر لەناویدایە — دالی وێنـەی پـێڵاوی ژنانـەی زۆر بـەکار دەبـرد ... کەسانێ کە بە نووسـینەکانی ڕەوان یـان دەرون توێـژان ئاشـنان لـە یادیانـە کـە پـێڵاو لـە باوترین سـیمبولی تێکـەڵ بـوونی لەشـییە کـە دەڵـێن گوایـە لەخـەودا وەڕودەکـەوێت " وە زۆربەی بابەتەکانی تابلۆی دالی سیمبولی لەم جۆرەن.

بەم پێیە دەتوانین بڵێین کە ئەو خەیاڵاتانەی لە پاراویی خوو و بە ڕوویەکی ئاگایی لای بـوش وەڕو دەکـەون ، لای دالی شـتێکە کـە پێوسـتە لـەڕووی مەبەسـتداری و بەڕوویـەکی دیدەیی بەدی و ئامادە بکرێت .

تەنها خودی دالی دەتوانێت بڵێت کە سـیمبولە فرۆیدییـەکانی تاچـی ڕادەیـەك ویـستراو بەکار دەبات . بەڵام من دودڵم کە بەکاربردنی ئەم جۆرە سـیمبولانە لای دالی ویـستراو تـرە لە بەکاربردنی هەمین جۆرە سیمبولی لەلایەن بوش —ە وە. ( چونکە هـیچ ڕەوان پزیـشکێ نییە کە سیمبولیزمی بوش پەیوەست نەکات بە بابەتی سێکسییەوە ) .

بە ڕوانگەی من بوش نەیدەتوانی زماننامەی دەرونزانی بەکاربـەرێت تـاوەکو کارەکـانی خۆی بە زمانێکی دەرونزانانە پێناس بکات ، لەبەر ئەوە تا ئەو ڕادەیەی بیرەکانمان پـشت بە زماننامە ببەستێ " پێویست دەکات سەرنج لە بەرهەمەکانی بوش بدەین بەنیازێکی بێ خەوشانە ... بەڵام بە زاراوەی نوێ دالی و بوش هەردویان بۆ وێناندنی شێوە خەیاڵەکانیان ، پەنایان بردۆتە بەر ویژدانی نائاگای خۆیان و سەرچاوەی دەربڕینەکانیانەوە ، لەوەش دا کە چۆن دەربارەیان داوەری دەکەین هێندە کارێکی گرنگ نییە .

بـەڵام لێکـچونی نێـوان ئـەو دوو هونەرمەنـدە زیـاتر لەمانەیـە کـە ڕونمـان کـردەوە . مەبەستی سوریالیستەکان هەمان شێوە کە ماکس ئەرنست گوتویەتی ، ئەمە نییە کە پەی بە ویژدانی نائاگا بەرین و ناوەڕۆکەکانی بەشکڵی پێناسەیی یا ڕیالیستی وێنـە بکێـشرێت "

هەروەها مەبەست لەمەیش نییە که ڕەگەزە هەمە جۆرەکان لەزەینی نائاگاوە وەربگرین و بەهۆیانەوە جیهانێکی خەیاڵی دیی بنیاتبنرێت " مەبەستی سوریالیزمەکان ئەمەیە کە بەربەستەکان بشکێنن ، بەربەستە یان دیوارە لەشی و دەرونییەکانی نێوان ئاگایی و نائاگایی و جیهانی دەرەوە و ناوەوە بخنە ڕوو ....

تاڕاستییەکی زیاتر بەدی بهێنین کە تیایدا ڕاستی و ناڕاستی و بیرو کار بە یەکتری ڕووبەڕوو دەبنەوە و تێکەڵی یەکتری دەبن و بەسەرانسەری ژیان دا دەست باڵا دەبن .

دەربارەی بوش " باوەڕی ئایینی سەدەی ناوەراست و باوەڕی دیدەیی بە ڕاستی بوونی ئەو دونیا ، بەهرە بەخشی مەبەستی شێوە نیازی سوریالیزمەکانی ئەمڕۆکە بوو ، بۆ پیاوێکی وەك ئەو ، بەهەمان ئەندازەی کە وێنەکارییەکانی ، ژیانی دنیا و ئاخیرەت ، بە هەشت و دۆزەخو ژیان گشتیان بەیەك ئەندازە ڕاستی بوون و پەیوەستی یەکتری بوون ، واتە گشت ئەوانە پێکەوە پێك دێن و ڕاستییەکی لەبارتر بەدی دێنن کە یەکاویەك ڕاستییەك بوو هونەرمەند دەیتوانی کاری لەگەڵ دا بکات .

مەبەستم ئەمە نی یە کە بڵێم " ئەوەی لای دالی بەدی دەکرێت جێگری باوەڕی ئایینیە لای بوش ... هاوشێوەی هەمان باوەڕی ئاییني پشتیوانی تەواوی هونەری ئەوە " بە وەلاوە نانی مەیلی پوچ کردنەوەی ئەفسانەی ئامادەیی یا بلیمەتی تایبەتی هونەرمەند (چونکە بەڕوکەش هەر کەسێ دەستی بگاتە زەینی نائاگای خۆی دەتوانێ هونەرمەندی سوریالی بێت ) ، بەلادان لە مەیلی وێران کردنی تەواوی باوەڕە بۆرژواییەکان دەربارەی هونەر .... دەربارەی سوریالییەکان هیچ جۆرە باوەڕ و مەرامێك ناکرێت دەربڕدرێت .

من تەنها نیازمە بڵێم لەبەرئەوەی مانەوەی هونەری بوش بە سەلماندن گەییوە، پێویست ناکات هونەری دالیو کۆی سوریالیستەکان بە سەرزەنشتەوە توڕدەبن .

هەروەها بابەتی بەهای "ئەدەب"یشم ڕاستەوخۆ وەلاوە ناوە، چونکە سوریالیزمەکانیش هەروەکو بوش وێنەکێشی "ئەدەب"ین و لەم بارەیەوە بێباکنو

ئامادەیشن کە بەهای وێنـەیی‌و ئەبـستراکتی _کـە لای زۆربـەی وێنەکێـشانی نـوێ بـەهای بنچینەیی هونەری وێنەکێشانە_ پشت گوێ بخەن.

## 81– سێیەم –تاشیزم = پەڵەکاری = Tashism

سوریالیزم بە ناوی ڕەوتێکی یەکپارچە لە جەنگی جیهانی دووەمـدا گیـانی لـە دەسـت دا.. بەڵام تیۆرە بنچینەییەکەی واتە خودکاری= automatism. تا قوڵایی ویژدانی هونـەری ئەورووپا و ئەمریکا ڕۆچوو..

ئەنـــدرێ بریتـــۆن = Andre Breton جارێکیـــان وەهـــا ســـوریالیزمی پێناســـە کـــرد: ((خودکاریی پاراوی دەرونی، کە مەبەست لەمە ئەوەیە دابڕان لە بیرکردنەوەی ڕاستی‌و لـە هــەربارێکی زارەکـی‌و نووسـراوو هەرشـتێکی تـر. {واتــە}ڕاپـۆرتی بیرەکـان خاڵیــە لـە هەرجۆرە ڕێکخستنێکی هزری و ئازاد لە هەرجۆرە تێبینییەکی ئاکاری یا جوانناسی.))

ئەم پێناسە تەنها بەرهەمی ئەو هونەرمەندانە ناگرێتـەوە کـە پەیوەسـتییەکی نزیکیـان هەیە بە سوریالیزمەوە (وەك ماکس ئەرنست‌و دالی‌و هانس ئارپ Hans Arp و یاقی تانگوای Yves Tanguyو ئەندری ماسۆن Andre Masson و ڕێنە ماگریت Rene Magritte و جوان مـیرۆ Joan Miroو ئەلکساندەر کالـدر Alexander Calderبـەڵکو هەنـدێ لـە قۆناغـەکانی کـاری پیکاسۆو بەرهەمە سەرەتاییەکانی گیورگیودو چیریکۆ Giorgeo de chirico کـە میتـافیزیکی سەروسروشتی)ن‌و هەندێ لە پەیکەرەکانی هنری مۆریش دەگرێتەوە.

ڕەوتی سوریالیزم لە ساڵی 1919دا دەستی بە خۆڕستن کرد (یەکـەم بەیاننامـەی لـە ساڵی 1924دا بڵاوکرایەوە)، بـەڵام ئـەم ڕێبـازە ڕیـشەیەکی ڕاسـتەوخۆی لـە نێـو دادایـی یەکاندا هەیە.

دادایی یەکان گروپێك هونەرمەندی ئاشوب خـواز بـوون کـە لـە سـەردەمی جەنگدا لـە شاری زوریخ بەیەکتری گەیشبوون، لـەم گروپـەدا هـانس ئـارپ‌و تریـستران تـزارا Tristran Tzara—و هوگۆ باڵ Hugo Ball — هاوبەش بوون.

بەڵام بەر لە جەنگی جیهانی یەکەم گروپێکی تریش لە ئیتالیا پێکهاتبوو بە ناوی داهاتوگەرییەکان=فیوچریزم — ەوە و ڕابەری ئەم گروپە —فیلیپو توماس مارینتی Fillipo Thomas marinetti—بوو و لە ساڵی 1909 دا بەدی هات.

ئەم گروپە دژی دابی هارمۆنییو شەوانی و زەوقی ڕاستەوخۆ بەرپابوو و ڕایگەیاند کە ئامانجی بریتییە لە بەیان کردنی "گێژاوی ژیانی نوێ — ژیانی ئاسنینو دوکەڵو بایی بوونو خێرایی سەرسام کەرانە."

لە هەمان کاتدا لە میونخ کاندینسکی—یش تابلۆ سەرەتاییە نا وێنەیی یەکانی یان "ئەبستراکتی یەکانی" کێشابوو و گروپی "سورا شین" لە ساڵی 1914 گەیشتبووە قۆناغی "ئیکسپرسیونیزمی ئەبستراکتی= دەربڕینکاری ئەبستراکتی= بەیانکردنی حاڵەتی ئەبستراکتی.".

بەم پێیە ئەم هەوڵە بۆ بەیانکردنی "دابڕان لە ڕاستیی بیرەکان" (کە کاندینسکی ئەوەی بە "بەیانی گریمانەیەکی دەرونی" ناودەبرد) دیاردەیەك بوو خاوەن گرنگییەکی مێژوویی گشتی، کە بە درێژایی سەردەمەکاندا پوختە بو بوو و لە سەرزەمینە بەربڵاوەکان دا گرنگی هەبوو، وە نەك تەنها لە هونەرە بەرجەستەیی یەکاندا، بەڵکو لە شیعرو شانۆ و مۆسیقاو فەلسەفەیش دا ڕەنگی دابووەوە.

تیۆرەکانی فرۆیدو کارل جۆستاف یۆنگ لە بواری دەرونزانی دا یا شیکردنەوەی دەرونی دا بوارێکی تەواویان بۆ پشتگیری کردن لەو ڕەوتە ڕەخساندو ئاڵۆزانو کێشە کۆمەڵایەتی یەکانی ئەو کاتەیش زەمینەیەکی سروشتی بوون بۆ سەرهەڵدانی ئەو ڕەوتە.

ئێمە هێشتا لە قۆناغێکدا دەژیین کە ڕەنگدانەوەی هونەرییو شۆڕشو شێتی تیایدا ڕووئەداتو ڕووی داوە، ئەم ڕووداوانەیش لە دوای جەنگی جیهانی دووەمەوە تەنها ناوی خۆیان گۆڕیوە.

سوریالییەکان لە کاتی جەنگی جیهانی دووەمدا پەرەوازە بوون— هەندێکیان“ وەك ئەندرێ ماسۆنو ئەندرێ بریتۆنو چەندانی تر پەنایان بردەبەر ئەمەریکا.. پاشان لە

ئەمەریکا شێوازێ سەریهەڵدا کە بەناوی جاکسون پولوک = Jackson Pollock 1912-1956–
ەوە پەیوەستە و ئەویان بە شێوازی یا ڕەوتی "وێنەکێشانی کاردار یا
بزوتنەوەیی=Action Painting — ناودەبرد... ئەم تەرزەی وێنەکێشانیان بەم ئاراستە ناونا
"کارەکی" چونکە وێنەکێش بە جۆرەها ماددەی جیاواز هەوڵی دەدا بە کارەکەی خۆی"
واتە بەکارکردن لە جۆرەها گۆشەی جیاوازەوە بە تورپدان و هاویشتنی ڕەنگ بۆ سەر
ڕووی تابلۆکەی (بە یاریدەی بزوتنەوەی هەمەجۆرەوە) تابلۆیەکی بەدی دەهێنا.

لە سەدەی پانزەیەمدا لە یابان هونەرمەندێکی وێنەکێش ژیاوە بە ناوی سێشو=
Sessho -1420-1506– کە هەمان پیشەی بەکار دەبرد واتە هاوێشتنی مەرەکەب بۆ سەر
ڕووی کاغەز–دوریش نییە کە وێنەکێشانی –کارکردن–ی ئەمەریکا لە کارەکانی ئەوەوە
بەهرەیان وەرگرتبێت.

لە وڵاتانی ڕۆژهەڵات دا بە ڕوویەکی گشتی هونەری خۆشنووسی هەمیشە بزوتنو جوڵە
پەیوەستە بە بارودۆخەوەو کاری ئەم خۆشنوسانەی ڕۆژهەڵاتیش دەشێت کاریگەری
هەبێت لەسەر هونەرمەندانی ئەمەریکا.

لە هەمان ئەو ڕۆژانەدا لە پاریس ڕەوتێك سەری هەڵدابوو کە بەناوی تاشیزم = tache
لەکە یان پەڵەی ڕەنگ ناسرا . لە پاریسدا هونەرماندانێ هەبوون کە لەژێر کارتێکەری
هونەری خۆشنوسی ڕۆژهەڵاتی دا بوون (هانری میشو= Henri Michaux و
پێرسولاژ=Pierre Soulages–) بەڵام کارگێڕی بنچینەیی ئەم ڕەوتە لەلایەن
وێنەکێشانێکەوە گەیی کە تەنها ئارەزویان ئەمە بوو پیشەیەکی "خودکاری دەرونیی
پەتی" بەدی بهێنن.

جیاوازیی ئەمانە لەگەڵ سوریالیزمە ڕەسەنەکاندا لەمەدا بوو کە ئەوان هەرجۆرە
وێنەیەکیان ڕەت دەکردەوە کە لێکچونێکی ڕاستەقینەی هەبێت بە شتە ڕاستییەکانەوە..
هەوڵیان دەدا لە ژوورە نزیکەکانی ویژدانی نائاگادا سیمبولە ژیاوەکانی ناوی وەلاوە بخەنو
بگەنە چینی ژێرەوەی تر" کە لەوێدا "لادان لە ڕاستی بیرەکان" وێنەیان لە خۆنەگرتووە.

وێنەکێشانەکانی ئەم کۆمەڵەیە ڕەنگدانـەوەو پێـچەوانەکردنی ئـەم چـینە نـا وێنـەیی یـەی زەینەو بەم ئاراستەیە هونەرەکەیان "ناوێنەیی =informal" ناودەبەن.

ئەو ڕەوتە ئێستاکە جیهانی بووە و بە تایبەتی لە یابان= ژاپۆن چالاکیی لە کایەدایـە و گرنگیی ئەو هونەرە ناشێت لەبەرچاو نەگیرێت.

لە بەرهەمەکانی ئەم شێوازەدا جۆرە یەکدەستییەك دەبینرێـت، کـەدەکرێ بـە جـۆرە گـشتێتییەك ناوبرێـتو ئامانجـەکانیان پێـچەوانەی ئامـانجی دادایـی یەکانـەو وێرانکەرانـە نین... ئەم شێوازە جوڵەیان لە فیوچەریزمەکانەوەو خودکارییان لە سـوریالیزمەکانەوە بـە میرات بۆ ماوەتەوە... لە ئیکسپریسیونیزمەکانیشەوە ئەم "پێویستییە دەرونی"یـەی کـە بەشێوەی سیمبول بەیان دەبێت بۆ مابووەوە.

شێوازی "نا وێنەیی" بـەبێ ئـەم هونـەرە بێشـك بەهانەیـەکی چـاکە بـۆ زۆربـەی ئـەو وێنەکێشانەی کە ناتوانن بەڕوویەکی "وێنەیی" وێنە بکێشن.

بەڵام بۆ ئەو کەسانەی کە دەتوانن بژێویو توانـای ئـەم ڕەوتـەی دوایـی وێنـە کێـشان بدرکێنن" ئەم تەرزەی هونەر دواهەمین بورهانی ئەو پرۆپاگەندەیەیە کە لە سەرەتای ئـەم کتێبەدا دیمان... ویستی سەر بە وێنە چییەتی یە نـا فانییـە یـا لـەناو نەچـووی هەیـە کـە هەمیشە ئاراستەی جوانناسی چالاکیی مـرۆڤ بـۆ بـەدیهێنانی جـوانی هـەوڵی داوە– بـەیان "کاڵای لە بن نەهاتووە بۆ پشکنینی یاسای ژیان".

## 81– چوارم– پەیکەرسازیی نوێ–

لە سەدەی شانزەدا باو بوو کە چاودێریی پلەوپایەی ئەو هونەرە بکرێت کە باڵاتربو لە هونەرەکانی دی" بە تایبەتی چاودێریی وێنەکێشانو پەیکەرتاشی.

باوەڕی ناوبراو لەو کاتەدا لای بێنڤونوتۆ چیلینی= Benvenuto Cellin– چنگ دەکەوێت کە دەیگوت، پەیکەرسازی هەشت جار لە کۆی هونـەرەکانی سـەربە هێڵکـاری گـەورەترە، چونکە یەك پەیکەر لە هەشت ئاراستەوە شـایەنی بینینـەو لـە کـۆی گـشت ئاراسـتەکان دا دەبێ بە هەمان ئەنداز باش وەرو بکەوێت.. چیلینی دەیگوت کە تابلۆیەکی کێشراو شتێ

نییە جگە لە وێنەی درەخت یا کەسێ یا شتێکیتر کـە لـە سەرچـاوەیەکەوە پێـچەوانە بـوو بێت– جیاوازی وێنەکێشان و پەیکەرسازی بە هەمان ڕادەیـە کـە شـتەکان و سـێبەرەکان هەیانە.. واتە ئەگـەر پەیکەرسـازی شـتێکی زینـدوو یـا تـەنێك بێـت، ئـەوا وێنەکێـشان بـە سێبەری ئەو شتە لە قەڵەم دەدرێت.

لەلایەکی دییەوە لیۆناردۆ باوەڕی وابوو کە وێنەکێشان باڵاترە لە پەیکەرسازی چـونکە زیاتر لایەنی هزریی هەیە"و مەبەستی لەمە بوو کە پیشەی وێنەکێشان لە ڕووی نیشاندانی بەسەرنجی کارەوە بێ ئەندازە پڕ سەرنجەو لە ڕوانگـەی مەیدانییـەوە کـە بـۆ خەیاڵـەکانی مرۆڤی ئامادە دەکات یا والای دەکات" بێ ئەندازە بەربلاوترە.

کاتـێ ئـەم پرسـەیان بـردە بـەردەم مایکـل ئـەنجلۆ" بەشـێوەی هـزر وریـایی خـۆی ڕاستگۆیانە وتی" ئەو شـتانەی کـە مەبەسـتی لێکـچویان هەیـە، خۆیـان هاوشـێوەن، بۆیـە لەنێوان وێنەکێشانو پەیکەرسازیدا جیاوازییەك ناشێ بوونی هـەبێت، مەگـەر جیـاوازی لـە نێوان ئەوەدا لە وێدا بەدی بکەین کە باش و باشتر جیادەکەینەوە لە کاردا.

هیچ کەسێك لەو سەردەمەدا یا تا لە سەردەمی خۆشماندا گومانی لـەو وتەیـەی مایکـڵ ئەنجلۆ نییە کە ئامانجی پەیکەرسازیو وێنەکێشان یەکن. بەڵام ئەمرۆکە ئێمـە نـەك تـەنها لە نێوان جۆرەکانی هونەردا جیاوازی دادەنێین بەڵکو ئەوەش شیاو دەکەین کە لـە خـودی یەك تەرزی هونەردا وەك پەیکەرسازی دەشێت هونەرمەندا نیازی تەواو جیاوازیان هەبێت.

یەکێ لە تایبەتییەکانی سەردەمی نوێ ئەمەیە کە لەم سەردەمەدا هونەر– یـش وەك زانست بۆ چالاکیی تەواو جیاواز دابەش بووە... دەشێت هێشتا بەهایـەکی گـشتی بـوونی هەبێت کە کۆی هونەرەکان بـەرەو ئاسـتی ئـەو ئاڕاسـتەیە دەبـەن.. بـەڵام لـەم خاڵەشـدا گومـان هەرهەیـە، لەسـەدەی شـانزەیەمدا هونەرمەنـدان دەیـانتوانی بـە تایبەتمەنـدێتی بۆچونیان بەسەر جوانی دا بڕیار بدەن، هەمان شێوە کە فەیلەسوفانی ئەو سـەردەمە لـە تایبەتمەندێتی بۆچونەکانیاندا دەربارەی ڕاستەقینە هاوڕا بوون.. ئەمڕۆ نە لە هونەرو نە لە فەلسەفەدا ئەم هاوڕایی یە بوونی نییە.

بەڵام مایکل ئەنجلۆ دوو جۆر پەیکەرسازیی لاپەسەند بوو– جۆری ڕاستەقینەو جۆری درۆیانە.

جارێکیان نووسیی: "مەبەستی من لە پەیکەر ئەو جۆرەیە کە لە تاشینی پارچە بەردێکدا بەدیی دێنن... ئەو جۆرەی کە بە شێوەی هاوچنین–ی ماددەی کار بەدی دێت، لە وێنەکێشان دەچێت".

لەگەڵ مەزنی و تەواویی کەسێتی مایکڵ ئەنجلۆدا پاش سەردەمی ئەو هونەری پەیکەرتاشی بەزوویی دوچاری دارمان هات، چونکە لەبری "تاشین" بە "لەسەر یەك چنین کردن" گەیی ، هەڵبەتە پەیکەریاین لەشێوەی گڵدا نەدەهێشتەوە، چونکە دەیانزانی کە گڵ ورد دەبێ‌و دەشکێت‌و دەقڵێشێ.. پەیکەرێك کە پەیکەرساز دروستی دەکرد بە ڕوویەکی تر کەسانی تر یا بە برۆنز دادەڕێژرایەوە یان بە ئامرازی ماشێنی هاوشێوە ئەویان لە مەرمەڕ دروست دەکرد... پەیکەرساز ئەگەر زۆر کارەکەی خۆی لاپەسەند بوایە ، دەشیا پەیکەری مۆدێلی یەکەمی دەستکاری بکردایە، بەڵام دابی گشتی وەها بوو کە هیچ پەیوەندییەکیان بە کارەکەیەوە نەبێت.

ڕۆدان= Rodin یەکەم کەس بوو کە دژی ئەم بارە ناهەموارەی هونەری پەیکەرسازی ڕاپەڕی، هەرچەندە ڕۆدان پێشتر کاری قوڕینی دەکرد نەك تاشین، بەڵام کاری مۆدێلی بەشێوەی هۆکاری بەیانی‌و بە سەرنج‌و زانستی قەبارەو هاوگونجاندن‌و کێش‌و جوڵەو سێبەرو ڕووناکی بەدی هێنا.

بەڵام هەمان شێوە دەتوانین بڵێین کە مەبەستی کاری ئەو یەك بوو لەگەڵ مەبەستی وێنەکێشان دا– بۆ نمونە مەبەستی کاری ڕامبرانت کە ڕۆدان زۆری خۆش دەویست.. قیامەت واتە ڕۆژی دوایی کە ڕۆدان لە پەیکەرسازیدا بە قوڕی سەناعی (کاری قوڕی نەرمە وەك قوڕی سەناعی یا دەستکرد...،) دروستی کردبوو لەلایەن پەیکەرتاشانی نوێوە برەوی پێدرا وەك (بووردل=Bourdelle و مایلول= Maillo و ئیپستاین= Epsteinو ئێرلیش Ehrlich.

ئەگەر دەربارەی ئەم لایەنەی هونەر شتێ نەڵێم، لەبەر ئەوە نییە کە لێی بێزارم — بە پێچەوانەوە پێویستە بڵێم کە بەدیهێنانی پەیکەرسازانی قوڕی دەستکرد "صناعی" بەر لە پەیکەرسازانی تراشکاری بووە.

بەڵام پێویستە بزانین کە کارکەرانی قوڕی دەستکرد قۆناغێکی دورتریان هەبووەو لەسەر بناغەی دابی پەیڕێژ کراو کاریان پێکردووە.

هونەری بەردتاشین دژوارترەو کاتی دەستپێکردنی "نادیارترە"— واتە بەم مانایەی کە ئەگەر بمانەوێت لە مێژووی پەیکەرتاشی بگەین، پێویست دەکات سەر لەنوێ بەسەریدا بچینەوە، نەك تەنها لە ژێرخانی ڕابردویەکی دووردا، بەڵکو لە نێوان چەندین سەدەدا ئەم دووپیشە جیاوازە تێکەڵ بەیەك بوون.

بۆیە زیاڕۆیی ناکەین گەر بڵێین کە ئەم جۆرەی تری پەیکەرسازی ناچار بووە دیدێکی نوێ لە ڕاستەقینە بۆ خۆی بەدی بهێنێت. ئەگەر ئەم ڕوونکردنەوەیەش ئاڵۆز بەرچاو دەکەوێت، دەشێ لەبەر ئەم هۆیە بێت کە لە توێی تۆژینەوەدا نەتوانین ئەو بابەتە ڕۆشنتر بکەینەوە.

بزوتنەوەی نوێ لە دوو ئاراستەوە دەستپێدەکات یا دەشێ لە سێ ڕووەوە —ئەگەر مەیلدارێتی گشتی هەم لەپێشچاو بگرین کە پابەندە بە دروستیی کاری هونەرەوەو پیشەی ڕاستی پەیکەرسازی بە تاشین کاری دەزانێت.. ئەو دوو ئاڕاستەیەی دی تەواو جیاواز بوون.

یەکەمیان بریتی بوو لە وەڕوخستنو درکاندنی بەشو جۆری سەرەتایی پەیکەرسازی ئەفریقیا، یۆنان، مەکسیکو پێش مێژوو" هەروەها پەیکەرسازی کاتی سەرهەڵدانی مەسیحیەت یا ڕۆمی یانە—و ئاڕاستەکەی.

دووەم کاریگەریی شارستانیەتی ماشێنی بوو لەسەر هونەری ئەمسەردەمەمان.

ئەم دوو کاریگەرە هەندێ جار وەها تێکەڵ بەیەك دەبن کە مرۆڤ گێژ دەکات، بە جۆرێك کە لە قۆناغی سەرەتایی وێنەکێشانی کوبیزمی دا هەمان جۆر بوو.

کــــاری پەیکەرســــازانی وەك برانکـــوزی=Brancusi و ئـــارکیپنکو=Archipenko و لاورانس=Laurens که له دەیەکانی 1910– 1920 دا دروستکراون زۆرجـار ئاشـکرایانه ڕەنگی میکانیکییان هەیـە، دەڵـێن ڕەنـگ چـونکه کـاری ئـەم هونەرمەندانـە لـە بنـچینەدا مرۆڤانەیـە... ئەگـەر نـەڵێین بـە شـکڵ و لەشـی مرۆڤـەوە پەیوەنـدن یـا لەوانـەوە بـەهرە وەردەگرن" لەبەر ئـەم هۆیەیـە کـە ئـەم بەرهەمانـە پـشتیان بـە پێکداهاتنی "تـداعیات" سۆزی بەستووە کە بەڕوویەکی سادە پەیکەرسازی لەگەڵ پەیکەری مرۆڤی دا هەیەتی.

ئـەو جـۆرەی پەیکەرسـازی کـە بـە شـێوازی –کۆنـستروکێڤیزم– (دارشـتەکاری= بنیاتکاری=بیناکاری)– ناسراوە، شـتێکی تـەواو جیـاوازە.. ڕیـشەی کۆنـسترۆکتیڤیزم لـە ڕوسیادا بەر لە هەڵگەڕانەوەکە بوو و سرۆشـیان لـەم مەیلدارێتییـە دەدوا کـە پەیکەرسـاز هەرجۆرە بۆنەیەك یا دیاردەیەکی سروشتی تەرك بکاتو یەك "ڕاسـتەقینەی نـوێ" بـەدی بهێنێتو یەك هونەری "پاراو"و "هەمیشەیی" ئافەریدە بکات.

هەندێك لە کارە سەرەتایی یەکانی پەیکەرسازانی _ کۆنستروکتیڤیزم– بە ڕوکـەش لـە ماشێن یا ئامرازی میکانیکی دەچـن... مەبەسـت لـەم پەیکەرانـە کـە بـە پارچـەی ئاسـنو پلاستیكو شوشەو کۆی ماددەی پیشەسازییانە "بینا=دارشتە" دەکـرا و تیایـان دا یـا لـە بینایان دا شکڵی ئەندازەیی بەکار دەبرا ئەمەبوو کە بـەو هۆکارانـە پەیوەنـدیی دینـامیکیی کە لە نێوان قەبارە پڕەکانو ڕووەکانو ئاتمۆسفاردا هەبوو، لـە حاڵـەتی کـشانو کۆشـشی تەواودا بن... ئەمەش ئەگەر ڕوخسار یـا شـکڵێکی "جـوان" بـەمانای بـەکاربردنی وشـەکە بدات بە دەستەوە یا نا" دەشێت شایەنی تۆژینەوە بێت.. بەڵام ئەگـەر ئێمـە ئـەوەی کـە پەیکەرسازێکی وەك ڕۆدان دەربارەی هونەرەکەی نوسـیوێتی بخوێنینـەوە" ئـەوا دەبیـنین کە ئەویش هەمان ئەو زاراوانەی بەکار دەبـرد، واتـە لـە – ڕووەکـانو قـەبارەکانو کـشانو کۆششو هاوڕێژە– دەدوا.

ڕۆدان جارێکیـان وتـی: هۆکـاری کـۆبیکی "کعبـی" بناغـەی هـەموو یاسـاکانی ژیـانو جوانییە ... هـیچ شـتێك وێنـەی "بینـا"کـانی = کۆنـسترۆکتی –گـابۆ=Naum Gabo – لـە

پەیکەرەکانی ڕۆدانەوە دورتر نین" لەگەڵ ئەوەشـدا مـرۆڤ دەتوانـێ دەربـارەی هـەردوکیان بەیەك زمان بدوێتو هاوکێشەی لێکچونیان تیادا پەی پێبەرێت.

شێوازی کۆنستروکتیڤیزم–یش وەك شێوازی کۆبیزم لـە وێنەکێشان دا تەڵەکـەو فێڵـی ڕوکەشی لەخۆی دوور خستۆتەوە، بۆیە پێویست دەکا لێرە بە دواوە ئەو شێوازە بە نـاوی هونەرێك لە وێنەی پاراو باس بکرێت.

ئـەم هونـەرە بـەم ناونیـشانە کۆسـپی گـەورەی بـۆ لایـەنگرانی سـادەی هونـەر بـەدی هێناوە، بەڵام من دڵنیام کە ئەمە یەکێکە لە بـارودۆخی بەسـەربردنی ئـارەزوی خـەڵکی... هەمان کەسانی ڕەخنەگر لە دەرکی هونەری بیناکاری دا کۆسپێ بەدی ناکەن (یان دان بـە بـوونی کۆسـپەکەدا نـانێن)" لەگـەڵ ئەوەیـشدا لـە درکانـدنی هونـەری بینـایی دا = کۆنـستروکتیڤیزم دا هـەمان شـێوە هـەمان توانـای هـزری بەکاردەبـەن. هەنـدێ لـە کـارە سەرەتایی یـەکانی مـالڤیچ= Malewich– و تـاتلین= Tatlin هـەروەکو هێڵکـاریی بیناکـاری بوونو هەندێ جاریش بە هەمان ناونیشانی بیناکاری ناودەبران... هێـشتاکەیش لـە نێـوان "بیناکـاری"یـەکانی پەیکەرسـازانو بیناکارییـەکانی بیناکـاران دا پەیوەندییـەکی نزیـك لـە کایەدایە.

جیاوازی لێرەدایە کە پەیکەرساز پێویستی بە نیازی پراکتیکی نییـە و بۆیـە دەتوانێـت شکڵێ یا ڕوخسارێك بەدی بهێنێـت کـە لـە ڕوانگـەی جوانناسـییەوە "پـاراو" بـن (وێنـەی 69).

ڕێگـە بـدە لـە دواییـدا بگەڕێینـەوە سـەر ڕەوتـی ئـەو بزوتنەوەیـەی دی کـە وتمـان کاریگەرێکی دیاری کراوی هەیە لەسەر پەیکەرسازیی نوێ_ واتە بزوتنێك کە لە تۆژینـەوەو درکاندنی جۆرە جیاوازەکانی هونەری سەرەتایی یەوە سەرچاوە وەردەگرێت... ئەم خاڵـە ئێستاکە تێی گەیشتوین کە مرۆڤی سەرەتایی هەرچەندە دەشێت ژیریی گەلێ لە هـی ئێمـە کەمتر بووبێت، لە بواری توانامەندێتی هونەریدا لە ئێمە کەم دەست تر نەبوون.

هێڵکارییەکانی ناو ئەشکەوتەکانی سـەردەمی بـەردینی کـۆن ، لـە هەسـتیاریو هێـزی کاریگەریاندا لە هیچ یەکێك لە بەرهەمەکانی قۆناغەکانی دوایی کەمتر نین.. هەنـدێکیش لـە جۆری پەیکەرسازیی ڕەشپێستەکان بە جۆرێکی دی بەهێزو کاریگەرن.. گومانی تیادا نییە کە هەندێ لـە دروسـتکراوە مرۆڤییـەکان (کـە مـن بـە پەلـە ئەوانـە بـە بەرهـەمی هونـەری ناودەبەم) خاسیەتی بەرجەستەکردنی توانامەندێتی سۆزی خێڵێك وەرودەخەن... واتە بـۆ نمونە بتێك یا تەوتەمێك "کەش" دەکرێت وەها داتاشرێت کـە هەسـتی تـرسو بـەزەیی یـا خواوەند پەرستی یا ڕازێکی دی بگوێزێتەوە.

ئێمە نازانین ئەم کارە چۆن شیاو دەکرێت– هونەرمەندی سـەرەتایی بـۆ نیـشان دانـی ئەم چۆنێتیانە بە ڕوویەکی وشیارانە یا ئاگایانە هەوڵ نادات– بەڵکو مەیلی نـا ئاگـاو هێـزە خەیاڵ بینەکانی ڕابەری ئەون... بەڵام ئەوەی کە ئەو بەدیی دەهێنێت واتە ئـەو خاسـیەتە سەرو هزرییە، یان دەشێت ناهزرییە یان هەیە" ئەم بەرهەمانـە نیـشان دەری توانامەنـدیو دوریییەکن کە لە سنوری تێگەیشتنی مرۆ بەدەرن.

ڕەخنەگرانی ڕۆمانتیك هەمیشە ئەم خاڵـەیان لـەلا پەسـەند بـوو کـە پێویـستە ڕیـشەی جازیبەی هونەری لەو دەوروبەرە نائاگایەدا پەیجۆر بێت.

بەرهەمی هونەری بە ڕوویەکی هزری ناتوانرێت بەدی بهێنرێت، تەنانـەت هونەرمەنـدانی شێوازی "بیناکاری= کۆنستروکتیڤیزم"یش ئـەم ڕاسـتییە دەبیـستن، بـەڵام ئـەو بەرهەمـە هونەرییەی کە بۆ ڕەزامەندێتی خەڵکی هاوچەرخو سەردەمی نـوێ دروسـت دەکرێـت، ئایـا دەتوانێت توانامەندیی ژیان بەخشی هونەری سەرەتایی دوپات بکاتەوە" (ژیان بەخش نەك تەنها بۆ خەڵکی سەرەتایی ، بەڵکو مرۆڤی هاوچەرخیش).

گـەلێ لـە هونەرمەنـدانی ئەمرۆکـە لـەو بـاوەڕەدان کـە بـەڵێ دەتـوانن" پیکاسـۆ لـە وێنەکێشانداو هنری مۆر = Henri More لە پەیکەرسازی دا– بەرهەمـەکانی خۆیـان لەسـەر بناغەی هەمان باوەڕ بەدی هێناوە.

لەوانەیە بۆ درکاندنی ئەم جۆرە بەرهەمە هونەرییانە پێویست بێت کە ئێمە بەشێ لە نکوڵی کاریی شارستانیەت بخەینە لاوە، چونکە ئەم بەرهەمانەی کە لەگەڵ ئێمەدا دەدوێن زمانی هزر نین، بگرە زمانی قەریحەیەکی ناسکیش نین کە بەری شێوازی زانستی مرۆڤانەی ئێمەن، چونکە ئەو بەرهەمە هونەرییانە ڕاستەوخۆ لە پەیوەندیدان لەگەڵ لایەنە نائاگاکانی هزری ئێمەدا.. هیچ پێویست ناکات کە ئەو بەرهەمانە بە ئاڕاستەیەکی کەمتری هونەری ڕەچاو بکەین" چونکە دەبینین کە بۆ گەیشتن بەو لایەنو ئاڕاستە نائاگایانەی هزرمان هونەرمەند پێویست دەکات هەمان یاساکانی بیناکاری بەکار بەرێت کە کۆی هونەرمەندان بەکاری دەبەن.

یاسا بنچینەیی یەکانی هونەر لە کۆی جۆرەکانی هونەردا و لە هەموو چاخەکان دا یەکن... بەڵام مەبەستیان یەك نییە.

لێرەدایە لە چمکی قۆناغی ڕێنیسانس لە هونەردا، بەوجۆرەی کە مایکڵ ئەنجلۆ بەیانی کردووە جیادەبینەوە.

ئێمە یاساو پیشەکانی هونەر بۆ مەبەستی جۆراوجۆر بەکار دەبەین هەندێجار بۆ بەیان کردنی مەسەلەیەك– جارێکی تر بۆ بەیان کردنی ڕاستەقینەی شتەکان– جارێکی دی بۆ بەرجەستەکردنی ئایدیاکانو جارێکی دی بۆ دۆزینەوەو وەڕوخستنی نادیارەکان– هەندێ جاریش بۆ هەوڵدان لە پێناوی بەدیهێنانی ڕاستەقینەیەکی نوێ دا هەمان شێوە سود لە هونەر دەبینین– کۆی ئەم بەکار بردنانەی هونەر ڕاستنو کۆی ئەمانە لە ڕەوتی پێکهاتی پەیکەرسازیی نوێ دا ئاشکرا دەبینرێ.

## 82– هنری مۆر

لە سەدەی پانزەیەم هونەری پەیکەرسازی لە ئینگلتەرە لە دەست چووە، لەوانەیە لە تەواوی ئەوروپادا لە دەست چوبێت، بۆیە دەتوانین بڵێین کە چمکی قۆناغی ڕێنیسانس لە هونەری پەیکەرسازیدا بە گشتی هەڵە بوو.

هەر بەشێك لە هونەر پێویست دەكات بناغەی تایبەتی خۆی هەبێت كە لەسەر بناغـەی ماددەی كاری ئەو هونەرەو كاربردی بەرهەمی هونەری دیـاری دەكرێـت. بـەڵام لەسـەدەی شـانزەیەمدا ئـەم جـۆرە بنـەماو بناغەیـەی هونـەر كـە هەسـتو ژیـانی بـە پەیكەرسـازیی سەدەكانی ناوەڕاست دەبەخشی فەرامۆش كرا.. ئەمڕۆكە بە ئاسانی دەتوانین تێبگەین كە بۆچی ئەمە ڕوویدا.

هونەری قۆناغی كلاسیكی یۆنانو ڕۆم جارێكی دی ئاشكرا بوبوو، وە ئـەم هونـەرە بـۆ دادانی زانستی مرۆڤیزم( هیومانیزم)ی قۆناغی ڕێنیسانس تەقەلایـەكی بـەربڵاوی دا" بـەڵام پەیكەرسازانی ڕێنیسانس لەبری ئەوەی كە ئەزمونی گیانیی دروستكارانی ئەو بەرهەمانـەی كلاسیك سەرلەنوێ دوپـات بكەنـەوە– بـە سـوربونێكی تـەواوەو بـە دوپـاتی یـان لاسـایی كردنـەوەی ڕووكەشـی ئـەو بەرهەمانـە گەیـشتن– هەڵبەتـە لەگـەڵ ئـەو گۆڕانكارییـەدا كـە هەستە ڕوكەشەكانی سەردەمی خۆیان گریمانی دەكرد" هەركاتێك ویـستبێتمان دەربـارەی ئەم بابەتە باسێكی تەواوتر بكەین" پێویست دەكات دیدێكی بەربڵاوتر سەرباری ئەم بڕیارە گشتییە بكەین.

بۆ نمونە پێویستە ڕوون ببێتەوە كە هەندێ لە پەیكەرسـازان وەك دونـاتیلۆ و دزیـدریۆ دا سـتیناتۆ=Desiderio da Setignano و ئاگۆسـتینۆ دی دوچـیو =Agostino di Duccio –و تەنانەت لیوناردۆ داڤینشی– كە لە دیدەگای ئەمڕۆماندا دەشێت لـە سـەرەتای ڕێنیـسانس دا جێگیر بنو نمایندەی ڕێنیسانسن، بە واتایەكی ڕاستتر بـەری سـەدەی ناوەڕاسـتن" ئـەم هونەرمەندانە بەری شێوازی گوتیكن– نەك خێڵەكیی یەك سەردەمی تازە.

هەروەها لە قۆناغەكانی بارۆك و ڕۆكۆكۆدا جۆرە ڕەگەزێك بونیان هەیە كـە هەرچـەندە بنــەمای هونــەری پەیكەرســازی تــا ڕادەی تێكـشكاندن دەخەنــە ژێــر زەبریانــەوە، بــەم حاڵەیـشەوە بـە یاریـدەی تایبەتمەنـدێتی تاكانـەی درەخـشانیان بـوونی خۆیـان ئاڕاسـتە دەكەن.

بەڵام پەیکەرسازیی ڕێنیسانس‌و بارۆك‌و ڕۆكۆك هەر چاكەیەكیان هەبێت ئەوا ئەم خاڵە هیچ پەیوەندییەكی بە تۆژینەوەكەی منەوە نییە" چونكە ئینگلتەرە هەرگیز بەشێكی شیاوی سەرباری ئەم مەكتەبانە نەكردووە.. بێزیادە ڕۆیی دەتوانین بڵێین كە هونەری پەیكەرسازی بۆ چەند سەدەیەكە لە ئینگلتەرادا مردووە.

هەروەها لەو باوەڕەدام كە زیادەڕۆیی نییە گەر بڵێم كە ئەم هونەرە لە بەرهەمەكانی هنری مۆردا جارێكی دی هاتەوە ژیانەوە.

هنری مۆر هیچ پڕوپاگەندەیەكی بۆ ڕەسەنایەتی‌و تازەگەری بەرهەمەكانی خۆی نییە.. ئەو لە ساڵی 1898 لە كاستلفۆرد=Castleford یوركشیر- هاتۆتە دنیاوە.. بەرهەمەكانی زادەی ئەزموونەكانی هونەرمەندانی بە ساڵاچووتری پێوە دیارە" نمونەی ئەمانە جاكوب ئیپستاین‌و ئێریك گیل=Eric Gill-و بێگانەكانی وەك برانكوزی‌و زادكین=Zadkine-.

هنری مۆر بەیاریدەی پایەداری‌و هاوگونجاندنی كارەكانییەوە، لەسەر لوتكەی شێوازی هونەری نوێی ئینگلتەرادا دابین دەبێت.

كاردانەوەی پیاوێكی سادە لەبەرامبەر تازەگەریی ئەم بەرهەمانەدا هەرچییەك بێت، ناچار دەبێت دان بەوەدا بنێت كە لەو بەرهەمە هونەرییانەدا مەبەستێكی لەبارو گەلێ پتەو، ویستی خودی‌و بێ گرنگی دان، بە بڕیاری یەك لەدوای یەك بۆ زاڵبوون بەسەر ماددەی نامۆی ئەو جۆرە خودێتییە ئاسان نییە.

بەبێ ئەوەی نیازی خۆدەرخستن‌و چاتر فرۆشی لە كایەدا بێت، تا ئەگەریشی ئەو شتەی كە دەتوانرێ بە "دیدەگای نوێ" ناوبرێت لە كایەدا بێت، دیسانەوە پێویست دەكات دەرگەی ئەو جیهانەی شكڵە نامۆیانە هێواش بخەینە سەر پشت، ئەم شكڵانە ئاشكرانین" بەڵام بۆ هەبن؟ ئایا هیچ بەرهەمێكی مەزنی هونەری لەسەرەتای دەركەوتندا لای ڕێبواران ئاشكرابووە؟

بۆ تێگەیشتن- دەستكردن بە دەرك كردنی- بەرهەمی هونەریی هنری مۆر پێویستە بگەڕێینەوە سەر بنەمای سەرەتایی هونەری پەیكەرسازی كە لە بەشی پێشودا دەربارەی

دواین (وێنە67و 68) پەیکەرسازی بە ناونیشانی یەك هونەر چی ڕویەکی دیاریکراوی هەیە؟ هەڵبەتە مادەو پیشەگەریی پەیکەرسازی: بریتییە لە بڕینی یا تاشینی ماددەیەکی تا ڕادەیەك ڕەق.

تا ئەم ڕادەیە لە خودی وشەی پەیکەرسازی یا پەیکەرتاشی دا والا دەبێت زیاتر دەربارەی پێناس کردن پێویست ناکات.

بەلام کاتێ بە کارکردن بەم ئەنجامە دەگەین" ڕووبەڕووی ئەم پرسیارە بنچینەیی یە دەبینەوە: ئەو پەیکەرەی کە دەبێت بتاشرێت چییە؟ لە چوارسەد ساڵی ڕابردودا هونەرمەندان گوتویانە: ئێمە لە پارچەیەك بەرد یا مەڕمەڕ شکڵی جوانو لەبار، یان جوانییەك کە ڕەوتی ڤینۆس بەدی دەهێنێ، یا شێرێك لە حاڵەتی مردن دا یان باڵندەیەك لە کاتی فڕین دا دەتاشین" خڵکیش لە شارەزایی و کارامەیی پەیکەرتاش و ئەنجامدانی ئەم کارە سەختەی سەریان دەسوڕێت.

بەلام مەبەستی پەیکەرسازیی هونەرمەندێکی وەك هنری مۆر بە هیچ شێوەیەك لەم کارانە ناچێت، مۆر هیچ بە ئاراستەیەك پەیوەست نییە کە سەروکاری هەبێ بەڕوکەشی شتەکانەوە کە لە ڕاستی دا سرۆش بەخشی کارەکانین (ئەگەر شتێکی دەرەکی بوونی هەبێت).

سەرەتا بیرەکانی مۆر ئاڕاستەی ماددەی کارە، ئەگەر ماددەی کار بەرد بێت، ئەوا بینای بەردەکەو پلەی ڕەقی بەردەکە پەرچەکرداری ئەو دیاری دەکەن لە بەرامبەر ئامرازی بەرد تاشیندا، وای ڕەچاو دەکات کە ئەو بەردە لە بەرامبەر هێزە سروشتییەکاندا وەك با و ئاو، چی پەرچەکردارێکی هەیە... چونکە ئەم هێزانە بە درێژایی کات چۆنێتی ڕەچەڵەکی ئەو بەردە ئاشکرا دەکەن... سەرئەنجام لە خۆی دەپرسێت کە لەو پارچە بەردەی لەبەردەمیدایە چی شکڵی دەشێت بە چاترین شێوە بتاشێت" وە ئەگەر ئەو شکڵە بۆ نمونە ژنێکی ڕاکشاو بێت، هنری مۆر بە خەیاڵیدا دێت (ئەمە کارێکە کە قەریحە و دیدی تایبەتی ئەوی پێویستە) کە ئەو ژنە ڕاکشاوە چی دەرکەوتێکی هەبێت —ئەگەر

بێتو گۆشتو خوێنی ئەو ژنە لەبەرامبەری ئەودا بگۆڕدرێت بە بەرد– بەردێ کە شێوەو بینای تایبەتی خۆی هەیە، لەم حاڵەتەدا لەشی ئەو ژنە دەشێت شێوەی گردۆڵکەیەك یا چەند گردۆڵکەیەك لە خۆی بگرێت– هەمان کە لە هەندێ لە پەیکەرەکانی دا دەبینرێت.

لەسەر ئەم بنەمایە پەیکەرسازی کۆپی دروست کردن نییە لە شکڵ و شێوەی تر.. بەڵکو بریتییە لە گوێزانەوەی مانا لە ماددەیەکەوە بۆ ماددەیەکی دی. بەڕای من ئەم خاڵە تاڕادەیەکی تەواو سادەیەو پەسەند کردنی دژوار نییە:

لەگەڵ ئەمەیشدا هەمان خاڵ تەنها کلیلە کە دەروازەی تێگەیشتنی بەرهەمەکانی هنری مۆر دەکاتەوە، بۆیە تێناگەم کە بۆچی خەڵکی سادە لە بەرامبەری ئەم جۆرە بەرهەمانەدا هێندە سەرلێشێواو دەبن.

لەم بنچینە سەرەتاییە یەوە بنچینەیەکی تریش وەڕو دەکەوێت کە گەلێ بەسەرنج ترو تەسك ترە، بەڵام بۆ پەیکەرێکی تەواو هێندە پێویست دەکاتو گەورەترین هۆکاری مۆر لە سەرکەوتنیدا کە ئەو بەسەر زۆربەی هاوچەرخانی دا لەبارتر دەکات، ڕاستەوخۆ لەمەدایە کە ئەو لە هەمان بنچینەدا نیازەکانی پەنهانە واتە ئاڕاستە بوونو سەرنجی ئەو.

ئەگەر مرۆڤ سەرگەرمی تۆمارکردنی (کۆپیکردنی) مادەیەك بۆ ماددەیەکی تر بێت، پێویست دەکات ئەو ڕوخسارە لە دەرونەوە بەرەو دەرەوە ئافەریدە بکات.

زۆربەی شێوازەکانی پەیکەرسازی، تەنانەت بۆ نمونە پەیکەرسازانی میسری دێرین– قەبارەیان بە کۆمپۆزیشنی لایەنی دوو دووری بەدی دەهێن.. ئێمە لەو یەکەیەدا ناتوانین کۆی ڕووەکانی یەك قەبارە ببینین، لەسەر ئەمە پەیکەرساز پارچە پارچەی بەرد دەپروێنێو هەوڵ دەدات کە لەگشت ڕوویەکەوە ڕەزامەندانە بگاتە ئەنجام.

بەم شێوەیە دەتوانێت ڕێگەیەکی درێژ لەسەرکەوتنیدا ببڕێت، بەڵام سەرکەوتویی هونەرمەند جیاوازە لە سەرکەوتویی پەیکەرسازاێك کە کاری داهێنراوی گوایە تەنها ئەنجامێکی چوار دورییە، لە بۆچونێکەوە سەری هەڵداوە کە ڕاستەوخۆ ماددەی جێکاری ئەوە.... بەم پێیە شێوەو ڕوخسار بریتییە لە درکاندنی دیدەیی ڕوو بە یاریدەی

پەیکەرساز، کە بەشێوەیەك خەیاڵەکانی خۆی بەسەرچەقی قورسایی پارچە بەردێکدا گریمان دەکات.

بە ڕابەریی ئەم دیدەیە پارچە بەرد وردە وردە گۆش دەبێ و لە حاڵەتی بوونی ڕێکەوتییەوە بۆ حاڵەتی بوونی ئایدیالی دەگۆڕێت. ئەمەیە کە پێویستە ئامانجی سەرەتایی هەر چالاکییەکی هونەری بێت.

## 82- باربارا هیپورس = Barbara Hepworth

باربارا پەیکەرسازێکە کە کارەکانی لە تویێی پانزە ساڵی دواییدا گەیین بە قۆناغێك لە پاراویی "ئەبستراکتی"، کە بەڕوانگەی بینەر، بەڕێکەوت دەشێت بەرهەمەکانی نزیك بن بە ئەندازیارییەکی ئاسمانی.

یۆنانییە دێرینەکان بە کارامەیی دەیانزانی کە ڕەگەزی وێنەیی دەکرێ لەسەر بناغەی دیاری کراوی ژمارە یا هاوگونجاندن ڕوون بکرێتەوە، دەشێت بەر لەوانیش میسرییەکانیش بە ئاگا بووبن لە هەمان باوەڕ.

ئەفلاتون شیاوی داهێنانی هونەری لەسەر بنچینەی ئەم یاسایانە، لەبری لاسایی کردنەوەی تەواوی سروشتی، کردە جێگەی باس.. لە قۆناغە هەمە جۆرەکانی مێژووی هونەردا، هونەرمەندان هەندێجار ڕاستی نواندنیان بە یەکجاری وەلاوە ناوە لەبەرئەمەی کە هەستیان دەکرد کە جیهان پاڵەپەستۆ دەخاتە سەریان (هەمان کە دەشێت لەسەردەمی بەردینی نوێدا یان لەسەردەمی ڤیکینگەکان دا وەها بووبێت)- یان لەبەر ئەمەی کە هەستیان دەکرد کە لاسایی کردنەوەی کاری خواوەند جۆرێکە لە سەرپێچی و کفر (هەمان کە لە شارستانیەتی ئیسلامیدا باوە).

بەڵام تەنها لەسەردەمی نوێ دایە کە دەبینین جۆرە هونەرێکی ناوێنەیی بە ناونیشانی شێوازێکی جیاو گونجاو پێك دێت کە لە جەنگدایە دژی کۆی مەکتەبەکانی زەمانەی وەك (ڕیالیزم- ئیمپریسیونیزم- ئیکسپریسیونیزم- سوریالیزم..هتد).

ئـەم ڕەوتـە نوێیـە خـەڵكى بـە هونـەرى "ئەبـستراكت" نـاوى دەنـێنو مەبەسـت لـە هونەرێكە جودا لە سروشت، یانى شێوەیەكى پاراو یا بنچینەیى یـە كـە لـە بەشـى بینـراوو بەرجەستەبوو "مشهود و ملموس" ڕووت كراوەتەوە.

زاراوەى بەهونەرى "هونەرى ئەبستراكتى" هێندە ڕەزامەند بەخشى نییـەو هەنـدێ لـە قوتابخانەكان زاراوەى –تەركیبى=پێكهـاتویى0 پێـشنیهاد دەكـەن یـا بـەكار دەبـەن وەك (كۆبیزمەكانو نـەن فیگۆریـستەكانو هتـد...) بـەڵام ئـەم نازاناوانـە زۆرجـار مەبەسـتێكى دیاریكراو نیـشان دەدەن ( بـۆ نمونـە شـێوازێكى بیناكـارى لەهـەرجۆرە پەیوەندییـەك بـە سروشتەوە نكوڵى دەكات . ئەگەر چى لە پەیوەندیدایە لەگەڵ بینـاى وێنـەیى مـاددەدا یـا ئەو شكڵانەدا كە ئۆرگانیزمە زینـدووەكان لـە خۆیـانى دەگـرن)... وە زاراوە گـشتییەكانى هونـەرى ڕیالیـستىو هونـەرى ئەبـستراكتى بـۆ نیـشان دانـى دوو سـنورى كۆتـایى بـەیانى هونەرى گونجاوترن.

هەنـدێك لـە هونەرمەنـدانى ئەبـستراكت وەهـا لـەكارى خۆیـان سـورن كـە هـەرگیز هـەنگاوەكانیان لـە بازنـەى وێنـەى پـاراو بـەرەو دەر هـەڵناهێنن– پیـت مونـدریان= Piet Mondrian– وێنەكێشى هۆڵەندى لەو كەسانەیە.

هەروەها وێنەكێشانى ڕیالیستى–یش گەلێكن ئامادەنین وێنـەى ئەبـستراكتى بكێـشنو تەنانەت ئامادە نین لە خەونەكانیشیان دا وێنەى ئەبستراكتى ببینن...

هەروەها وێنەكێشى ئەبستراكتى ئەوتۆش هـەن كـە وێنەكێـشانى ئەبـستراكتیان تـەرك كردووەو گەڕاونەتەوە بۆ كێشانى وێنەى ڕیالیستى.

هـەروەها وێنەكێـشى ڕیالیـستى خـاوەن ئامـادەیى وەهاشمـان دیتـووە كـە ناگـەهان ڕیالیزمیان خستۆتە لاوەو خویان داوەتە بوارى ئەبستراكتى.

هەروەها كۆمەڵێكى دى هەن كە بەڵگە بـەدى ناكـەن كـە لـە نێـوان ئـەو دوو شـێوازەدا هاتوچۆ نەكەنو باربارا هیپورس بەم گروپەوە پەیوەستە.

کاره سەرەتاییەکانی باربارا هیپورس (32– 1929) لاسایی کردنەوەی سروشتی بوونو زیاتر لەسەر بنچینەی تۆژینەوەی بە سەرنجی لەشی مرۆڤ دروست دەکران.. هەندێ لەم پەیکەره سەرەتاییانە لەوپەڕی جوانی دان، تا ئەو ڕادەیەی کە هونەرمەند بە گشتی لە مۆدێل بێ نیاز دەبوو و هەرجۆره هێمایەکی دەرهەق شتە سروشتیەکان دەخستەلاوە (بۆ نمونە ناوی پەیکەرەکانی لە بری ناوی "دایكو منداڵ" ناو دەنا "شکڵ" یان "گروپ" یا "بازنە" یا "لولەك" ...هتد.

لە پاش چەند ساڵێك باربارا جارێکی دی بەرهەمی خستە ڕوو کە زیاتر ڕووی ڕیالیستیان هەبوو... ئەوەی لەو کارانەی دواییدا سەرسوڕێن بوون لایەنی ڕیالیستیی کارەکانی نەبوو، بەڵکو هەست قوڵیی لە ڕادە بەدەریان بوو کە سەری مرۆڤیان دەسوڕماند ... باربارا لە حاڵەتێکدا کە لە قۆناغێکی کارکردنی ئەبستراکتی وەدەر کەوتبوو کە هاو هەستیی بۆ شکڵە سروشتییەکان گەلێ بەهێزتر بوو بوو و پیشەکیشی لەڕووی هێزو نیانییەوە گەشەی کردبوو" سەرسوڕێنترین لەمەیش ئەو چۆنێتییە ڕیالیستییەیەتی کە بەهێزترو کاریگەرترە.

وێنەکێشانو هێڵکارییە نوێکانی (کە لە گەلێکیان دا پیشەی ڕەنگی ڕۆنو قەڵەم–ی تێکەڵ کراو) بۆ دوو دەستە دابەش دەبن– ڕاهێنانەکانی مۆدێلی ڕووتی ژنانەو بابەتەکانی نەخۆشخانە..و هەمان دیمەنەکانی نەخۆشخانە — لە ڕووی زەبرو بەهێزی بەیانو هەستیاریی بەتینەوە گەلێ بەهێزن... هەڵبەتە نەخۆشخانە جێگەیەکی کاریگەرە، باربارا زۆر جار لە ژوری کاردا بابەتەکانی خۆی هەڵدەبژارد.

لە تابلۆکانی وێنەکێش دا ئازارو ترس هەڵدەچێت– وەك ئەوەی مەبەستی نیشاندانی نەشتەرگەری ئارەزوی داهێنانی کردبێت... یان لەسەر ڕوخساری نەخۆشە لاوازەکانی ڕاوەستابێ و وێنەی کێشابن کە وەك "هاوبێژەرانی" یۆنانی لەمبەرو لەوبەر ڕاوەستاون.. ڕامبراندت و کۆی وێنەکێشانی هۆڵەندی لەم جۆره بابەتەیان پێخۆش بوو.

بەلاَم تابلۆکانی باربارا ئێمە ناخەنە یادی ئـەو جـۆرە تـەرزەی ڕیالیزمـەوە، بـەڵکو بـە بینینـی تابلۆکـانی زیـاتر دەکەوینـە یـادی شـێوازی سـادەو مرۆڤانـەی هونـەری سـەدەی پانزەیەم لە ئیتاڵیا.

جۆرە هەستێکی دیارکردنی وێنەی مەزن بوونی هەیە کە تەنها لای هونەرمەندانێ بەدی دێت کە دەرهەق بە وێنەی ئەبستراکتی ئاگادارن.

هونەرمەنـدانی ئیتالیـا سـەبارەت بـە هونـەری ئەبـستراکتی بینـایی گـەلێ بـەئاگان .. دەربارەی باربارا (کـە یەکسانە بـە هنـری مـۆر) پێویـستە بڵـێین مەزنییـەك کـە ئـەو لـە پەیکەرە ڕیالیستییەکانی دا بـە دەسـتی دەهێنێـت، ئاکـامی ئەزمونـەکانێتی لـە زەمینـەی وێنەی پاراودا = Pure form—.

هونەری ئەبستراکت—یش (جگە لە شێوازی کونـستروکتیڤیزم— کـە پێـشتر دەربـارەی دوایـن) هـەروەکو هونـەری ڕیالیـستی هەمیـشە لـە دوچـاری ئـەم مەترسـییەدایە کـە بـە شێوازێکی قوتابخانەیی (ئەکادیمیك) داتەپێت.

هونەری ئەبستراکتی ناتوانێت توانامەندێتییەکانی خۆی لەسەرچاوەی کۆی ڕووەکان دا نوێ بکاتەوە... مەبەستم لەم سەرچاوانە تەنها سروشت نییە، بەڵکو زیاتر ئـەو توانایانەیـە کە ڕەوتی گەشەی خودی ژیان دیاری دەکەن.. دەشـێت تـەنها بـە هـەمان بەڵگـە بتـوانین بڵێین کە هاتوچۆ لە نێوان ڕیالیزمو شێوازی ئەبستراکت دا بۆ هەر هونەرمەندێك پێویستە.

ئەمـەش بـەو مانایـە نییـە کـە هونـەری ئەبـستراکت هونەرمەنـد بـە نـاوی قۆنـاغی ئامادەبوون بۆ کاری ڕیالیستی مەشق پێ بکات... چـونکە هونـەری ئەبـستراکتی بویـەکی تایبەتی خـۆی هەیـە .. بـەلاَم گـۆڕانی شـێوازێك بـۆ شـێوازێکی دی لـە ئەبستراکتەوە بـۆ ڕیالیست پێویست ناکات هاوڕای بەسەرهاتێکی قوڵی دەرونی بێت.. ئەم گۆڕانە بێجگە لـە گۆڕینی ئاڕاستەو ئامانج شتێکی دی نییە.

ئەوەی لەم مییانەدا چەسپاوە یا بەڵگە نەویستە بریتییە لە مەیلی داهێنانی ڕاسـتییەك، داهێنانی جیهانێکی گونجاو لە وێنەی زیندوو.

لەم لایەنەوە ئەم " ویستی مەیلدارێتی بۆ وێنە" لە ئافەریدەکردنی وێنەکاندا ئازادانە ڕەنگ دەداتەوە، بەو مەرجەی کە تێبگەین ئازادی یانی لە دەستدانی هاوسەنگیی جوانناسی" و لەلایەکی تریشەوە هەمان – ویستی مەیلدارێتی بۆ وێنە – بە وێنەی بەیانی هەڵبژێردراوی بە چەند ڕوویەك لە جیهانی زیندوو بەدی دێت– بە تایبەتی لە شێوەی ئاگایی یەکی توانامەند دەرهەق بە هەستی ژیانو لە ژیانی مرۆڤدا.

چەند وشەیەك لە وتەکانی باربارا ئەم خاڵە ڕۆشنتر بەیان دەکەن" "کاری ریالیستی عەشقی هونەرمەند سەبارەت بە ژیانو مرۆڤو زەمین نوێ دەکاتەوە... کاری ئەبستراکتی کەسێتی هونەرمەند ئازاد دەکاتو درکاندنەکانی ئەو تیژتر دەکات" بە جۆرێك کە لە سەرنجدانی ژیان دا ئەوەی کە بە قوڵی کار دەکەنە سەر مرۆڤ تەواوییە یان نێتی دەرونییە: بەشەکان هەریەکەیان لە جێگەی خۆیان دا دەمێننەوە و هەرشتێك لە خۆیدا نمایندەی یەکبونە." دەبینین کە تەواوی ڕووبەری هونەر کە بەم دوو کۆتایی یە وەڕو دەخرێن لە توێی یەك هزری تاکدا لەتەك یەکتریدا پایەدارن.

# بەشی سێیەم

## 83– دیدەگای هونەرمەند

لەم یاداشتانەدا بە ڕوویەکی گشتی دیدەگای تەماشاکەرم هەڵبژاردووە، ئێستاکە مەیلدارم کە دەستکەوتی هونەر لە دیدەگای کەسێکەوە بتۆژمەوە کە بەرهەمی هونەری بەدی دەهێنێت.

هونەرمەند چی دەکات؟ بۆچی دەیکاتو بۆ کێی دەکات؟ کاتێ وەڵامی ئەم پرسیارانەمان دایەوە، دەشێت بتوانین بڵێین کە ڕۆڵی هونەرمەند لە کۆمەڵگە دا چییە_ واتە ئەمەی کە هونەر بۆ گشت ئێمە چی گرنگییەکی هەیە و لە ڕێکخراوی کۆمەڵگەدا چی جێگەیەك پێویستە بە هونەرمەند بدرێت.

## 84– دیدەگای تولستۆی

پێناسی بە ناوبانگی تولستۆی لە گەلە کردنی هونەردا بەم وشانە بەیان دەکرێن: "بێدارکردنەوەی ئەو هەستەی کە مرۆڤ ئەزمونی کردووە لە ویژدانی خۆیدا" وە لە پاش بێدار کردنەوەیان، گواستنەوەیان یا گێڕانەوەیان بە یاریدەی جوڵە یا هێڵ یا ڕەنگ یا دەنگ یا ئەو شکڵانەی کە بەیاریدەی وشەو ئاخاوتن بەیان دەکرێن، بەجۆرێك کە ئەوانی تریش هەمان ئەو هەستانە بئەزمونێنن.. ئەمەیە چالاکیی هونەری."

"هونەر چالاکییەکە مرۆڤانەو کۆی ئەمەی کە تاکە کەس بە ڕوویەکی ئاگایانە و بە یاریدەی هەندێك نیشانەی دەرەکیی هەستیانە کە لە ژیان دا بوونی هەیە بۆ ئەوانی دی دەگێڕێتەوە.. بە جۆرێك کە ئەوانی دی بکەونە ژێر کاریگەری هەمان ئەو هەستانەوەو چێژی ئەو ئەزمونانە بکەن."[1]

1- What is Art? Trans-Aylmer Maude, Oxford (world, classics), 1930 p.123

## 85- تۆلستۆی و ۆرد زۆرس

ئەم تیۆرییە تاوەکو لە ڕووی وشەوە کە بە یاریدەیانەوە بەیان کراوە، وەکو تیۆری ۆردزۆرس-ە دەربارەی شیعر" کە دەڵێت:"شیعر لەو سۆزانەوە سەرچاوە دەگرێت کە لە حاڵەتی سکون= خامۆشی دا بەدی هاتون...

سۆزەکان جێگەی بیرکردنەوە دەگرنەوە تا وەکو لە پای جۆرە بەرپەرچێکدا، خامۆشی هێدی هێدی نادیارو بێشوێنەوار دەبێ و سۆزی نمونەی هەمان ئەو سۆزانەی کە پێشتر بابەتی بیرکردنەوە بوون لەسەرەخۆ سەرهەڵبدەنو لە هزردا وەرو بکەون." لە کۆی ڕووەوە، تیۆری تۆلستۆی دەربارەی هونەر بە ڕوویەکی سەرسوڕێن لە تیۆری ۆردزۆرس دەچێت" بۆ نمونە هەردوکیان سورن لەسەر ئەمەی کە هونەر پێویستە بە تەواوی شایەنی تێگەیینو شایەنی پێگەیین بێت (واتە بگات بە خەڵکی)... دەربڕینی ۆردزۆرس کە دەڵێت:"مرۆڤ لە حاڵەتی ئاخاوتن دا لەگەڵ مرۆڤی تردا" پێناسەیەکی تەواوی هونەرمەندی ئایدیالی تۆلستۆی-یە، لەمەیش دا کە ۆردزۆرس دەڵێت: بەیانی شیعری پێویستە پشت بە "زمانی سادەی خەڵکی" ببەستێت، داوایەکە یا خواستێکە کە زرنگەی چەندین جار لە کتێبی تۆلستۆی دا بەرگوێ دەکەوێت.

## 86- دیدەگای ماتیس

ئەم پێناسە تیۆرییە دەتوانێ ئەنجامی داهێنان بە پێناسەیەکی وردی یەکێ لە هونەرمەندان پێوانە بکرێت، هەڵبەتە نامەوێت لە پێناوی لەم جۆرە وتارانەدا پلەیەکی تایبەت بڕسکێنم، چونکە دەشێت هونەرمەندان پشت گوێخەر تر لە ڕەخنەگران بدوێنو لە ڕاستیشدا وایە. زۆرجار هونەرمەندان هێندە بەتاڵ نین لە داهێنان کە بتوانن وەدەستهێنانە هزرییەکانی خۆیان ڕوون بکەنەوە.

بەڵام هونەرمەندانی نوێ توانای تێبینییەکانی خۆیان پەروەردەو گۆش کردووە واتە لە پێناوی بەرگریکردن لە خۆیان ناچاری ئەو کارە هاتوون.

هەندێ لە وتەکانی سیزان کە پێشتر تۆمارمان کردون، بەهایەکی کەمتریان لەو وتانە نییە کە هنری ماتیس–یش نوسیونی.. چەند ساڵانێ لەمەوبەر لە 1908، ماتیس یاداشتەکانی هونەرمەندێك–ی لە گۆڤارێکی فەرەنسی دا بڵاوکردەوەو منیش چەند پارچەیەك لەو یاداشتانە لێرەدا بڵاو دەکەمەوە:

"بە ڕوانگەی من حاڵەتی توڕەیی لە فلان ڕوخساردا والا نییە کە دەردەکەوێت، یان لە فلانە جوڵەی پرتاویشدا نییە.. بەڵکو لە بارودۆخی گشتیی تابلۆکانی من دایە واتە لەو جێگایەدا کە پەیکەرەکان= ئەندامەکان گرتویانە.

ئاتمۆسفاری خاڵیی دەوروبەری فیگۆرەکان، هاوگونجانیان،هەرشتێك بەشی خۆی هەیە. کۆمپۆزیسیۆن کاری= پێك هاتنەکان– یانی هونەری ئارایشتی ڕەگەزی هەمەجۆر بەو شێوە جوانکارییەی کە وێنەکێش بۆ بەیانی هەستەکانی خۆی هەڵی دەبژێرێت.

لە تابلۆیەکی کێشراودا هەر بەشێك جیاوازانە وەڕو دەکەوێت ئەو جێگەیە دەگرێ کە بنچینەیی یا پلەی ناوەندی بەپێی گونجاندنی باری شتەکە.

هەرشتێ کە لە تابلۆدا سودی نەبێت، بە هەمان بەڵگە زیان بەخشە.

بەرهەمی هونەری لە هارمۆنییەتی کۆی بەشەکان دەدوێت: هەر بەشێکی زیادە لە هزری بینەردا جێگەیەك داگیر دەکات، واتە جێگەی بنچینەیی دەگرێتەوە."

پاشان ماتیس تەرزی کاری خۆی بەیان دەکات :

"ئەگەر من لەسەر ڕووی قوماشێکی سپی پارچە ڕەنگی شین و سەوز و سور لەتەك یەك دابنێم " بەدانانی هەر پەڵەیەکی ڕەنگی ، هەریەکێ لەو ڕەنگانەی کە پێشتر دامناون، گرنگیی خۆیان لەدەست دەدەن ... گریمان کە نیازمە دیمەنێکی ناوەکی بکێشم : لەبەرامبەری خۆمدا دۆڵابێکی جل و بەرگ دەبینم ، وە ئەو دۆڵابە هەستی ڕەنگی سور

بەڕوویەکی زۆر زیندووانە لە من دا بێدار دەکاتەوە ، لەسەر ئەمە من ئەو ڕەنگە سورەی کە لەلام ڕازی کەرانەیە ڕۆ دەکەمە سەر تابلۆکەم .

لەنێوان ئەم ڕەنگە سورە و سپێتی تابلۆکەدا پەیوەندییەك بەدی دێت ... کاتێ کە من ڕەنگی سەوز سەربارییان دەکەم و پانتایی ژورەکە بە ڕەنگی زەرد نیشان دەدەم ، هەمدیسانەوە لەنێوان زەرد و سەوزو سور و سپی دا پەیوەندییەکی نوێ بەدی دێت ... بەڵام ئەم ڕەنگە جۆراوجۆرانە بەرامبەر بەیەك یەکتری دوانە "خنسی" دەکەن ( ڕەنگی دوانە ، دەتوانین بڵێین ڕەنگی نێرەموکن کە لە تێکەڵی دوو ڕەنگی سەرەکی بەدی دێت واتە ڕەنگی گیراوە یا ئاتاجی دووڕەنگ کە وازیان لە ڕەنگە هەووەڵییەکان هێناوە و دوانەن لەتەك تێکەڵ بونیان دا " وەرگێڕی کوردی" پێویستە ئەو ڕەنگە هەمەجۆرانەی کە من بەکاریان دەبەم هاوڕێژەیەکی ئەوتۆیان هەبێت کە یەکتری لەناو دەبەن.

بۆ وەدەست هێنانی ئەم مەبەستە پێویست دەکات بیرەکانم بە گونجاوی بەدی بهێنم.. پەیوەندیی نێوان ڕەنگەکان پێویستە وەها لە برەودا بن کە لەبری ئەوەی یەکتری لەناوبەرن“ بە پێچەوانەوە یەکتری دروست بکەنو یەکتری بگونجێنن... پێکهاتێکی نوێ لە ڕەنگەکان بە دوای یەکەم ڕەنگدا بەدی دێتو کۆی بۆچونی من بەدی دەهێنێت.. ناچار دەبم ڕەنگەکان جێگۆڕکێ پێ بکەم، بە جۆرێك کە ئەگەر لە پاش گۆڕانکاریی دوپاتی ڕەنگی سەوز لەبری ڕەنگی سور دا زاڵ بێت، وەها دەردەکەوێت کە تابلۆکە بە تەواوی گۆڕانکاریی بەسەردا هاتووە.

ئەم خواستە بە چاکی ڕوونی دەکاتەوە کە چۆن هارمۆنییەتی ڕەنگێکی تایبەت لە تابلۆیەکی وێنەکێشان دا بەدی دێت“ بەڵام لە سنوری کۆمپۆزیشنە دوو دوورییەکانی دیمەنە ڕەنگینەکانی یابانی زیاترمان کێش ناکات .

ڕونکردنەوەیەکی دیکەی ماتیس کە لە هەمان وتاردا هاتووە لەم بارەیەوە زیاتر یاریدەمان دەدات: "خاڵی مەبەست ئەمەیە کە چۆن سەرنجی بینەر وەها ئاراستە بکەین کە بینەر تەماشای بەسەرنج لە تابلۆ بدات، وە بیر لە هەموو شتێك بکاتەوە، لەو شتەیش

لە ئێمە نیازمـان بـوو بیکێـشین، پێویـستە ئـەو واتـە بینـەر ناچـار بکـەین ( بـەبێ ئـەوەی نائارامی بکەین) یا پێویستە ڕێگەی نیشان بدەین کـە چـۆنێتی ئـەو هەسـتانەی کـە بـەیان کراون بئەزمونێنێت... سەر سوڕماندنی بینەر کارێکی ترسناکە.. بـۆ بینـەر پێویـست نییـە کە ڕون کردنەوەو شیکردنەوە لـە ئەسـتۆ بگرێـت— چـونکە بـەم واتایـە ئاگـاداریی ئـەو یـا سـەرنجی بینـەر دەوەسـتێ، واتـە ئـازادیی لـە دەسـت دەدات — ئەگـەریش لـە بەرامبـەر ڕەنگەکان دا زیاڕۆیی بکەین ئەوا مەترسی ئەوە دێتە پـێش کـە ڕونکردنـەوەو شـیکردنەوە دەست پێ بکات.

مەسەلەکە لای ئێمە بەم شێوەیە بەدی هاتووە کە بەهێزیو توانای تابلۆ بپـارێزینو لـە هەمان کاتدا بە لێکچون—یش نزیك نزیك بین.

لە مەرجایەتی ویستراودا بەبێ ئەمەی خود بزانێت، بوار بە خـۆی دەدات کـە گرفتـاری تەڵەکـەو فێڵـی تابلۆکـە ببێـت.. پێویـستە ئاگـادار بـین کـە لەلایـەن بینـەرەوە جوڵـەی سەرسـوڕماندن سـەرهەڵئەدات، ئەگەرچـی ئاگایـشی لێـی نـەبێت، پێویـستە بـەپێی توانـا پیشەکە بشاردرێتەوە."

## 87– ڕاگەیاندن= هەستو تێگەیشتن

دەبینین لە نێـوان تولـستۆیو مـاتیس دا هـاوڕایی یـەکی زۆر بـوونی هەیـە.. جیـاوازی دەشێت بە یەك وشە سنوردار بێت: گواستنەوە= پێگەیاندن...

تۆلستۆی دەیەوێت کە هونەرمەند نەك تەنها لە توانایدا بێت هەستە کـانی خـۆی بـەیان بکات، بەڵکو بشیانگوێزێتەوە.

بە ڕوانگەی من هەمان بە هەڵـەدا چـوون بـوو کـە ئـەوی بـەو تەگەرانـە دوچـار کـرد... چونکە ئەگەر مرۆڤی هونەرمەندو هەستەکانی لە یەك لادا دابنرێت، ئـەو لایـەی دیکـەی کـە ئەم هەستانە پێویستە بۆ ئەو بگوێزرێنەوە" کێیە؟ بێگومان تۆلستۆی ناچار بوو بڵێت کۆی خەڵکی.... بەڵام ئەگەر بەم جۆرە بێت، کەواتە پێویستە هونەر هێندە شایەنی تێگەیـشتن

بێت کە سادەترین لادێی بتوانێ تێی بگات، کەواتە دەربڕینەکانی ئوریپیدس، دانتێ، تاسۆ، میلتۆن، شکسپیر، باخ، بتهۆڤن، گۆتە، ، ئیبسن0 لە ڕاستی دا پەیامەکانی کۆی بەرهەمە هونەرییەکان بێجگە لە داستانەکانی کتێبی پیرۆزو سرودو ئەفسانەی بالۆرەو "کوختی مام تۆم" و "ئاوازی کریسمس" بەیەك ڕادە هەزم بکەن.

تیۆرەکە لە دەزگایەکی زۆر ئالۆز دەچێت، هێندە بەسە کە یەکێ لە پارچەکانی جێگۆرکێ پێبکرێت تا خراپ بکەوێتە کار یا لەیەك بترازێتو بشکێت. چاك کردنێك. کە من نیازمە لە پێناسی تۆلستۆی دا بەدیی بهێنم تاوەکو لەگەڵ واتای ماتیس دا جا بگونجێت— وە گرنگتر لەوەیش تا لەگەڵ ڕاستەقینەدا بگونجێت، چاك کردنێکی سادەیە.

من نیازمە بڵێم کە کاری هونەر ئەمە نییە کە هەستەکانی بگوێزێتەوە بە جۆرێك کە ئەوانی تریش هەمان هەست بئەزموونێنن" ئەمە تەنها کاری خامترین بەشی هونەرە— مۆسیقای سادە، مێلۆدراما، ڕۆمانی سۆز فرۆشێن و نمونەی ئەمانە.

کاری ڕاستەقینەی هونەر بریتییە لە بەیانی (هەستەکان)و بەدی هێنانی (تێگەیشتن).. ئەمە هەمان خاڵە کە یۆنانییەکان بە چاکی پەییان پێ بردبوو... بە ڕوانگەی منیش کاتێ کە ئەرستۆ دەڵێت: مەبەستی هونەری شانۆ پاڵاوتنی سۆزەکانمانە... مەبەستی لەمە زیاتر نییە.

ئێمە کاتێك پەیوەندی لەگەڵ بەرهەمێکی هونەری دا پەیدا دەکەین کە پڕ بێ لە بارگەی عاتیفی... ئێمە لە بەرهەمی هونەریی ڕەسەن دا شوێنەواری ئەم سۆزە بەدی ناکەین، بەڵکو ئەوەی هەستی پێ دەکەین ئاشتی و ئارامی و مەزنییە. هیچ شتێك گەمژەترانە نییە لەم دیمەنەی کە لاوێکی بایی لە بەرامبەر بەرهەمێکی مەزن دا بیەوێت هەستیاری خۆی بخرۆشێنێت— لە بەرامبەر بەرهەمێکدا کە تیایدا کۆی هەستەکانی هونەرمەند لە ئازادیی هزری کامڵدا وچانی گرتووە.. ڕاستە کە بەرهەمەکە پەرچەکرداری لەشی تایبەت لە ئێمەدا دەخرۆشێنێ: چونکە کێشو هارمۆنیو یەکبون دەرك پێ دەکەینو ئەم خاسیەتانەش کاردەکەنە سەر دەمارەکانمان.

بەڵام ئەمە کاریگەری خرۆشێنەرانە نییـە، بـەڵکو ئارامکەرەوەیـە، ئەگەرچـی ئـەنجامی ئەم کارتێکردنەش لە ڕوانگەی دەروونزانییەوە بە عاتیفـە نـاو دەبـەین، ئـەم سـۆزە شـتێکە بەگشتی جیاوازە لەو سۆزانەی هونەرمەند لە حاڵەتی داهێنانی بەرهەمدا ئەیانژێنێ‌و بەیانی کردوون.. چـاترە حاڵـەتی بینـەر بـە سەرسـوڕمان‌و چـاك بـوون "تحسین" ناوبـەرین، بـە زاراوەیەکی وشك تر بەڵام ڕاستتر پێویستە بڵێین ئەم حاڵەتە حاڵەتی ناسینە... ڕێزێـك کـە بە هونەرمەنـدێکی ڕەوا دەبیـنین ڕێـزی ئێمەیـە بـۆ کەسـێك کـە بەیاریـدەی ئامـادەیی یـە تایبەتەکانی خۆیەوە لە بەهێزیی یەکەی بابەتە سۆزینەکانی ئێمە کەم دەکاتەوە.

## 88– هونەر و کۆمەڵگە

ئەگەر ئەم خواستە بـە ڕۆشـنی تێبگـەین، ئـەوا شـوێن‌و ئاسـتی هونـەر لـە کۆمەڵگـەدا مەسەلەیەکی ئەوتۆ نابێت، لەم بارەیەشەوە هەمدیسان یۆنانییەکان لە ئێمـە داناتربوون و باوەڕی ئەوان بەمەی کە جوانی بریتییە لە باشیی ئاکاری یان پـەیامی ئاکـاریی بـاش– کـە بە ڕوانگەی ئێمە هێندە ناکۆك وەڕوو دەکەوێت– لە ڕاستی دا ڕاستییەکی گەلێ سادەیە.

یەکاویەك گوناح درێوییە" ئەگەر ئێمە ئەم خاڵە بە تـەواوی بونمـان بـاوەڕ پـێ بکـەین، ئەوا دەمانتوانی کۆی چالاکییەکانی دیکەی گیانی مرۆڤ لە باری خۆیدا بهێڵینەوە.

بەم شێوەیەیە کە من باوەڕم وایـە کـە گرنگیـی هونـەر لـە ئـابوری و فەلـسەفە کـەمێ زیاترە.

هونەر پێودانگێکە کە ڕادەیەکی ڕاستەخۆی لەگەڵ ڕوانگەی گیانیی ئادەمیزاددا هەیە، کاتێکیش ئەم ڕوانگەیە هاوبەش بێت لە نێـوان تاکـەکانی کۆمەڵگـەدا ، بـە شـێوەی ئـایین ڕەنگ دەداتەوە.. ژیان‌و بزوتنەوەی هونەریش لە زوربەی چـاخەکانی مێـژوودا پەیوەسـتی یەکێ لە شکڵەکانی ئایین بووە.

بەڵام هەمان شێوە کە پێشتر پەنجەم بۆ ڕاکێشا، لە توێی دوو سێ سـەدەی ڕابـردوودا ئەم پەیوەستییە کەم کەم ڕووی لە سـستی کـردووە و واش دەرناکـەوێت کـە بـەم زووانـە پەیوەندییەکی نوێ بەدی بێت.

## 89– ویستی مەیلدارێتی بۆ وێنە

هیچ کەسێك پەیوەنـدی بەرانبـەریی هونەرمەنـدو کۆمەڵگـە نکـوڵی ناکـات، هونەرمەنـد پشتی بە کۆمەڵگە دەبەستێ –ئاوازو هێزو هەستەکانی لەو کۆمەڵگەیەوە وەردەگرێـت کـە تیایدا دەژی... بەڵام لایـەنی تاکانـەی بەرهـەمی هونەرمەنـد پەیوەنـدە بـە هۆکـاری زیـاتر لەمانەوە، ئەم لایەنە پەیوەندە بە فرمانێکی بـەدی هـاتووەوە کـە بریتییـە لـە – ویـستی مەیلدارێتی بۆ وێنە– کە هێزێکە لە دەرونی کەسێتی هونەرمەندایەو بـەبێ ئەمـە درکانـدنی دیدی وێنەی گونجاو شتێکی گرنگ ناتوانێ بەدی بهێنێت... دەشێت وەها دەربکەوێت کـە ئەم خاڵە دوچاری دژایەتیمان بکات، ئەگەر هونەر بە تـەواوی بەرهـەمی مەرجایەتییـەکانی دەوروبەر نەبێتو بەیانی ویستێکی خودیو تاکانە بێـت" کەواتـە چـۆن دەتوانـێ لێکـچونی سەرسوڕێنی بەرهەمی هونەری لە قۆناغە جیاوازەکانی مێژوودا ڕوون بکاتەوە.

## 90– دوا بەها

ئەم دژایەتییە تەنها بە زمانێکی سەرو سروشتی شـیاوی ڕونکردنەوەیـە، بـەها کۆتـایی یەکانی هونەر لە سنوری تاكو کاتو مەرجایەتییەکانی دەوروبـەری ئـەو زیـاتر ڕادەبـرن... ئەم بەهایانە بەیان کەری هاوگونجاندنو هارمۆنیی ئایدیالینو هونەرمەند تەنها بە یاریـدەی توانا دیدەیی یەکانییەوە دەتوانێت دەستیان بۆ بەرێتو مامەڵەیان لەگەڵ بکات.

هونەرمەند لە پێناوی بەیان کردنی ئاتاجی دیدەکانی خۆیدا ماددەیـەك بـەکار دەبـات کە مەرجایەتیی کات خستویەتە بەردەستی.

ڕۆژێ لە ڕۆژان هونەرمەند لەسەر دیواری ئەشکەوتەکان کاری دەکردو هێڵی دەکێشا.. لە قۆناغی دواییدا یا مزگەوتی بنیات دەنا یان جوانی دەکرد.. لە قۆناغێکی دی دا تابلۆی بۆ کەسانێکی هونەرناس دەکێشا...

هونەرمەندی ڕاستەقینە باوەڕی بە چییەتی ماددەو ئەو مەرجایەتییانەش نییە کە بەسەریدا گریمان دەکرێت.. هەر مەرجایەتییەك کە بوار بۆ ئەو بڕەخسێنێ کە ویستی سەر بە وێنەی خۆی بەیان بکات، لای ئەو شایەنی پەسەند کردنە.

ئەو کاتە لە جێگای بەرین تری مێژوودا کۆششەکانی ئەم هونەرمەندە دەشێت بە یاریدەی توانایەکەوە کە لای خودی هونەرمەند شایەنی پێش بینی نییە و هێندە پابەندی ئەو بەهایانە نییە کە جێ سەرنجی هونەرمەندن... گەورە یان بچکۆلە نیشان دەدرێن، پەسەند کاو یان نەویستراو بە ڕاستی دەبن..

بەڵام باوەڕی هونەرمەند وەهایە کە ئەم بەهایانە لە ئەژماردی سیفاتی هەمیشەیی مرۆڤدا جێگەیان هەیە.